# ئەسکەندەری مەکدۆنی

نوسینی: هارۆڵت لمپ

وەرگێڕانی: عەلی ئەکبەر مەجیدی

چاپی سێیەم

سلێمانی

2013

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما
زنجیرە: (٤٩)

## ناسنامەی کتێب


- ئەسکەندەری مەکدۆنی
- نوسینی: هارۆڵت لمپ
- وەرگێڕانی: عەلی ئەکبەر مەجیدی
- بابەت: مێژوو
- نەخشەسازی: فواد کەوڵۆسی
- بەرگ: فواد کەوڵۆسی
- تیراژ: ١٠٠٠
- نۆبەت و ساڵی چاپ: سێیەم ، ٢٠١٣
- شوێنی چاپ: چاپخانەی گەنج
- ژمارەی سپاردن: ( ٩٧٦ )ی ساڵی ٢٠٠٥ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە.


ناونیشان: سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.
ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣), (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

# پێڕست

# پێشەکی وەرگێڕ:

"هارۆڵد لەمب" بیرەوەری نووسی هاوچەرخی ئەمریکاییە کە تا ئێستا چوار پەرتووکی لە بارەی رۆژهەڵاتەوە نووسیوە. سیانیان لەبارەی ژیانی چەنگیزخان و تەیمووری لەنگ و سوڵتان سلێمانی پاشای عوسمانییە و پەرتووکی چوارەم لەبارەی ئەسکەندەرەوە یە.

چونکە "هارۆڵد لەمب" بۆ نووسینی سێ پەرتووکی پێشوو، هەموو بەڵگە مێژووییەکانی لەمێژوونوسانی رۆژهەڵات و بەتایبەت مێژوونوسانی ئێرانی (لەبارەی چەنگیزخان و تەیمووری لەنگەوە) وەرگرتووە" ئێمە لەو بارەوە لە ئێران لە چاو مێژوونووسانی رۆژئاوادا سەرچاوەی مێژووییمان زیاتر لە بەردەستایە" بەڵام لەبارەی ئەسکەندەرەوە زانیاریمان کەمە" چونکە مێژوونامەیەك کە بەسەرهاتی ژیانی ئەسکەندەر بگرێتە خۆی ، لەئێراندا نییە.

بەڵام مێژووی "ئەسکەندەر" بە قەڵەمی "هارۆڵد لەمب" ی ئەمریکایی، زیاتر لەم رووەوە گرنگە کە رووداوە مێژووییەکان هەر بەو جۆرە باس دەکا کە روویان داوە ، نەك بەوجۆرەی کە هەندێك لەمێژوو نووسانی یۆنانی، بەبیر و بۆچوونی تایبەتی خۆیان باسیان لێ کردووە!

ئێمە بەشێك لەم پەرتووکە کە لەبارەی سەفەر کردنی ئەسکەندەرەوەیە بۆ ئێران، دەخەینە بەر دەستی خوێنەران، چونکە زانیاری مێژوویی بۆ کەسانێك کە بیانەوێت لەمێژوو کەڵك وەرگرن، سوود بەخشە و شێوازی

نووسینی "هارۆڵد لەمب" بۆ ئەوانەی کە بیانەوێت بابەتێك بۆ سەرقاڵ بوون بخوێننەوە، لەبارە.

لە ژیانی ئەسکەندەردا سێ پەرتووك زۆر کاریگەر بوون، یەکێك خوێندنی بەسەرهاتی "کوورشی کەبیر" شاهەنشای ئێران و دامەزرێنەری زنجیرەی شاکانی هەخامەنشی یە و دووەم پەرتووکی "ئیلیاد"، نووسینی "هۆمەر" چیرۆك نووسی یۆنانی و سێهەمیان پەرتووکەکانی "ئەرستۆ" ی مامۆستای ئەسکەندەرە — لەبارەی زانستەکانی سرووشت و ئەودیو سرووشت.

ئەسکەندەر هەرکاتێك بەسەرهاتی ژیانی کوورش شاهەنشای ئێرانی دەخوێندەوە، ئارەزووی دەکرد وەکو ئەو بێ و وەکو ئەو بە سەر وڵاتان و گەلاندا زاڵ بێت و دیسان وەکو ئەو، لەهەر، شوێنێکدا شارێك دروست بکات و هەربە چەشنی کوورش ئەو شارانەی کە دروستی دەکرد، بەناوی خۆیەوە ناوی لێدەنان ، ئەمیش ئەو شارانەی کە دروستی دەکات، بیکات بەناوی خۆیەوە!

بەڵام لە نێوان جیهانگیری کوورش شای ئێران و ئەسکەندەردا جیاوازییەکی گەورە هەیە و ئەوەش ئەوەیە کە کوورش هەر وڵاتێکی داگیر دەکرد، دانیشتوانەکەی بەئازادی دەهێشتەوە تاکو بەگوێرەی نەریتی ئایینی خۆیان بژین. کوورش بۆ ئەوەی کە بەهەموو کەس بسەلمێنێت کە رێز بۆ نەریت و دروشمی ئەو نەتەوانە دەگرێ کە دێنە ژێر ئاڵای ئێران، جل و بەرگی نەتەوەیی ئەوانی لەبەر دەکرد و هەرچەند "ئەهوورا مەزدا" خوای تاقانەی دەپەرست" لەڕواڵەتیشدا رێزی لەتابۆکانی گەلانی دیکە دەنا بۆ ئەوەی کە کار لەهەستی نەتەوەیی ئەو گەلانە بکات، هەر بۆیەش

ئیمپراتۆریەتێکی گەورەی دروست کرد کە بریتی بوو لەدنیای ئەو سەردەمە جگە لە یۆنان و رۆم.

بەڵام ئەسکەندەر بەجۆرێکی دیکەبوو، ئەو رێز بۆ نەریت و یاسای نەتەوەکانی ژێر دەستی دانەدەنا و لە کۆتاییدا سیستەمێکی نامرۆیی دروست کرد و نزیکترین دۆستەکانیشی کە مەقدوونییەکان بوون خۆیان لێ دوور خستەوە.

ئیمپراتۆریەتی گەورە کە کوورش هێنایە ئاراوە، چونکە لەسەر بنەمای دادوەری و ئازادی گەلانی ئەو ئیمپراتۆریەتە راوەستابوو، نزیکەی چوار سەدە بەردەوام بوو. بەڵام چونکە ئیمپراتۆریەتی ئەسکەندەر لەو خاڵە چاکانەی سەرەوە بێ بەش بوو" دوای مەرگی ئەو، پارچە پارچە کرا.

هەندێك لەنووسەران وا بیریان دەکردەوە کە دابین کردنی شارەکان لەشوێنە جۆراوجۆرەکاندا، بەشێك لەخوی خودی ئەسکەندەر بووە کە ئەسکەندەر تەنیا لەم بارەیەوە لاسایی کوورشی کردۆتەوە و زۆربەی شارەکانی ئەسکەندەر بەناوی ئەسکەندەرییە، دوای مەرگی ئەو وێران بوون، لەکاتێکدا شارەکانی کوورش مایەوە و لەدواییدا بوونە وڵاتانی گەورە. ئەمە راستییەکە کە لەکۆی نووسراوەکانی "هارۆڵد لەمب"ی ئەمریکایی دا دیارە و خودی نووسەر لەزۆربەی لاپەڕەکانیدا ، بەڕوونی ئەم خاڵانە دەڵێتەوە جا کە لە پێشەکییەکە تێ گەیشتن دەڕۆینە سەر بابەتی ئەم پەرتووکە.

<u>**زەبیحوڵڵای مەنسووری**</u>

# هاتنی ئەسکەندەر بۆ ئاسیای بچوك
## (( تورکیەی ئەمڕۆ ))

ئاسیای بچوك "تورکیەی ئەمڕۆ" بۆ ئەسکەندەر و سەربازەکانی ، ناوچەیەکی نەناسراو بوو، ئەوان ڕێنمایی ئەستێرەکان و لێکۆڵینەوەی ناوچەیی دەرۆیشتن.

ئاسیای بچوك بەبەشێك لەئیمپراتۆریەتی ئێران دەژمێردرا ، ئەسکەندەر بۆ ئەوەی بتوانێ ڕێگاکە بناسێت و لەشوێنە جۆراوجۆرەکاندا بۆ هێزی نیزامی خۆی "سیورسات" (خواردن و خواردنەوە ) دابین بکات" هەندێ کەسی لە پێشدا دەنارد و ئەم پێشەنگانە لە پێشەوەی سوپاکەیەوە" دەڕۆیشتن.

لە پشت ئەم سوپاوە "تاقیگەکەی ئەرستۆ" هەبوو، ئەو تاقیگەیەش بریتی بوو لە چەند "گارییە"ی گەورە و بچوك کە هەر نموونەیەکی تازە لەگیا و گیانەوەر و مێرویەك کە ئەسکەندەر دەیبینی بۆ ناو گارییەکان دەگوێزرایەوە تا بۆ ئەرستۆی بەڕێبکەن لەیۆناندا.

کاتێك ئەسکەندەر دەیویست بەرەو ڕۆژهەڵات بڕوات، بە ئەرستۆی وتبوو کە لەگەڵیدا بەڕێکەوێت، تاکو ئەوەی کە لە دنیای نوێدا دەیان ببینن زانیاریەکانی خۆی لەفیزیادا (زانستی سرووشت) پێ زیاد بکات" بەڵام ئەرستۆ وەڵامی دایەوە کە هەرکات بەڕێ کەوت "لیسە[1]" بێ

---

[1] "لیسە" هەر ئەوەیە کە ئەمڕۆ بەناوی زانکۆوە دەیناسین.

سەرپەرشت دەمێنێتەوە، چونکە ئەرستۆ هەندێ قوتابی هەبوو کە لە لای ئەو دەیانخوێند و نەیدەتوانی قوتابییەکانی خۆی بەجێ بهێڵێت.

ئەسکەندەر لەو کاتەدا بیست و یەك ساڵە بوو، بە هۆی بێ ئاگایی لە هەل ومەرجی ئاو و هەوای رۆژهەلات، خۆی نەدەپاراست و هەموو خۆراکێکی دەخوارد و دوای رێپێوانەدرێژەکانی دوای نیوەرۆ، کە هەوای ناوچە کوێستانییەکانی ئاسیای بچوك فێنك دەبوو، لەو ڕوبارانەی کە لەسەر رێگا دەیبینین، خۆی دەشۆرد و هەستی نەدەکرد کە بەجەستەی گەرمەوە چوونە ناو ئاوی ساردی ڕوبار ڕەنگە نەخۆشی بخات. لە ئاکامدا نەخۆش کەوت بەجۆرێك کە ئیدی نەیتوانی سواری ئەسپ بێت و لەسەر تەختی سەفەری درێژیان کرد و سوپا بەرەو رۆژهەلات درێژەی بە ڕێکردن دا. تا گەیشتنە دەشتی "ئیسیۆس" [1] واتە دەشتێك کە ڕوباری "ئیسیۆس" بەوێدا تێ دەپەڕی.

ئەو پزیشکانەی کە لەگەڵ ئەسکەندەردا بوون، نەیانتوانی نەخۆشیەکەی دیاری بکەن و ئەسکەندەر لەبەر نەخۆشیەکەی وەها لاوازبوو بوو کە ئیدی نەیتوانی وەکو رۆژانی تر سەفەرنامەکەی بنووسێت.

چونکە دوای ئەوەی کە ئەسکەندەر و هاوڕێکانی لەرۆژهەلات دەرکەوتن هەر کەس بۆ خۆی سەفەرنامەیەکی دەنووسی و هەتا ماوەیەکیش خودی ئەسکەندەر درێژەی بە نووسینی سەفەرنامەکەی دەدا و بەو هۆیەوە رەوشت و دەروونی گۆڕا، ئیتر وازی لەنووسینی سەفەرنامەکەی هێنا.

بەلام هاوڕێکانی ئەسکەندەر درێژەیان بە نووسینی سەفەرنامەکە دا و هەندێ لەوانە ئێستاش ماوەو لەبواری مێژووییدا زۆر گرنگن، بەلام کەسێك نازانێ ئەو بەشە لە سەفەرنامەکەی ئەسکەندەر کە بەدەستی خۆی

نووسراوە، کەوتۆتە دەستی کێ هەر چۆنێك بێ سەفەرنامەی خودی ئەسکەندەر هیچی لێ نەماوە.

دوای ئەوەی کە گەیشتنە دەشتی "ئیسێۆس" هەوا گەرم بوو و گەرمی هەوا نەك هەر زیاتر حاڵی ئەسکەندەری خراپتر کرد، بەڵکو سەربازەکانیش کەوتنە ئازارەوە و ئەوانە لەژێر هەتاوێکی سووتێنەردا ڕێگایان دەبڕی و ئارەقەیان دەڕژاند. ئەسکەندەر دەیزانی کە سوپایەك بەفەرماندەیی ئێرانییەکان لەدووری دوو ڕۆژە ڕێ، لە چاوەڕوانیاندا راوەستاون تاکو بەریان پێبگرن.

ئەم سوپایە داریووشی سێهەم، پاشای هەخامەنشی بۆ بەرگری لەئەسکەندەر ناردبووی، ئەسکەندەری تەمەن بیست و یەك ساڵ دڵنیابوو لەوەی کە سوپای ناوبراو لەمانەوە زۆر دوورن. هەربۆیە بە هێواشی دەجولایەوە. لەناکاو پێیان ڕاگەیاند کە ئێرانییەکان لە دەشتاییەکانی "ئیسێۆس"دا گەمارۆیان داون. حەڵقەیان لەدەوری سوپای ئەسکەندەر داوە و لەپشتیەوە گەیشتوونەتە دەریا[1] بەم جۆرە ڕێگای پاشەکشەی سوپای ئەسکەندەر گیراوە.

سوپای ئەسکەندەر لەنزیکی دەریاوە دەڕۆیشتن هەربۆیە هەمیشە دەریایان بەتەواوی دەبینی، کەشتییەکی توند ڕەو کە بەهێزی سی جووت سەوڵ دەجولا، ئەسکەندەرفەرمانی پێدا کە لە ڕێی دەریاوە بڕوا و ببینێت کە ئایا ئەم کارەساتە ڕاستە و ئێرانییەکان گەمارۆیان داوە و گەیشتوونەتە دەریا یان نا؟

---

[1] دەشتی ( ئیسوس) لەکەناری دەریای ناوەڕاستدایە

کەشتی ناوبراو رۆیشت و گەڕایەوە و هەواڵیدا کە هێزەکانی ئێران بە درێژایی کەناری ڕوباری "ئیسیۆس"دا سەقامگیرە و تەواو گردەکانی کەناری دەریا و دەوروبەری ڕوبارەکەی داگیر کردووە.

دوای وەرگرتنی ئەم هەواڵە ئەسکەندەر کۆبوونەوەیەکی ڕاوێژکاری لەسەردەستەکانی سوپا پێک هێنا و ووتی: ئەم هەواڵە بە تەواوی ئەفسەرەکان و تەنانەت بە ئەفسەرەکانی خوارەوە بگەیەنن بۆ ئەوەی کە ئەوانیش بزانن هێزەکانی ئێران، گەمارۆی خستۆتە سەر مەقدونییەکان. لەم کۆبوونەوەیەدا کە ئەسکەندەر هێشتا دوو نەخۆشی یەکەی لەکۆڵ نەبوبویەوە، لە گەڵ سەرانی سوپا گفت و گۆی کرد و ووتی بەو جۆرەی کە دەبینن، ئێوە نە ڕێگای رۆیشتنتان هەیە و نە گەڕانەوە!

من ناڵێم کە کەسێك کەمتەرخەمی کردووە و ئەبوایە ئەم واقیعە رووی نەدابا، بەڵکو سەرچاوەی ئەم بەدبەختییە لەخراپی چارەنووس دەزانم کە منی نەخۆش خستووە. چونکە ئەگەر نەخۆش نەدەبووم، سەرنجی زیاترم دەدایە سەر رەوشی سوپا و نەمدەهێشت بەم جۆرە بەبێ ئەوەی کە هەواڵێك بەدەستمان بگات، ئێمە یەکسەر گەمارۆ بدرێین.

رەنگە تەندروستی منیش لەم رووداوەدا کاریگەری نەبوایە و هەر چۆنێك بێت، کارەساتێك رووی داوە و خەفەت خواردن بێ سوودە و ئەبێ ئێمە بەدوای چارەسەری دا بگەڕێین.

دوایی ئەسکەندەر دەستی خۆی بەرەو باکوور راکێشا و ووتی سەیرکەن ئەمە کێوە.... و ئینجا دەستی بۆ لای باشوور درێژ کرد و ووتی ئەمەش دەریایە و ڕێیەکی کورت لە نێوان کێو و دەریادایە و ئێوە دەبێ لەم ڕێگا کورتە کەڵك وەرگرن.

لەم ناوچە تەسکەدا، هەرچەند ئێران سوپایەکی گەورەی هەیە، بەڵام ناتوانێ لەم جێگا تەنگەدا کەڵك لە هەموو سوپاکەی وەربگرێت. چونکە شوێنی سەقامگیر بوون بۆ هەموو سەربازەکان نییە( بەجۆرێك کە دەردەکەوێ ئەسکەندەر لەم بەشەدا هەڵەی کردوە).

ئێوە هەرکات بەشێوەی شەڕی هەمیشەیی خۆتان دەست بکەن بەشەڕ هیوایەك هەیە کە ئێوە لەم گەمارۆیەدا رزگار بن. دوای ئەوەی کە کۆبوونەوەی راوێژ تەواو بوو ، ئەسکەندەر بڕیاری دا کە هێزەکەی لەو رێگایەوە کە رۆیشتبوون ، وەربگرێتەوە و بەشەو دا بەڕێیان بکات" هەتا دوو کاتژمێر لەنیوەشەو رێیان ئەبڕی و لەو کاتەدا ئەسکەندەر ووتی: سەربازەکان راوەستن و بخەون و لە کازیوە دا لەخەو هەستن.

ئەو جێگایە کە ئەسکەندەر هێزەکانی خۆی راوەستاند باریکە ڕێیەك بوو کە دوای دەربازبوون لەو تەنگە بەرەدا ناسراو بە ڕوباری مەسەب (ئیسیۆس) دەبوو لەکازیوەدا سەربازەکانیان لەخەو هەستابان.

بەڵام هێزەکانی ئێران کە لەدەشتاییەکانی قەراخی ڕێی چۆڵی ڕوباری مەسەب (ئیسیۆس) سەقامگیر ببوون، بریتی بوون لە هەندێك لەسەربازەکانی ئێرانی و بەشێکی گرنگ لەسەربازەکانی یۆنانی، واتە ئەو یۆنانییانە کە لە ئاسیای بچوکدا دەژیان و خۆیان بە ئێرانی لە قەڵەم دەدا.

هەڵبەتە ئێرانییەکان بە پێی ئەوەی کە سەدان ساڵ باوباپیرانی ئەوان نیشتەجێی ئاسیای بچوك بوون، یۆنانییەکانی ناوبراویان بە ئێرانی دەزانی و بەچاوی هاوڵاتی سەیری ئەوانیان دەکرد. هەندێك لەم یۆنانییانە کە لەسەدەکانی کۆندا لە یۆنانەوە کۆچیان کردووە و لەئاسیای بچوکدا نیشتەجێ ببوون بە پێی ئێرانی بوون، لە وڵاتی ئێراندا بە پلە

گەلێكی بەرز گەیشتن. چونكە كوورشی پاشای ئێران و بنیاتنەری زنجیرەی هەخامەنشی باوەڕی وابوو تەواوی ئەو گەلانەی كە لە ژێر ئاڵای ئێراندا دەژین، دەبێ بە چاوی ئێرانی بوون سەیر بكرێن، تا ئەوەی كە وردە وردە، جیاوازی قەومی لە نێوانی ئەوان و ئێرانییەكانی رەسەن تێك بچێت و هەموو ببن بەیەك نەتەوە.

ئەوە بوو كە دوای كوورش، پاشاكانی دیكەی هەخامەنشی ئەم رێ و رەسمەیان پاراست و یۆنانییەكانی ئاسیای بچوك كە لەسەردەمی دەسەلاتی هەخامەنشی و بەتایبەت لە دەوری كوورش و كەمبوجیە، كە بۆ ئێران بوونەتە زەحمەت، بەچاوی بێگانە سەیر نەدەكران و رێگای پێشكەوتنیان لەوان نەدەگیرا و بازرگانانی یۆنانی (یۆنانی ئاسیای بچوك) دەیانتوانی بە ئازادییەوە دەوڵەمەند ببن و هەریەك لەوانە كە دەچوونە خزمەتی سوپاوە، بە مەرجی ئازادبوونەوە، پێش دەكەوتن و بینرا كە هەندێ لەوانە بە بەرزترین پلەی سوپا گەیشتن.

كاتێك هەوا ڕوون بووەوە، ئەسكەندەر بەتاقمەكانی ناسراو بە "ڤالانژ" دەستووری دا كە خۆیان بۆ جەنگ ئامادە بكەن.

بێ سود نییە كە چەند ووشەیەك لەبارەی "ڤالانژ" ەوە قسە بكەین. چونكە مەقدوونییەكان[1] و یۆنانییەكان زۆر شانازیان بە "ڤالانژ" ەوە دەكرد و لەداستانەكاندا ئەوەیان بەهۆكاری سەركەوتنیان دەزانی.

هەر ڤالانژێك كە لە دەوری ئەسكەندەردا پێكهاتبوو بریتی بوو لە یەك هەزار و پێنج سەد و سی و شەش سەرباز" كە لە شەڕدا ئەم سەربازانە بە دەستەی هەشت نەفەری، دابەش دەبوون. بەڵام ئەم دەستە هەشت

---

[1] مەقدوونیە لەیۆناندا بوو. وەرگێر.

نەفەرییانە، لە لای یەك ریز دەبوون" بەجۆرێك کە لە کۆمەڵی ئەواندا چوار گۆشەیەك، بازنەیەك پێکدێت. سەربازەکانیان بەجۆرێك مەشق دابوو کە ئەم چوار گۆشە یان بازنە کە یەك هەزار و پێنج سەد و سی و شەش سەربازی تێدا بوو بە لێژنەی کۆمەڵ دەجولان و لەهەمان کاتدا بەجۆرێك هەنگاویان هەڵدەگرت کە لە هەموو کات، ئاراستەی چوار گۆشەیان وەکو بازنەیەك بمێنێتەوە.

هۆی ئەوەی کە سەربازەکان، چوار گۆشە یان بازنەیان پێك دەهێنا و ئەم شێوە چوار گۆشە، یان بازنە شەڕییە، بە کۆمەڵ دەجولان" بە شێوەیەك کە دوژمن لە هەر لایەکەوە دەهات، بە شمشێر و ڕمی، سەربازەکان ڕووبەڕوو دەبوونەوە و هەرگیز ڕەوشێك نەدەهاتە ئاراوە کە دوژمن بتوانێت لە دواوە هێرش بەرێتە سەر سەربازەکان.

شێوازی ڕاوەستانی تاقمەکان لە لای یەکدا، بۆ دروستکردنی چوار گۆشە، یان بازنە، لە دوو کۆڵەکەدابوو. واتە دوو کۆڵەکە سەرباز، هەر یەکەیان پێکهاتبوو لەچوار نەفەر لەشوێنی یەکدا ڕادەوەستان، بەجۆرێك کە هەر سەربازێك لە شوێن شەڕکەرێکی دیکەدا سەقامگیر دەبوو، کە لەبەرامبەر چوار گۆشەکە، یان فالانژ تێدەپەڕێت ، بە بێ پچڕان چوار سەربازتان دەبینی کە بەدوای یەکدا ڕاوەستاون. سەربازی یەکەم (واتە سەربازی پێشەوە)، چەکدار بەشمشێر و نێزەی کورت بوو" سەربازی دووەم (لەدوای ئەوەوە)، نێزەیەکی درێژتری هەبوو و نێزەی سەربازی سێهەم درێژتر بوو و هەروەها نێزەی سەربازی چوارەم، لە دوای سێ سەربازی دیکەوە، ئەوەندە چاوە هەبوو کە درێژاییەکەی بەشانزە پێ (کەمێك زیاتر لەپێنج مەتر) ئەگەیشت.

ئەم بابەتەش سودێکی تایبەتی بۆ شەڕەبوو، چونکە نێزەی هەر سەربازێك بڵندتر لە نێزەی سەربازی پێشەوەی خۆی دادەنرا. تەواوی نێزەکان لە ڕیزی پێشەوە، لە یەك ریزدا سەقامگیر دەبوون و لە سەر ئەوەوە هەرچوار نەفەر لە ناکاو نێزەکانیان دەجولان و هێرش، یان بەرگرییان دەکرد.کە نەفەری یەکەم تیا دەچوو، نەفەری دووەم لەجێگەی بوو، ئەگەر دووەمیش تیا بچوایە، نەفەری سێهەم لەجێگەی بوو.

روونتر بڵێین ڤالانژ لە گۆڕەپانی شەڕدا، کاتی شێوەی چوارگۆشە یان بازنەییان دەگرت ، وەکو قەلایەکی جەنگی لێدەهات کە چوار دیواری یەك بە دوای یەکی هەبێت و ئەم قەلایە بەجۆرێك دەکەوتە رێ کە وێنە چوارگۆشە، یان بازنەییەکەی تێك نەچێت.

ئەم ڤالانژە دوای بە دەست هێنانی شێوەی شەڕی ناوبراو بە ڕاستی تاقمێکی شەڕی مەترسیدار دەبوو کە وەکو ژیژك لە هەموو لایەکیەوە، دڕکی دەرهێنابوو و لە هەموو لایەکی ئەم ڤالانژە تیر دەباری، یان شمشێر و نێزە دەردەکەوت و دوژمن هەرچەند هەولی دەدا کە گەمارۆبدات و لە پشت سەربازەکاندا دەربکەوێ، هەم دیسان رووبەڕووی تیر و شمشێر و نێزە دەبووەوە!

بەلام ئەم قەلای شەڕی مەترسیدارە عەیبێکی هەبوو و ئەوەیش ئەوە بوو کە کاتێك کەلەبەری تێدەکەوت و سەربازەکانی دوژمن دەیانتوانی لایەك لەچوار گۆشەکە لەناو بەرن" بە دەگمەن روو دەدا کە سێ لاکەی دیکە بتوانن خێرا خۆیان کۆ بکەنەوە و درێژە بە شەڕ بدەن.

بەڵکو لەگەڵ درز تێبوونی دیوار، ئەوەندەی کە دوژمن زوو دەکەوتە جوڵە، لە دواوە هێرشی دەکردە سەر لاکانی تر. وەکو سوپایەك کە قەلایەکی داگیر کردبێت، ریزەکانی شەڕی ڤالانژەکانی لە ناو دەبرد و لە

گەڵ چوونە ژوورەوەدا دەیتوانی کە پاشماوەی سەربازەکان لەناو بەرێت، یان ئەوەی کە ڤالانژیش لە قەڵاکانی کۆن دەچوو کە تا ئەو کاتەی دیوارەکان خۆیان رادەگرت، هێزەکانی ناو قەڵاش خۆڕاگرییان دەکرد، بەڵام لە گەڵ رووخانی دیوارەکە خۆڕاگرییان کۆتایی پێدەهات.

رێگای کەوتنی ئەو قەڵا گیانلەبەرە ئەوە بوو کە بەکەڵك وەرگرتن لە یەکە سوارکارەکانی سوپایان داشقەکانی شەڕەوە پەلامار بەرنە سەری، یان ئەوەی کە ڤالانژە جۆرا وجۆرەکان لە یەك جیا بکەنەوە و هەر یەکە بەجیا لەناو بەرن.

ئێرانییەکان بەم شێوە جەنگییە شارەزا بوون و لەو شەڕانەی کە لەگەڵ یۆنانییەکاندا کردبوویان، دەیانزانی کە چۆن و بە چ شێوازێك دەبێ ڤالانژەکان لە ناو بەرن.

پەلامار بۆ سەر ئاراستەیەکی جەنگیی ڤالانژ کە مەبەستی خۆڕاگری هەبوایە، سەختی و تێدا چوونی بەدواوە بوو، بە شتێکی نەشیاو لە قەڵەم دەدرا و ئێرانییەکان لە شەڕەکانی رابردوودا، بە بەردەوامی ئاراستەی ڤالانژی یۆنانییەکانیان لە ناو بردبوو.

ئێرانییەکان دوو دەورە لە گەڵ یۆنانییەکان شەڕیان کردبوو کە لە دەورەی یەکەمدا لە لایەن یۆنانییەکانەوە بە ناوی شەڕی جیهانی یەکەم و دەورکەی تر دیسان لە لایەن یۆنانییەکانەوە بە شەڕی جیهانی دووەم ناوزەد کرا و ناوی شەڕی جیهانی کە لە سەدەی بیستەمدا دەیبیسین، شتێکی نوێ نییە، بەڵکو یۆنانییەکانی کۆن ئەو ناوەیان بۆ دوو دەورە شەڕ لەگەڵ ئێرانییەکان دا هەڵبژاردبوو.

چونکە جیهانی ئەو دەمیان تەنیا بە یۆنان و ئێران دەزانی و ئاگایان لە شوێنەکانی تر نەبوو و تەنانەت ئەسکەندەریش سەرەڕای ئەوە کە

گەیشتە هیندستانیش، دیسان ئاگادار نەبوە کە نیشتمانێك بەناوی چین و باشووری ئەفریقیاش هەیە و سەرەڕای ئەوەی کە لە دواییدا لیژنەیەکی بۆ دۆزینەوە بەرەو ئەفریقیا نارد، لە قوڵایی کیشوەری ناوبراو بێ ئاگا بوو.

لەتەواوی شەڕەکاندا ڕێبازی ئەسکەندەر ئەوە بوو کە دیسانەوە ڤالانژی دەخستە جوڵەوە و لەهەر شوێنێك ڤالانژ لەجوڵە دەوەستا، دەستووری بەیەکە سوارکارەکانی خۆی دەدا کە پەلامار بدەن و بەرەی دوژمن تێك بشکێنن.

بەڵام بەیانی ئەو ڕۆژە کاتێ کە ئەسکەندەر لەسەر بڵندایییەکەوە چاوی بە سوپای ئێران کەوت لە ترسان کەوتە لەرزە و بانگی لە فەرماندەی هێزی دەریایی خۆی کرد. کاتێ کە سوپای ئەسکەندەر لە وشکاییدا کەوتە جوڵە، ریزە جەنگییەکانی تریشی بە درێژایی کەناری دەریادا پێ بە پێی سوپا ڕێیان دەبڕی.

ئەسکەندەر بەفەرماندەی هێزی دەریایی خۆی کە ناوی "پارمنیو" بوو، ووتی: ڕەوشەکە چۆن هەڵدەسەنگێنی؟

"پارمنیو" ووتی: زۆر مەترسیدارە. چونکە ئەو رادە سوپایە کە ئێستا لە بەرامبەر خۆماندا دەیبینین، بە تەنیا سێ هێندەی هێزی ئێمەیە و لە وانەیە ئێرانییەکان هێزێکی تریشیان لە پشت گردەکان هەبێ کە ئێمە ناتوانین ببینین.

ئەسکەندەر تا دەمەو نیوەڕۆ لە ترسی شکست هێنان نەیدەوێرا کە فەرمانی هێرش بدات و هەر لەو کاتەدا فەرمانی کەوتنە ڕێی بەڤالانژ دا. لە کاتێکدا هێشتا کاتژمێرێك لە کەوتنەڕێی ڤالانژ تێپەڕ نەبوو بوو، لەو شتەی وا ئەسکەندەر ترسی لێ هەبوو، ڕووی دا و یەکە سوارکارەکانی

ئێرانی هێرشە بەناوبانگەکەیان دەست پێ کرد. ئەم هێرشە وەها بوو کە یەکەی سواری بەخێراییەکی زۆرەوە ئەسپیان دەهاژووت و دەهاتنە پێشەوە و لەگەڵ گەیشتنیان بەڕیزەکانی دوژمن بە تەورداس و شمشێرە قورسەکان کە تایبەتِ بوون بەیەکەی سواری سوپا، سەربازانی دوژمنییان لە ناو دەبرد لە گەڵ ئەوەی کە ریزەکانی پێشەوە دەکوژران، تاقمەکانی تر لە دواوە دەگەیشتن و بە هەمان وزە و تواناوە دەچوونە پێشەوە تا ئەو کاتەی کە بەرەی دوژمن تێکدەشکا و دوژمن شێوەیجەنگی خۆی لەدەست ئەدا.

ڤالانژی ئەسکەندەر لە بەرامبەر یەکە سوارەکانی سوپای ئێرانی، تا ڕادەیەك خۆڕاگریان کرد. بەڵام نەیانتوانی درێژە بەو خۆڕاگرییە بدەن و ئەسکەندەر لەم کاتەدا کە بینی بەم زووانە شیرازەی ڤالانژ لێك دەترازێ بەیەکەی سواری سوپای مەقدوونی فەرمانی هێرشی دا ووتی: هەوڵ بدەن کە بەلای ڕاستی ئێرانییەکانەوە تێپەڕ بن.

بەلای ڕاستی ئێرانییەکانەوە، سەربازاەکانی یۆنان سەقامگیر بوون، هەر ئەو سەربازگەلە کە ووتمان گۆشت و پێستی ئەوان بەنانی ئێران پەروەردە بووە" کوڕ لە دوای باوکی، نیشتەجێی ئاسیای بچوك بوون، خۆیان بەئێرانی دەزانی و لە گەڵ ئەوەی کە هێرشی یەکە سوارەکانی ئەسکەندەریان دیت و بینیان کە سوارەکانی نزیك دەبنەوە، جێیان چۆڵ کرد و بێ ئەوەی کە شمشێرێك بەرز بکەنەوە و ڕمێك بخەنە جوڵە، وەها رایان کرد کە وەك بڵێی هەندێك مشکن لە بەرامبەر پشیلەدا دەقوچێنێت! ئێرانییە سەرسوڕماوەکان ئەو دیمەن و خەیانەتە گەورەیان بینی چونکە نەدەبوایە بۆ ئەم راکردنە بە کۆمەڵە لێکدانەوەی دیکەی بۆ بکرێت" ناچار رازی بوون کە یۆنانییەکان بە ئەنقەست خەیانەتیان کردووە.

بەسەر ئێرانییەکاندا تورەیی وەها زاڵ بوو کە هێزی تایبەتی پاشای ئێران بەرەو ئەو ئێرانیانەی رایان دەکرد، دەستیان بەتیرهاوێشتن کرد، بەڵام لە بەر بەربڵاوی بەرە، تیرەکان بەر ئەوانە دەکەوت وا ڕایان دەکرد.

ئەم ڕووداوە بە یەکجاری، لای ڕاستی بەرەی ئێرانی چۆڵ کرد. دەبێ بزانرێت ئەو لای راستە کە ووتمان، لەسەر گردەکان و نێو دۆڵەکانی خوارووی چیا سەقامگیر بوون و لەگەڵ راکردنی یۆنانییەکاندا، نەك هەر لای راستی ئێران چۆڵ مایەوە، بەڵکو تەواوی ئەو شوێنە بەرزانە کە نەیدەهێشت بەرەو خوار تیرهاوێژی بکرێت، کەوتە دەستی سوپای ئەسکەندەر و هەر ئەو ڕووداوە بووە هۆی ئەوە کە داریووشی سێهەم، پاشای ئێران ناچار ببێت پاشەکشە بکات.

مێژوو نووسانی یۆنانی لەبارەی ئەم شەڕەوە کە بەناوی شەڕی "ئیسیۆس" ناو دەبرێ، دەڵێن کە داریووشی سێهەم ووتوویە کە هێزی گەورەی خۆی لەم ناوچە تەنگەدا کە لە لایەکەوە کێو و لە لایەکی تریشەوە دەریا بوو، سەقامگیر کرد. چونکە زۆربەی هێزی ئەو لەم بەرە تەنگەدا وەکو کەسێك کە لە چوارچێوەیەکی تەنگدا بووبێ، ئازادی جوڵەی نەبوو، هەروەها ووتوویە لەم ناوچەیە کە بەشێك لەو گردە بوو، لە گەڵ ئەسکەندەردا شەڕی کرد" چونکە سەربازەکانی ئەسکەندەر لە پشت گردەکاندا رادەوەستان" ئەو نەیدەتوانی لە هێزی تیرهاوێژی خۆی بەسەر ئەواندا کەڵك وەربگرێت.

بەڵام سەرنجی بە دوو خاڵ دا.

یەکەم ئەوە بوو کە داریووشی سێهەم بە شوێن دەستگیر کردنی ئەسکەندەرەوە بوو، کە لە ناکاو ئەسکەندەری هاتە بەرچاو و پێش بینی

لە ناکاو هاتنی ئەویان نەدەکرد، ئەگینا داریووشی سێهەم فەرمانی نەدەدا کە لەو ناوچە تەنگەدا لە گەڵ ئەسکەندەر شەڕ بکات.

دووەم ئەوە بوو کە لە سوپای ئێراندا هیچ کەس نەدەهات بە خەیاڵیا کە ئەو یۆنانیانە وا خۆیان بەئێرانی لە قەڵەم دەدا، ئاوا یەکجار خەیانەت بکەن و لای راستی هێزەکانی ئێران چۆڵ بکەن.

دوای ئەوە کە لای راستی هێزەکانی ئێران بەم خەیانەتە گەورەیە چۆڵ بوو، ئێرانییەکان بەدەستەواژەی ئەمڕۆ کەوتنە نێوان دوو ئاگر" هێزە جەنگییەکانی ئەسکەندەر لە دەریاوە , ئەو هێزانەی کە گردەکانیان گرتبوو، لە باکوورەوە بەرەو ئەوان تیرهاوێژییان دەکرد.

هێرشی لەناکاوی یۆنانییەکان بەم رەوشە سەرسوڕهێنەرە، لە رۆحیەتی هەندێك لەتاقمەکاندا، بێ کاریگەر نەبوو" چونکە ئەوانە نەیاندەتوانی وا بیر بکەنەوە کە یۆنانییەکان هەڵدێن. بەڵکو بیریان لەوە دەکردەوە کە فەرماندەی گشتی هێزەکان لەبەر بەرژەوەندییەك کە بۆیان دیار نەبووە، فەرمانی کێشانەوەی داوە و پێش ئەوە کە فەرمانی راکێشانەوەی بە ئەوان دابێ، بەرەو پشتی بەرە بەڕێ کەوتون.

هێندێك مێژوونوسی زمان بازیش کە لە گەڵ ئەسکەندەردا بوون، ئەو رووداوەیان وەکو توانستی خۆرسکی ئەسکەندەر خستە بەرچاو و رووداوێك کە لە لای ئێرانییەکانەوە خەیانەتە و بۆ ئەسکەندەر رووداوێکی چاوەڕوان نەکراو بوو، سەرچاوەکەیان لە تواناى لە ڕادەبەدەری سەربازی ئەوەوە دەزانی، چونکە ئەسکەندەر تا نیوەڕۆ دەترسا کە چی بکات، ووتیان کە ئەو سەرکەوتنەی بەپیلانی پێشوو و بەراورد کردنی گواستنەوەی ئێرانییەکان لە شوێنی خۆیان بۆ شوێنێکی دیکە بەدەست هێناوە و هۆکاریشی ئەوەیە کە تا نیوەڕۆ خەریکی داڕشتنی نەخشە و

جێبەجێ کردنی سوپاکەی بووە ئەگەر بەبێ لایەنگری دادوەری بکرێت لەم بارەوە ئەسکندەر تەنیا کارێکی بەرچاوی ئەنجام داوە، ئەوەش ئەوەیە کە لە ناکاو هاتووە و رووداوەکانی دوایی، وەك خەیانەتی یۆنانییەکان بە سوودی ئەسکەندەر تەواو بووە.

دیسان مێژووناسانی یۆنانی بەزمان چەوری بۆ ئەسکەندەر، نوسیویانە کە داریووشی سێهەم دوای شەڕی "ئیسێۆس" ئیدی رانەوەستا، مەگەر ئەو کەسە کە ڕوباری فوراتی نێوان خۆی و ئەسکەندەری کردە لەمپەڕ. سەرچاوەی ئەو رووداوەش بە ترسێکی زۆر دەزانن کە ئەسکەندەر دوای شەڕی "ئیسێۆس" خستوویەتیە دڵی داریووشی سێهەمەوە.

دووەم، دوای شەڕی "ئیسێۆس" بەپێی ئەوە کە شێرازەی سوپای داریووشی سێهەم پچڕا، پێویستی بە پێکهێنانی سوپایەکی نوێ بوو و ئەو نەیدەتوانی ئەو سوپایە پێك بهێنێت، مەگەر لەو لاوە، واتە لە رۆژهەڵاتی فورات و لە بابل ، کە ئەمڕۆ بە مێزۆپۆتامیا ناو دەبرێت.

راکێشانی داریووش تا رۆژهەڵاتی فورات، کارێکی عەقڵانی سەربازی بووە، چونکە نە سوپای هەبوو، نە لە دەشتاییەکی تەخت دا دەیتوانی پێش ئەسکەندەر بگرێت. بەڵام لە بابلدا هەم سوپای پێك دەهێنا — هەم ڕوباری فوراتی دەکردە کۆسپی نێوان خۆی و ئەسکەندەر.

تەنانەت ئەمڕۆش کە کەرەستەی ماتۆڕی و تەواوی شێوازی پردسازی لە شەڕ، گرنگی ڕوبار و رووبارەکانی لە بواری بەرگری لە هێزێکی پەلاماردەر، زۆر کەمی نەکردووە، دیسان و رووبارە گەورەکان کەرەستەیەکی تارادەیەك چاك نەبۆ بەرگری لە سوپایەك.

هەروەها داریووشی سێهەم حەقی بووە کە خۆی بگەیەنێتە رۆژهەڵاتی فورات، تاکو بتوانێ بەپشت بەستن بەڕوباری ناوبراو، بەر بە هێزەکەی

ئەسکەندەر بگرێت. ئەوە کە داریووشی سێهەم لە شەڕی "ئیسێۆس" دا شکستی خواردوە، گومانی تێدا نییە، بەڵام دەبیٚ هۆکارەکانی بخرێتە ڕوو و سەرچاوەی هەمووی لە زیرەکی لایەکەوە نەزانرێت و بیٚ توانیی کەسی بەرامبەر.

ڕۆژی داواتر تر کە ڕۆژی بە خاك سپاردنی مەیتەکان بوو، ئەسکەندەر فەرمانی دا کە دوای کۆتایی مەراسیمی ناوبراو کە یۆنانییەکان و مەقدوونیەکان بەشێوازێکی تایبەت ئەنجامیان دەدا" سوپاکەی پشوویەك بدەن، بەڵام ڕۆژی پشوو، بەر لەوەی کە مەیتەکان بنێژن، هەواڵیان بەئەسکەندەر دا کە هێندێك لەچادرەکانی دوژمن بەدەست لێنەدراوی ماونەتەوە و دەرفەتیان نەبووە کە کۆی بکەنەوە.

ئەسکەندەر بەرەو لای ئەو چادرانە ڕۆیشت و بینی لەناو چادرەکاندا فەرشی بەهاداری تێدا ڕاخراوە و لەدوو چادردا سفرەی خۆراك ڕاخراوە و خۆراکە جۆراوجۆرەکان لە سەر سفرەکان دەبینرێت.

یەکیٚ لەو شتانە کە تا ڕادەیەکی زۆر هۆی سەرسوڕمانی ئەسکەندەر بوو، ئەوە بوو کە لە یەکیٚ لە چادرەکاندا حەمامێکی بینی لە بەردی "یەشم" ئەو حەمامە بە نەخشی زێڕ و زیو ڕازێنرابۆوە. ئەوەندە جوان دروستیان کردبوو کە ئەسکەندەر لە سەیر کردنی ئەو تێر نەدەبوو، وە بڕیاری دا کە هەر لەو حەوزە گەورەیەدا حەمام بکات.

شت گەلێکی تر کە لەچادرەکاندا وەدەست دەکەوت" سیٚ هەزار کوپەی زێڕ بوو، ئەسکەندەر فەرمانی دا کە ئەو زێڕانە دابەش بکرێت بە سەر سەربازان و ئەفسەرەکانیدا ، سیٚ هەزار کوپەی زێڕ بەپارەی ئەو دەمە، بە بڕێکی گرنگ دەژمێردرا" چونکە کۆی بەرهەمەکانی دوکانەکانی زێڕ لەیۆناندا لە ساڵێکدا زیاتر لە یەك هەزار کوپە نەدەبوو. ئەسکەندەر لە

خواردنی ئەو خۆراکانەی کە لە چادرەکاندا دەیبینی، پاریزی کرد و ئەوانەی بۆ سەربازەکان و ئەفسەرەکانی نارد. لەم کاتەدا گوێ بیستی شیوەنێك بوو، پرسی: ئەو شیوەنە چییە؟

وەلامیان دایەوە: ئەوە شیوەنی دایك و ژنەکەی داریووشە و ئەوانە چونکە سەرپەرشتی خۆیانیان لەدەست داوە، دەنالێنن و وا دەزانن کە کوژراوە.

ئەسکەندەر یەکێك لەئەفسەرەکانی خۆی بانگ کرد وپێی گوت: برۆ لەلایەن منەوە بەدایك و ژنەکەی داریووش بڵێ کە ئەو زیندووە و ئەوان نابێ شیوەن بگێڕن.

کاربەدەستی ناوبراو رۆیشت و گەڕایەوە ووتی: خەیاڵی ئەوان لەو بارەیەوە ئاسوودە بووە، بەلام هێشتا هەر پەرۆشن.

ئەسکەندەر لێ ی پرسی پەرۆشی ئەوان بۆ چییە؟

نێردراو وتی: ئەوان نازانن داهاتوویان چۆن دەبێت و لە گەڵیاندا چۆن رەفتار دەکرێت.

ئەسکەندەر ووتی: برۆن و دڵنیایان بکەنەوە لە ئێستاوە تا رۆژێك کە من زیندووم، لە گەڵیاندا بەشێوەی حورمەت و رێزی جاران کە چۆن بوون، رەفتاریان لە گەڵ دەکرێت و هەر جۆرە کەرەستەیەکی ژیان کە لەڕابردوودا لەبەر دەستیاندا بووە، لە داهاتوویشدا بۆیان دابین دەکرێت.

یەکێك لە ئامادە بووان لێ ی پرسی : ئایا خەرجی ئەوان لە لایەن ئێوەوە دابین دەکرێت؟

ئەسکەندەر ووتی: بەڵێ، خەرجی دایك و ژنەکەی داریووش و مانگانەی خزمەتکارەکانی ئەوان لە خەزێنەی من دەدرێت و هەموو ئەو

خزمەتكارانەی كە تا ئەمڕۆ لە لای ئەوان خزمەتیان كردووە، لەمەودواش هەر دەبیٚ خەریكی خزمەت بن.

ئینجا یەكێك لە ئامادەبووان لیٚ ی پرسی  ئایا دەستە و دایرەكەی لە خزمەتی ئەواندا دەمیٚننەوە؟

ئەسكەندەر لە وەڵامدا ووتی  بەڵیٚ، ئەوانیش لە خزمەتدا دەمیٚننەوە.

دەبیٚ ئەوەش بزانریٚت لەوكاتە دا هیٚشتا رەوشی ئەسكەندەر نەگۆڕابوو، بەڵام دوای چەند ساڵێك، ناوبراو كۆمەڵێك رەفتاری ئەنجام دا كە شیاوی باس كردن نەبوو. بەڵام تا ئەو كاتەی كە دایك و خێزانی داریووش مابوون، بەرێزەوە هەڵس وكەوتی لە گەڵدا دەكردن. بەو جۆرەی كە باس كراوە ژنەكەی داریووش دووگیان بووە، دوای چەند مانگ، ماڵئاوایی لە ژیان كردوە، بەڵام دایكی داریووشی سێهەم تا ماوەیەكی زیاتر ژیا و ژیانێكی هێژای هەبووە.

ئەسكەندەر نە تەنیا دوای رووداوی "ئیسیۆس" لە بەرامبەر دایك و ژنی داریووشی سێهەم ریٚزی نیشان دا، بەڵكو داكۆكی دەكرد لەوەیكە هەموو خزمەتكارەكانیشیان كە ماونەتەوە بەتایبەتی ژنەكان كە لە خزمەتی دایك و ژنەكەی داریووشدان دەبیٚ رێزیان لیٚ بگیریٚ و تەنانەت یەكێك لە سەربازان كە سەرپیٚچی لەو فەرمانە كردوە و سووكایەتی بەژنێكی خزمەتكار كردوە، دوای ئەوەی كە تاوانەكەی سەلمێنراوە، لەسێدارە دراوە.

شەو دوای ئەوەی كە گەورەكانی سوپا لە چادری ئەسكەندەردا كۆبوونەوە، دەستیان بەخواردنەوە كرد، بەڵام ئەسكەندەر خۆی ئەو شەوە لێوی لە شەراب نەدا و لە جیاتی خواردنەوە دەستی بە نووسینی بە سەرهاتەكانی ئەو رۆژەی كرد. (ئەو كاتە تەمەنی ئەسكەندەر بیست و

یەك ساڵ بوو) و دوای ئەوەی کە بە سەرهاتەکانی ئەو رۆژەی نووسی، پەرتووکی "ئۆدێسە" ی هومەری بەدەستەوە گرت و سەرقاڵی خوێندنەوە بوو.

بە وتەی مێژوونوسانی یۆنانی وەکو بڵێی دەیویست بزانێ کە کردارەکانی ئەو رۆژەی خۆی چەندە نزیکە لە کرداری قارەمانەکانی پەرتووکی "هومەر"و گەشتە ئەو ئەنجامەی کە هیچ یەك لە کردارەکانی لە قارەمانانی "هومەر" نەدەچوو کە خۆیشیان لە جەنگەکانیاندا بەشدار دەبوون بەلام لە شەڕی "ئیسیۆس" دا ، دەتوانین بلێین ئەسکەندەر تەنانەت شمشێرەکەی دەرنەکێشا و بەس سەیری رەوشی گۆرەپانی شەڕی کرد[١]

لەو شەوەدا سەرەڕای ئەوەی کە ئەسکەندەر لە سەرکەوتنی شەڕی ئەو رۆژەی دا خۆشحاڵ بوو، بەلام لە هەمان کاتیشدا پەرێشانی ئایندە بوو. وای دەزانی کە داریووشی سێهەم، لەوانەیە لەکاتی پاشەکشە کردنیدا هەموو ئەمباری خۆراکەکانی لە پاش خۆی لەناو بردبێت، کە لە ڕەوشێکی وەهادا ئەسکەندەر ناچار دەبێت رێچکەی خۆی بگۆڕێت و بەرەو باکوور بەرێ کەوێت بۆ ئەوەی بتوانێت ، پێداویستی و خۆراك بۆ سەربازەکانی دابین بکات. بە پێچەوانەوە وانەبوو و داریووشی سێهەم کە پەلەی بوو زووتر خۆی بگەیەنێتە میزۆپۆتامیای ئەمڕۆ بۆ ئەوەی بتوانێت سوپایەکی تازە لەوێ پێك بێنێت. لەبەر ئەوە دەرفەتی لەناو بردنی

---

[١] لە دێرەکانی پێشوودا رووباری "ئیسێۆس" کە شەڕی ئەسکەندەر و داریووشی سێهەم تا رادەیەك لەنزیکی مەسەبدا رووی داوە، ئەمڕۆ لەتورکیادا بەناوی "سیهان" ناو دەبرێت و ئەم رووبارە لەچیاکانی ناوەندی تورکیای ئەمڕۆدا سەرچاوە دەگرێت و لەکەنداوی "ئەدەنە"وە دەڕژێتە دەریاوە؛ ماوەیەك لەمەو پێش لەتورکیادا، بەنداوی گەورە کە لەسەر چۆمی "سیهان" دروست کرابوو، کرایەوە و لەئەنجامی دروست بوونی ئەو بەنداوەدا زرێبارێکی دەستکرد دروست بوو کە درێژاییەکەی چل و پێنج کیلۆمەترە و دەتوانێ هەشت سەد ملیۆن مەتری شەش پاڵوی ناو لەخۆوە بگرێت.

ئـــەمبارەکانی خـــۆراکی نـــەبوو ، بـــەڵام لـــە رۆژ و هەفتـــەکانی دواتـــردا ئەسکەندەر لە سەر رێی خۆی ئازوقە و خۆراکی بەدەست هێنا.

جیا لـەم باسـە، دڵەڕاوکێیـەکی تـری ئەسـکەندەر ئـەوە بـوو کـە دەیزانـی داریووشـی سـێهەم گـەر بگاتـە میزۆپۆتامیـا (بـابلی ئـەو کـات) سـوپایەکی گـەورە کـۆ دەکاتـەوە و ئـەویش گـەر بیـەوێت پـێش بەمـە بگرێـت هـیچ چارەیەکی لـەوە زیـاتری نییـە کـە بەخێراییـەکی زۆرتـر خـۆی بگەیەنێتـە بابـل. بـەڵام، ئەفسـەر و سـەربازەکانی کـە مانـدوو بووبـوون ، دەیانویـست ماندوویەتیان دەرکەن و دەیانووت: ئیتر خۆ هیچ مەترسییەکمان لـە پـێش نییە. وا باشترە کە ئەسکەندەر یەک دوو هەفتەیەک دەرفەتی پشوودانیان بـدات و بـۆ ئـەوەی هێزێکیـان بـە بـەردا بێتـەوە. چـونکە جگـە لەشـەڕیش، رێپێوانەکانیشیان ماندووی کردبوون.

❊❊❊

# ژنە ئێرانییەکەی ئەسکەندەر:

قەدەغــەی تونــدی ئەســکەندەر لەســەر ئــەوەی کــە کاربەدەســتان و سەربازانی سوپاکەی نابێ لە بەرامبەر ژنە ئێرانییەکاندا کە لە دوای رۆیشتنی داریووش بەدیل گیراون، سووکایەتی بکەن، بوو بە هۆی ناڕازی بوونیان.

یەکێ لەوانە ووتی کێ ناڵێ جوانی ئەو ژنانە کاریان لە تۆ نەکردبێ؟

ئەسکەندەر بەتوندی وەڵامی دایەوە: جوانی ئەوان کار لە من ناکات.

کاربەدەستان و سەربازانی، ئەو بۆچوونەیان پەسند نەدەکرد، بەڵکو وایان بیر دەکردەوە کە بەپێچەوانەوە، جوانی ژنانی ئاماژە پێکراو، کاریان زۆر لەسەر کردوە. بەڵام لە بەرئەوەی دەیانزانی ئەسکەندەر لەم بەشەدا سەختگیرە،لە بەرئەوە زۆریان لێ نەدەکرد.

"هێفاستیون"- کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی یۆنان- زیاتر لە کەسانی تر لە ئەسکەندەرەوە نزیك بوو و لەبارەی ژنەوە هاوبیری ئەسکەندەر بوو، لەوانەیە بەهۆی هەڵس و کەوتی لە گەڵ ئەسکەندەردا ئەم گۆڕانەی تێدا بەدی هاتبێ. بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە کە لە رووی هزرییەوە زۆر لە یەکەوە نزیك بوون و هەر ئەوەش وای کرد کە کاربەدەستان و سەربازانی ئەسکەندەر تووشی ترس و دڵەڕاوکێ بن و زۆربەی کارە بەد رەوشتەکانی خۆیان لە ژێر پەردەی نهێنیدا بشارنەوە. لەم رووەوە هەندێك جار رەفتارگەلێك دەکرا کە تا ماوەیەکی کورت لە

پشت پەردە نهێنییەکانەوە دەمایەوە و لە گەڵ ئاشکرا بوونی، کەسانی دەست درێژیکەربانگ دەکران و سزایەکی توند دەدران.

رەنگە ئەو قسە و باسانەی کە لە سەر نەبوونی حەز و ئارەزووی ئەسکەندەربوو بۆ ژنان ، بەتایبەت لە لایەن نەیارانییەوە کەوتبووە سەر زمان و بگرە لە مێژووشدا تۆمار کراوە، گریمانێکی تر دێنێتە ئاراوە. بەلاّم بە ووتەی مێژوو کاتێک کە "هێناستیون" لەئەسکەندەر دوور کەوتەوە، دیسان ئەسکەندەر لە بەرامبەر ژناندا بێ حەز و ئارەزوو بوو. کەواتە دەتوانین بڵێین نەبوونی حەزی ئەسکەندەر بەرامبەر بە ژنان شتێکی سرووشتی – دەروونی بووە.

فەرمانێك کە ئەسکەندەر بۆ "پارمنیو" ی فەرماندەی هێزی دەریایی ناردبووی ، ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ناوبراو بۆ ژنان رێزێکی تایبەتی هەبوو.

لەم دەستوورەدا کەسانێك کە لە گەڵ ئەسکەندەر بوون هەروەك لەبیرەوەرییەکانی خۆیاندا ئاماژەیان پێ کردووە، ئەسکەندەر بە "پارمنیو" دەڵێت

"دوو کەس لەکاربەدەستانی ئێوە سووکایەتیان بەرامبەر بەژنێك کردووە و لەگەڵ سەلماندنی تاوانیان لەسێدارەیان بدەن، چونکە ئەو پیاوانەی کە سووکایەتی دەکەن و رێز لەژنان ناگرن جیاوازیان لە گەڵ ئاژەڵدا نییە"

بە هەمان شێوە جارێکی تر دەڵێت "ژنێك کە رووبەڕووی سووکایەتی دەبێتەوە و ژنی یەکێکە لەو کاربەدەستانەی کە لە گەڵماندا هاوپەیمانە و

ژنی ئەو هاوپەیمانە لە گەڵماندایە، ئەگەر ئەفریقیایی یان ئاسیایش بێت دەبێ رێزی لێ بگیرێت.

لە سوپای ئەسكەندەردا هیچ ئەفسەر و سەركردەیەكی بەتەمەن نەبوو و بەتەمەنترین ئەفسەری "پارمنیو" بوو كە چل و پێنج ساڵ تەمەنی بوو. هۆكاری نەبوونی ئەفسەر و سەربازی بەتەمەن لە سوپای ئەسكەندەر دا ئەوە بوو كە دانیشتوانی مەقدوونییە نەریتیان وابوو گەنجەكانیان لە تەمەنی پانزە یان شانزە ساڵی دا ژنیان بۆ بهێنن. هەروەها گەنجەكانیان لەم تەمەنەدا دەچوونە ناو سوپاوە و سەربازێك كە بیست و پێنج ساڵی تەمەن بایە ، سەربازێكی كۆن بووە كە دە ساڵ خزمەتی شەڕی هەبووە.

بەم جۆرە نەوەی "پارمنیو" لە سوپای ئەسكەندەر دا بە پلەی سەربازی خزمەتی دەكرد و ئەم بابەتەش بووە هۆی ئەوەی كە هەندێك لە مێژوونوسان، پارمنیو بە پیاوێكی (هەشتا- نەوەد) ساڵە بزانن" بیریشیان لەوە نەدەكردەوە كە لە مەقدوونیەدا، ژیانی هاوسەریەتی لە تەمەنی لاوێتیدا دەست پێ دەكات.

پارمنیو، پێ ی لە سەر ئەوە دادەگرت كە ئەسكەندەر ژن بهێنێ و ئەیووت ئێستا شەش ساڵە لە كاتی ژن هێنانت تێپەڕ بووە و ئێوە دەبێ ژن بخوازن تا جێگرێكتان هەبێت.

لە ئەنجامی پێداگرتنی پارمنیو، ئەسكەندەر ناچار بوو "برسین" بخوازێت، بەڵام بە پێی رێ و رەسمی ئەوكاتە، بە (كەنیزەك)[1] گرتی.

"برسین" كچێك بوو لە بنەماڵە نەجیبەكانی ئێرانی و خوێندنی یۆنانی هەبوو" پێش ئەسكەندەر شووی كردبوو. بەڵام مێردەكەی لە شەڕدا كوژرابوو و بەتەمەن چەند ساڵ لە ئەسكەندەر گەورەتر بوو.

---

"برسین" بە هۆی ئەوەی کە چەند ساڵێك لە ئەسکەندەر گەورەتر بوو،بە ئاسانی دەیتوانی کاری تێ بکات،. بەڵام ئەو حەزی لەو شتە نەبوو و زۆربەی کاتەکانی بە تەنیایی لەچادرەکەیدا لە گەڵ ژنە کارەکەرەکان دەگوزەراند و ئەسکەندەر بەردەوام بەدۆستانی خۆی وتبوو لەوە کە لە گەڵمدایە پەرۆشم" بەڵام پارمنیو پێداگری دەکرد کە من ژنم هەبێت و دەڵێت هەر کات ئێوە ژنتان نەبێت، نەك هەر سەلامەتی دەروونی، بەڵکو سەلامەتی فیکریشتان تێکدەچێت.

"برسین" کە ووتمان خوێندنی یۆنانی هەبووە و لە خوێندندا پلەیەکی باشی هەبووە، وەکو هێندێکی تر کە لە گەڵ ئەسکەندەردا بوون، بیرەوەرییەکی لەو سەفەرەی نووسیووە کە بەشێك لەوانە لە کتێبەکانی کەسانی تردا ماوەتەوە و دەڵێت ئەسکەندەر دوای ئەوە کە نامەبەر، نامە ئەهێنێ، لە خوێندنی نامەی دوو کەس زەردەخەنەیەکی پێشکەش دەکرد. یەکێك نامەی "ئەرەستو" و ئەوی تر نامەی "ئانتی پاتر" فەرماندەی لەشکەری مەقدوونیە کە دوای رۆیشتنی ئەسکەندەر، سەرپەرشتی ئەو وڵاتەی لەسەر شان بوو. ئەسکەندەر لە کاتی رێپێوانداا، چەتری لەسەر خۆی رانەدەگرت جگە لەکاتی باران. لە هەتاو ترسی نەبوو، نەریتی وابوو.

کاتی رێپێوانی لە یەکەیەکەوە بۆ یەکەیەکی تر بە ئەسپەکەی خۆی کە بە "بوسفال" ناو دەبرا دەرۆیشت" جارجار لەسەربازەکان تیروکەوانی وەردەگرت و نیشانی دەگرتەوە.

کاتێ کە دڵی خۆش بوو، لەناو کالیسکەیەك دادەنیشت و کە سێ و چوار ئەسپ رایان دەکێشا و ئەویان بەخێراییەکی زۆرەوە دەبرد و لەم

کارە چێژێکی زۆری وەردەگرت و کاتێك کالیسکە ئەوەستا, روومەتی لە خۆشیانداسوور دەبووەوە.

هەرچەند برسین نەیدەویست کە کار لەئەسکەندەر بکات، بێ خواستی خۆی کاری زۆری کردە سەر ئەو پیاوە و ئەوکاریگەرییە ئەوەندە بوو کە ئەسکەندەری لە گەڵ سەربازەکان و ئەفسەرەکانیدا هاودەنگ کرد تا لە کەناری دەریای رۆما بوەستن بۆ ئەوەی کە بتوانێ زیاتر لە راز و نیاز لە گەڵ برسین دا کەڵك وەربگرێت. دوو شت بووە هۆی ئەوەی کە برسین لە ئەسکەندەر کار بکات:

یەکەم، ئەوەی کە یەکەمین ئەشقی ئەو بووە و پێش لە برسین، ئەسکەندەر لە گەڵ هیچ ژنێك راز و نیازی نەکردووە.

دووەم، ئەوەی کە برسین، بە ژنێکی ئێرانی، واتە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەژمێردرا و وەکو هەموو رۆژهەڵاتییەکان، هەستەکان لەبوونیا لە شتەکانی تر زیاتر بووە.

ئەسکەندەر پێش ئەوەی کە لە گەڵ برسیندا زەواج بکات، تەنیا دایکی خۆی "ئۆڵۆمپیا" و ئەو ژنە یۆنانی و مەقدوونییەیانەی ناسیوە کە ناسراوی دایکی بوون.

ئاشکرایە کە لە نێوان دایك و کوڕێکدا، ناسین و تێکەڵاو بوون بەو جۆرە نیە کە لە نێوان ژن و مێردێکدا، هەیە. لەم رووەوە، ئەسکەندەر تێگەیشتبوو کە ژنانی یۆنانی و مەقدوونی، هەموو خوێن ساردن و لە ژیاندا، عەقڵ لە سەر هەموو شتیاندا زاڵە. ئەو حەزی دەکرد ژنێك وەکو کچانی ئەفسانە پەیدا بکات و ئەم ژنەش لە یۆناندا پەیدا نەدەبوو.

کاتێ کە برسینی ناسی و تێگەیشت کە ئەو ژنە رۆژهەڵاتییە سەرتاپای هەستە و سۆزە، زانی ئەوەی کە ویستوویە، بەدەستی هێناوە و

بەئەفسەرە گەنجەکانی دەیووت: هەرکات بتانەوێ بخوازن، ژنێکی رۆژهەلاتی بۆ هاوسەریتی هەلبژێرن. چونکە ژنەکانی یۆنان لە گەلْ مێشکی خۆیاندا ئەژین" لە کاتێکدا ژنانی رۆژهەلاتی لە گەلْ دلْی خۆیان درێژە بەژیان دەدەن.

راپۆرتیان دابوو بە ئەسکەندەر کە برسین قوتوویەکی هەیە ژەهرێکی ترسێنەری تێدایە و ئەم قوتوو لەبەر چاوی هەمووان ئەشارێتەوە.

ئەسکەندەر سەری سوڕما لەم راپۆرتە و ووتی: کە لە ناو قوتوودا ژەهر دانانێن" بەلام ئەوان ووتیان: ئەگەر ئەم قوتوو ژەهری تێدا نییە، بۆچی برسین ئەوە بەکەس نیشان نادات. تەنانەت شەوانەش لەبەر ڕووناکی چراکەوە، قوتووەکە ناکاتەوە و تەنیا کاتێ کە مانگەشەو لەچادرەکەی دەدات، دەیکاتەوە و ناوەکەی سەیر دەکات و ئەم باسە هێندێك لە خزمەتکاران بینیویانە کە لە ناکاو چوونەتە چادرەکەی برسینەوە،.

شەوێك ئەسکەندەر پرسیاری لە برسین کرد: ئایا راستە کە تۆ ژەهرێکت لەناو قوتویەکدا شاردۆتەوەو بەکەسی نیشان نادەیت؟ لەبیستنی ئەم قسەیە، برسین شەرمەزار بوو و گومانی ئەسکەندەر زیاتر بوو و پێداگری کرد کە دەبێ ئەو قوتویە ببینێت.

برسین ووتی: سیخورەکان درۆیان بە تۆ وتووە و لەم قوتووەدا ژەهرنییە" بەلام شتێکی تێدایە کە بۆ ئەشقی ئێمە خراپتر لەژەهرە.

ئەسکەندەر وتی: هەر چۆنێك بێت دەبێ من ئەو قوتووە ببینم. برسین هەستا و لە هەمان چادردا، لەناو شتە تایبەتەکانی خۆیدا، قوتوویەکی دەرهێنا و لە بەردەم ئەسکەندەردا کردییەوە و ووتی: سەیری کە. ئەسکەندەر بینی کە بازووبەندێکی تیایە لە شێوەی ماردا کە خشلْی و

ژنانەیە و کاتێك کە دەستی پێدا دەکەی، وەکو ئەوەیە کە مارێك لە دەوری قۆڵت گرێدرا بێت.

ئەسکەندەر لە بینینی زێڕی ناوبراو سەری سوڕما و گرتی بەدەستیەوە و دیتی کە لە ڕووی جەستەی مارەکە ناوی مێردەکەی پێشووی برسینی لە سەرە.

زێڕەکەی دایەوە و ووتی بۆچی ئەوەت شاردۆتەوە؟

برسین ووتی: لە بەر ئەوەی ئەگەر نیشانتم بدایە، وا بیرت دەکردەوە کە هێشتا من عاشقی یەکەم مێردی خۆمم. لە کاتێکدا وا نیە و من تەنیا لە ڕووی ئەمەکەوە، یادی ئەوم لە بیرە و ئەمەکیش جیاوازە لە عەشق" لەم ڕووەوە بەدگومانییەك کە بە سەر ئەسکەندەر زاڵ بوو، نەما.

***

ئەسکەندەر لە کەنار دەریای ڕۆمادا ئەوەندە وەستا تاکو زستان هات و کاتی جم وجوڵی سوپا و شەڕیش تەواو بوو.

ئەسکەندەر کاتەکانی خۆی بەم جۆرە بە سەر دەبرد جارجار ڕاوەماسی دەکرد و کاتێك لە کەناری دەریادا دادەنیشت یا بەسەیرکردنی سوپا و ئەو یەکە سوارانەی کە لە بەردەمیدا دەهاتن و دەچوون خەریك دەبوو و کاتێکیش ئاوڕی دەدایەوە بۆ دواوە، ئەیبینی لە کاروانە ڕێگەدا کە بە درێـژایی کەناری دەریـا هـاتبووە ئـاراوە، کاروانیـەکان دەڕۆن و لـە گـەڵ خۆرئاوا بوونی زستان، خەریکی گۆرانی وتنن.

جار جار بەوانەی دەوری خۆی دەووت : بڕوانن کە ڕۆژهەڵات چەندە جیاوازی هەیە لە گەڵ وڵاتی ئێمەدا. ئێمە لە گەڵ ئەوەی کە لە سنووری شارەکانی خۆمان تێپەڕ دەبین، دەچینە ناوچەی دڕندەکانەوە" لە کاتێکدا

هەرچەند لە ناو ئەم وڵاتە (ئێران) دەچینە پێشەوە، شار و دێ دەبینن و هەندێك لەم شارانە هی سەدان ساڵ لەمەو پێشە.

کاتێك ئامـاژەی بـەرە و لای ئـەو ڕووبارانـە دەکـرد کـە لـە چـیا (ئاودارەکان)ەوە خوڕەی دەهات و ئەیووت: هەرچەند زستانە، خۆشیی ئەم هەوا و دیمەنە وەکو وەرزی بەهارە و ئەگەر من بە دەستی خۆم بوایە کە لە شوێنێکدا نیشتەجێ بم، تەواوی تەمەنم لێرە بە سەر دەبرد.

ئەمانە کە لە وڵاتی خۆیان ئەژین و کەشی شێداری وڵاتی ئێمەیان نەبینیوە، قەدری وڵاتی خۆیان نازانن و ئاگایان لێ نییە کە نیشتمانەکەیان، جوانترین خاکە کە خوداوەند بە مرۆڤی بەخشیوە.

ئەوانە لێرە خۆڵ لە زەوی هەڵدەگرن و گۆزە دروست دەکەن و لەوێ (لە چیاکان) لە تەختەی و دارەکان کەڵك وەردەگرن و کەشتییان پێ دروست دەکەن لە کارگەکانیاندا.

تەنانەت ئەو کێوە گابەردەشی کە بێ درەختە و لە دوورەوە دیارە بێ سوود نییە. چونکە خەڵکی ئەم وڵاتە (قسڵ) بۆ بینا و خانووەکانیان لێبەدەست دێنن.

مامۆستاکەم ئەرستۆ دەڵێت: کە نابێ لە ژیاندا پشت بەخەیاڵ ببەستی. بەڵکو ئەبێ بە هێزەکان، یان بوونەوەرە سرووشتییەکان پشت ببەستی" چونکە تەنیا هێزەکان و بوونەوەرە سرووشتییەکان ئەم لاو ئەولا بوونیان هەیە و لە سرووشتدا هیچ هێز و بوونەوەرێك، جگە لە بەرژەوەندییەکی تایبەت بوونی نییە و ئەگەر بەردەکانی کێوێك کە بێ درەختە، یان خاکی دەشتێك کە وشك و بێ بەرە، بەڕای ئێمە بێ سوود دیارە" چونکە ئێمە هێشتا لە بەرژەوەندی ئەوانە، تێ نەگەیشتووین.

# نوێنەرانی داریووشی سێهەم:

ئەو کاتەی کە ئەسکەندەر لە کەنار دەریای رۆما بوو، کۆمەڵێك نوێنەر هاتن و داوایان کرد کە ئەسکەندەر ببینن و نامەکەی داریووشی پێ بگەیەنن.

ئەسکەندەر ئەوانی قبووڵ کرد و مۆری لە نامە کردەوە و بینی کە داریووشی سێهەم پێشنیاری پێکردووە کە ئاشتی بکەن و بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی، بەبێ ئەوەی کە لە کاتی وەستان و کاتی گەڕانەوە زیانێك لەئاسیای بچوك بدات.

"ئەسکەندەر لە وەڵامی داریووشدا، نامەیەکی نووسی کە بابەتەکەی ئەمە بوو: لە شەڕی ئیسێۆسدا خواکان ئەیان ویست کە من سەر بکەوم، ئێستا کە ئێوە خوازیاری ئاشتین، خۆتان وەرن و داوای ئاشتی بکەن، بەو مەرجەی کە من بە پاشای ئاسیا بناسیت"

دیارە کە داریووش ئەم مەرجە قبووڵ ناکات و وای بۆ دەچوون کە شەڕی تر لە بەردەمدایە.

***

# بەهاری ساڵی ٣٣١ ی پێش زایین

لەبەهاری ساڵی ٣٣١ ی پێش زایین، ئەسکەندەر لە شاری "سعوور" کۆبوونەوەیەکی بەست و داوای لە ئەفسەرەکانی سوپا کرد کە بۆچوونی خۆیان لە روون بکەنەوە سەبارەت بەوەی کە دەبێ بەرەو رۆژهەڵات بچنە پێشەوە، یان بگەڕێنەوە.

زۆربەی ئەفسەرەکان وتیان ئەو ناوچانە کە تا ئێستا داگیرمان کردووە، هەشت، یان نۆ ئەوەندەی خاکی مەقدوونییەیە و هەرکات لەوە زیاتر بچینە پێشەوە، دیار نییە کە ئایا بە ئاوەدانی دەگەین، یان وڵاتانی بێ ئاوەدانییە؟ هەرچەند کە بابل لە پێشەوەیە، بەڵام ئێمە لە بارەی بابل زانیاریمان نییە.

دەڵێن کە ئێران کەوتۆتە رۆژهەڵاتی بابل، بەڵام رەوشی ئێران بە تەواوەتی بۆ ئێمە نادیارە و ئێمە هیچ نەخشەیەکمان بۆ رێپێوان لە ئێراندا دابین نەکردووە و لەوانەیە هەر بوونی نەبووبێ.

تەنیا زانیارییەك کە لە بارەی بارودۆخی ئێرانەوە هەمانە" مێژوویەکە کە "هیرۆدۆت" نزیکی سێ سەد و پەنجا ساڵ بەر لە ئێستا، لە بارەی ئێرانەوە نووسیویە ، بەڵام لەو پەرتووکانە ناتوانین کە لە بارودۆخی رێی کاروانەکان و شارەکان و چیاکان تێبگەین.

تاقا نەخشەیەك کە بارودۆخی جوغرافیای ئێران بەئێمە دەناسێنێ، نەخشەیەکە کە "هیکاتائوسا" لە سەر دنیا دایناوە، بەڵام ئەو نەخشەیە

ئەوەندە گشتگیر نییە، چونکە ناتوانی تێبگەی کە ئایا فلان ناوچە لە گەڵ ناوچەیەکی تر، سەد فرسەق دوورە، یان هەزار فرسەق؟ رۆیشتنی ئێمە بەرەو رۆژهەلات، بەو رەنگە، جۆرێك لە شێتی نییە؟ چونکە ئێمە وەکو ئەو کوێرانە دەبین کە ئەیانەوێ بچنە شەڕی چاوساغەکانەوە! تازە ئەگەر لەم شەڕە سوودێکیش بە ئێمە بگات، رەنگە بە هیوای بە دەست هێنانی سوود، خۆمان بخەینە مەترسییەوە.

بەڵام بە داخەوە شانسی بە دەست هێنانی هیچ سوودێك نییە و لە بەرامبەردا، لە هەر هەنگاوێکدا مەترسی لە سەر رێماندایە.

نادیارە کە ئەسکەندەر چ وەڵامێکی داوەکەوە بە ئەفسەرەکانی. چونکە لە وەڵامی ئەو ئاگادارییەکمان نییە. بەڵام وا بزانین دژایەتی کرد، واتە لە گەڵ ئەوەدا بوو کە بەرەو رۆژهەلات بچن.

هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە بۆچوونی ئەو سەرکەوتنی بەدەست هێنا و سوپا بەرەو رۆژهەلات بەڕێ کەوت.

کاتی رۆیشتن بۆ رۆژهەلات، ئەسکەندەر، هەندێك وەرگێڕ و کەشتی ساز و پیشەسازی تری لە گەڵ خۆیدا لە "سعوور"ەوە برد، چونکە لەوانە بوو کە لە ناو رێدا پێویستی بەوان ببێت.

کاتێ کە سوپای ئەسکەندەر بەڕێ کەوت، لە دەشتێکی گەرمەوە دەستیان بە رێپێوان کرد. لە کەناری کاروانە رێیەکاندا، گەرمای توندی هەوا، گژ و گیای لە ناو بردبوو، بۆ چارەواکان شتێکی نەهێشتبوو. کاتێ گەیشتنە گوند و دەشتەکان نەیاندەتوانی خواردەمەنی بۆ سەربازەکان بەدەست بێنن.

سەیر کردنی دەشتە پانە بێ بەر و ووشکەکان، سەربازەکانی، بەتایبەت سەربازە تازەکانی دەترساند و دەیانووت: ئێمە نازانین مەبەستی ئەسکەندەر لەوەی کە ئێمە لەم ڕێگایەوە دەبات چییە؟

سەربازە کۆنەکان کە خۆیانیان بەئاگا نیشان دەدا، ئەیانووت: مەبەستی ئەسکەندەر ئەوەیە کە گەنجێك بەدەست بهێنێت و کۆتایی بەشەڕ بێنێت.

ئەسکەندەر هەندێك لە سەربازەکانی بۆ کەشف ناردە پێشەوە کە بڕۆن و ببینن لە پێشەوە بارودۆخ چۆنە" ئەوانە دەڕۆیشتن و دەگەڕانەوە و دەیانووت، لە پێشەوە جگە لە دەشتایی ووشك و بێ بەر کە ئێستا لەوێداین، شتێکی ترمان نەبینیوە.

ئەو کاتە سەربازەکان زیاتر دەترسان و بە ترسەوە لە خۆیان دەیان پرسی، ئێرە کوێیە؟... ئایا کۆتایی جیهان هەر ئەم شوێنەیە؟ مەگەر واناڵێن کە کۆتایی دنیا شوێنێکە کە لەوێدا ئیدی مرۆڤ سوود وەرناگرێت لە ژیان.

لێرەش نە مرۆڤ هەیە و نە زیندەوەر" تەنیا جارجارمارمێلکەی بچوك لە ناو لمدا سەریان دەهێنایە دەرەوە و تۆزێ بەزمانیان ئاماژەیان دەکردە سەربازان و دوایی ون دەبوون و بە دیار نەدەمان.

ڕۆژێك، گەیشتنە تاقمێك لە دانیشتوانی ناوچەکە کە بەوشتر دەڕۆیشتن، پرسیاریان لەوان کرد، ڕووباری گەورە کە لەم لاپەڕانە نووسراوە لە کوێیە؟ ئەوانەش پەنجەیان بەرەو ڕۆژهەڵات درێژ کرد و ووتیان، ڕووباری گەورە لەوێیە. بەڵام دوای ئەو ڕووبارە، ڕووبارێکی تریش هەیە کە یەکەمیان "فورات" و دووەمیان "دجلە" ی ناوە.

ڕۆژێك کە فورات لە دوورەوە کەوتە بەرچاوی سەربازان زۆر خۆشحاڵ بوون، چونکە وابیریان دەکردەوە کە دەورەی ڕێپێوانیان لە ناوەندی دەشتە ووشك و بێ بەرەکاندا کۆتایی هاتووە!

***

ئێستا کاتی ئەوەیە کە هەڵەیەکی تر ڕاست بکرێتەوە و ئەوەش ئەوەیە کە هەندێك لە مێژوونوسان نووسیویانە کاتێ ئەسکەندەر گەیشتە ڕوباری فورات" ڕاستەوخۆ بەرەو دجلە ڕۆیشت، لە کاتێکدا وانییە.

دوای ئەوەی کە ئەسکەندەر لە فورات تێپەڕ بوو، لە باتی ئەوەی کە سەربازانی خۆی ڕاستەوخۆ بەرەو دجلە ببات، ئەوانەی بەرەو باکووری ڕۆژهەلآت برد و هەموو ئەوانەی کە بیرەوەری خۆیانیان نووسیوە" لەم بەشەدا ناکۆکن و نادیارە کە ئەم هەڵەیە لە کوێ بۆ هەندێك لە بیرەوەری نووسان پەیدا بووە.

وادیارە و بیریان کردۆتەوە کە ئەسکەندەر دوای ئەوەی کە لە فورات تێپەڕ دەبێت ، دەبوایە بەرەو دجلە بڕوات. لە کاتێکدا ئەسکەندەر، سەربازانی خۆی بەرەو باکووری ڕۆژهەلآت ڕێنمایی کردووە و هەموو لە بیرەوەرییەکانی خۆیاندا وتوویانە: گەیشتنە شوێنێك کە ڕەنگی زەوی گۆڕا و ڕەنگی سوور بوو (خودی نووسەر ئەم ناوچەیەی لە "بين النهرين" دا بینیوە – هارولد لەمب). تەنانەت شێوازی بیناکانی گوندەکانیش جۆرێکی تر بوو.

تا ئەو کاتە سەربازانی ئەسکەندەر لە لای ئەو گوندانەوە دەڕۆیشتن کە بانەکانیان تەخت بوو و دوایی چوونە ناو ناوچەیەکەوە کە بانی خانووەکانی گوندەکە وەکو گومبەز دەهاتە بەرچاو.

ماوەیەك سەربازانی خۆی لەم ناوچە کوێستانییەدا دەرباز کرد و لە تەواوی کاتدا بەرەو باکوور دەکەوتە جوڵە و دوایی ئەوانەی بەرەو لای رۆژهەڵات نارد و بە سەر چیاکاندا هاتنە خوارەوە و چوونە ناو ناوچەیەکی فێنك کە جۆگەکانی ئاوی پێیا دەڕۆشت.

هەندێك لە کۆنە سەربازان، کاتێ لەو کێوانەوە دەڕۆیشتن، بە سەربازە گەنجەکانیان دەووت: ئەم کێوانەی کە دەیبینن، کێوی "قاف"ە و ئەو دەشتە کە لە لای رۆژهەڵاتەوە دیارە، ئەو پەڕی کێوی قاف و ئەوپەڕی دنیایە.

دوای ئەوەی کە لە کێو هاتنە خوارەوە، لەو دەشتە بەرینەدا چاویان کەوت بە ڕووبارێکی زۆر گەورە کە ئاوەکەی رەنگی خۆڵەمێشی بوو. وتیان کە ڕووباری ناوبراو دجلەیە و ئەسکەندەریش سەربازەکانی لە دجلە تێپەڕاند.

بەڵام ڕووبەڕووی سوپای ئێران نەبووەوە، چونکە سوپای ئێران لە رۆژهەڵاتی دجلەدا، چاوەڕوانی ئەسکەندەر بوون و ئەو وەك ووتمان بەرەو باکوور کەوتە ڕێ. هەر ئەو شەوە کە لە دجلە دەرباز بوون، مانگ گیرا و دنیا تاریك بوو.

سەربازانی فینیقی کە لە ناو سوپای ئەسکەندەردا بوون، ووتیان کە تاریك بوونی مانگ، هۆی ئەوەیە کە ئێمە لە نیشتمانی خاتوونی جیهانی ژێر زەوی (خاتونی تاریکی)، نزیك بووینەتەوە.

ئەم خاتوونە کە حاکمی ناوچەی نەهرەینە واتە ناوچەی فورات و دجلەیە، لە سەر سێ شتی دیکەش حاکمە

یەکەم، لەسەر ئاسمان،

دووەم، لەسەر زەوی،

سێهەم، لە سەر دنیای ژێر زەوینی تاریکییەکان.

بەهۆی ئەوەی کە سەربازە فینیقیەکان بە پێچەوانەی سەربازە یۆنانییەکان خەیاڵ پەرەست و خوراف بوون و لەوەی کە خۆیان دوور لەوڵات دەبینی، زۆر ترسان. لەوە بەدوا سەربازانی ئەسکەندەر لە درێژایی رووباری دجلە بەرەو باشوور دەڕۆیشتن و ماوەیەکی پێ نەچوو کە گەیشتنە دەشتێکی پڕ لە لم.

لەو دەشتە، لم ئەوەندە زۆر بوو کە وەکو گردۆڵکە لە سەر یەك کۆ دەبوونەوە و کاتێ یۆنانییەکان چاویان بە لمەکان کەوت ، ووتیان: لێرە دەریا نییە، چۆن بەم جۆرە لمەکان کۆبوونەتەوە، یەکێك لە زاناکانی ئەوان ووتی: ئەو لمانەی دەیبینن، بە هۆی ئەو ڕوبارانەوە کە لێیان دەرباز بووین هاتۆتە ئاراوە و کاتێ کە ئاوی ڕوبارەکە دێتە سەرەوە، لمەکان کە لە ئاودان، لە سەر یەك دەنیشێن و لە ئەنجامدا، ئەم رەوشە ، دەهێنێتە کایەوە.

دوای ئەوەی کە لە دەشتی لمین دەرباز بوون، گەیشتنە ناوچەیەکی تر کە لەوێدا کەڵەگاکان زۆر دەبینران. یۆنانییەکان لە بینینی ئەو کەڵەگایانە ، سەریان سوڕماو پیرەکانی ئەوان (واتە ئەو سەربازانەی کە تاڕادەیەك لەوانی تر پیرتر بوون) ووتیان ئەمانە لە ڕابردوودامرۆڤ بوونە و خاتوونی تاریکی ئەوانەی وا لێ کردوە و ترس لەوەیە کە ئێمەش بەبێ ئیزنی ئەو هاتووینەتە ئەم نیشتمانە" وەکو ئەم زیندەوەرانەمان لێ بکات" سەربازە گەنجەکانیش باوەڕیان بەم قسە دەکرد.

سەربازانی پێشەنگ ووتیان: ئێمە شارێکمان بینی کە لەم لاو و لەولای دەرگاکەیەوە، پەیکەری گیانداری باڵدار بوون، بەڵام سەریان وەکو سەری مرۆڤبوو و کلاوێك وەکو کلاوی گەورەکان لەسەریاندا بوو.

لەوانە پرسیار کرا کە ئایا ئەویٚ، شاری "خاتوونی تاریکی" نەبوو؟

سەربازەکان وەڵامیان دایەوە : ئێمە نازانین ناوی چ بوو و هەر ئەوەندە کە بینیمان ئەو زیندەوەرە باڵدارانە لەوێدان، گەڕاینەوە.

پرسیار کرا کە ئایا ئەو گیاندارانە ناوبراو دەجوڵان، یان نا؟

سەربازەکانی پێشەنگ وەڵامی نەرێنیان دایەوە و ووتیان : وادێتە بەرچاو کە ئەو دەعبایانە لەبەرد دروست کرابێن.

سەربازان دوای بیستنی ئەم قسەیە کەوتنە ئەندێشەوە و سەریان سوڕما. بەو جۆرە کە قسەکە گەیشتە گوێی ئەسکەندەر و ئەو ووتی لەو پەیکەرانەی کە لە بەرد دروست کراون، ترستان نەبێت" بەڵکو لە مرۆڤ بترسن. چونکە پەیکەری بەردین ناتوانیٚ بەرەو ئێمە بێت و "تیر" فڕیٚ بدا و بە ڕم و شمشێر و تەور هێرش بکەنە سەرمان.

کاتیٚ گەیشتنە ئەو شارە، بینیان کە شارەکە چۆڵە و تەنیا هەندێك سەرباز و بریٚ پیاوی دەرباری جامانە لە سەر بەناو شاردان[1]

لەم شارەدا یەکیٚ لەو شتانە کە کەوتە بەرچاوی سوپاییەکانی ئەسکەندەر، جۆگەیەن ئاو بوو کە ئاوەکەی لە چیای تەنیشت شارەوە دەهات و رۆژی دوایی کاتیٚ کە لە لای چیای ناوبراو تێپەڕ بوون، بینیان کە لە سەر گردی کێوەکە" پەیکەری مرۆڤ گەورە لەوێیە و مێژوونوسانی سوپا دەریان خست کە ئەم نەخشانە، کۆنە سوڵتانەکانی ئاشوور نیشان دەدات کە رۆژێك خاوەنی هێزێکی زۆر بوونە و ئێستا ماوەیەك لە نەمانی ئەوان بە سەر چووە.

[1] هارولد لمب نووسەری کتێبەکە نالێت کە ئەم شارە ناوی چ بووە، بەڵام بەپێی ئەو نیشانانە کە دەیدات، لەوانەیە کەشاری ناوبراو "ئەلدوور" ی ئەمڕۆکە بێت کە لە کەناری دجلە دەبینرێت. وەرگێڕ.

دوای دەربــاز بــوون لــە کــەناری چـیای نــاوبراو، چــاویان کــەوت بــە دەشتاییەك کە ئاپۆڕەی یەکە سواری سوپا لەوێوە تێپەڕ دەبوون.

ئەسکەندەر تاقمێك لە هێـزە تایبەتەکـەی خـۆی نـارد تـا بـڕۆن و بـزانن ئەوانـە کـێن و ئەگـەر دەکـرێ لـە دانیـشتوانیناوچەکە لـە بـارەی ئەوانـەوە بکۆڵنــەوە. نــاوبراوان رۆیــشتن و گەڕانــەوە و ووتیــان ئەوانــە بەشــێك لــە هێزەکانی داریووشـن و واتـە پێشەنگانی سـوپان و بەشـی زۆری سـوپا لـە دواوەیە و بەو جۆرە کە دانیـشتوانی ناوچەکە بۆی دەچوون، لە ناویانـدا ژمارەی سوارەکان زیاترە لە پیادەکان.

چـۆنیەتی زەوی لـەو ناوچـەیە وابـوو کـە هێزەکـانی ئەسـکەندەر لـە بەرزاییدا بوو و سوارەکانی ئێرانی لە دەشتایی خوارەوە.

ئەسکەندەر و سەربازانی لە هەموو تەمەنیاندا نەیاندیبوو کە ئەو هەموو ســوارە لــە شــوێنێك کۆببنــەوە" تــرس زاڵ بــوو لــە ســەر ئەســکەندەر و سەربازانیدا و خێرا ئەسکەندەر دەستووری راوەستانی دا.

ئەسکەندەر بە هۆی دوو شت فەرمانی دا کە سەربازان راوەستن یەکەم ئەوەی کە پشوویەك بدەن و ماندوویەتی رێپێوانەکەش لە گیانیان دەرچـێ و دووەم ئەوەی کە هیوادار بوو سەربازە سوارەکانی ئێرانـی بەرەو بنکـەی یۆنانییەکان پەلامار بەرن" بۆ ئەوەی یۆنانیەکان بە کەڵك وەرگرتن لە باری جوغرافی خۆیـان و بڵنـدایی شـوێنەکەیان بەجۆرێك کـە بە قـازانجی ئـەوان بێت، شەڕ بکەن. بەڵام سوارە ئێرانییـەکان بە پلانـی ئەسکەندەر زانیـان و پەلاماریان نەدان.

***

# (( ڕۆژی شەڕ لە کەناری دیجلەدا ))

سەربازەکانی ئەسکەندەر ئەو شەوە تا نزیکی نیوەشەو پشوویان دا و دوای نیوەشەو فەرمانی دا کە بکەونە ڕێ و لە ولاتێکەوە کە گژ و گیای بڵندی هەبوو، دەرباز بوون و کاتێ کە خۆر هەلات، نزیکی هێزەکانی ئێران بوونەوە وشێوەی جەنگیان بەرپا کرد. هەر بەو جۆرە، هێزەکانی ناسراو بە ڤالانژ کە باسمان لێ کرد، چوارگۆشەکانی خۆیان خستە مەیدان و لە دواوەی ئەوانە، ئەندازیاران بەردهاوێژەکانیان دامەزراند و لە پالیاندا بڕێ بەرد کۆ کرایەوە.

لەو شوێنە کە سەربازەکانی ئەسکەندەر شێوەیجەنگییان وەرگرت، گوندێك هەبوو کە مێژوونوسانی یۆنانی، ناوی ئەوەیان بە "گوگاملا" نووسیوە و چونکە مێژوونوسانی یۆنانی نەریتیان وابووە کە ریشەی ناوچەییان زۆر دەگۆڕا، ئەمڕۆ بۆ ئێمە دیاری کردنی شوێنی ئەم گوندە تا ڕادەیەك ئەستەمە.

ئەو ڕۆژە تا کاتی شەو، هەر دوو لا ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە و کاتێ کە تاریکی داهات، ترسی یۆنانییەکان زیاتر بوو.

ئەوانە لە ڕووناکی ڕۆژدا نەیاندەتوانی پەی بە فراوانی بەرەی ئێرانیەکان ببەن، بەلام لە دوای تاریکی، مەشخەلەکان کە لە بەرەی ئێرانییەکان داگیرسا، نیشانی دا کە فراوانی بەرە و ژمارەی سوپای ئێرانییەکان زیاتر لەوەیە کە بیریان لێ دەکردەوە.

تەنانەت "پارمنیو" کە یەکێك لە کۆنە ئەفسەرەکانی سوپا بوو، ترس دایگرت و بە ئەسکەندەری وت : دەبێ چ بکەین و لە بەرامبەر ئەم سوپایەدا رۆڵی ئێمە چییە؟ ئایا باشتر نیە کە هێرش و پەلامار دەست پێبکەین؟

ئەسکەندەر ووتی: ئەگەر سوپای ئێران خەوتبوایە ئێمە پەلامارمان بدانایە، ئومێدێك هەبوو بۆ سەرکەوتنمان، بەڵام دەبینن کە هەموو وشیار و ئامادەن، لەم رووەوە ئەبێت چاوەڕێی رۆژ بکرێ و هەروەها ئەسکندەر بەپارمنیوی ووت سبەینێ لە ژیانی ئێمەدا رۆژێکی گرنگە چونکە لە شەڕی سبەینێدا دەردەکەوێت کە فەرمانڕەوای ئاسیا مەقدوونیەکانن، یان ئێرانییەکان" ئێستا بەسەربازان بڵێن : بە هەر جۆرێك دەتوانن پشوو بدەن تا کاتێك رۆژ دەبێتەوە.

ئەسکەندەر چووە ناو چادرە بچوکەکەیەوە تا بخەوێ، بەڵام نەیتوانی خەوی لێبکەوێت و پێش ئەوەی رۆژ بێتەوە، هەندێك لە ئەفسەرەکان کە وەکو ئەو نەیاندەتوانی بخەون، دەوری چادرەکەی ئەویان گرت.

ترس ، قولابە نادیارەکانی خۆی لە ناخی تاریکی دا بەرەو سەردارەکانی ئەسکەندەر درێژ کردبوو، ئەوانی داگرتبوو و هەر چی تێدەکۆشان هەر چونێك بێت ترس لە خۆیان دوور بخەنەوە, نەیاندەتوانی سبەی کە هات، ئەسکەندەر کە شەو نەیتوانیبوو بخەوێ، لە بەر بێ خەوی بێ تاقەت بوو.

هەر کە تیشکی هەتاو دای لە سەر گردەکانی رۆژهەڵات، پارمنیو دەستووری دا کە سوپاییەکان نانی بەیانی بخۆن. لەم کاتەدا ئەسکەندەر کە لە بێ خەوی زۆردا بێ هێز ببوو، تاوێ خەوت تا ئەوەی کە پارمنیو هات و دووبارە بانگی لێ کرد — ئەسکەندەر... ئەسکەندەر...

ئەسکەندەر لەخەو هەستا و ئەو زرێیەی کە لە شەڕی ئیسیۆس دا بە دەستی هێنابوو، لە بەری کرد و کڵاو و ماسکێکی کانزایی سووکی لە سەر ناو لە چادرەکە چووە دەرەوە. و سواری ئەسپەکەی بوو کە لە پێشەوە جڵەویان رادەکێشا[1]

مەقدوونیەکان دوای رووناکایی رۆژ، وەکو شەوی پێشو دەترسان. ترسی ئەوان لەوەوە سەرچاوەی دەگرت کە چارەیەکیان نەبوو جگە لەوەی بکوژرێن، یان بکوژن. ئەوانە لە رووی دلێرییەوە مەبەستی پێشەوە چوونیان نەبوو، بەڵکو بۆیە دەیانەویست بچنە پێشەوە چونکە فەرمانێکی لە لایەن ئەسکەندەرەوە دراوە و ئەوانە ئەبوایە جێ بە جێیان بکردایە

ئەگەر هەموو سەربازان و ئەفسەرەکانی سوپا لە ئەنجامدانی ئەو فەرمانە سەرپێچییان بکردایە، بێ گومان هیچ سەربازو کاربەدەستێك نەدەچوونە پێشەوە. بەڵام چونکە هەندێك بۆ ئەنجام دانی فەرمانەکە ئامادە بوون، ئەو کەسانەی کە نەیان ئەویست بچنە پێشەوە، دەترسان کە بە "نافەرمان" لە قەڵەم بدرێن و ئابرووی جەنگییان برژێت" چونکە لە گۆڕەپانی شەڕدا، خراپترینی سەرشۆڕییەکان ئەوەیە کە کەسێك بەترسەنۆك بناسرێت.

برێك لە رۆژ تێپەڕ بوو، ئەسکەندەر کە بە سواری بوسفالەوە بوو لە گەڵ یەکە سوارەی چەکی قورسی کەوتە رێ.

---

(١) کاتێك ئێمە ئەم دێڕانە دەخوێنینەوە، پێی دلگرانین کە بۆچی لەبارەی ئەم شەڕە و ئەوەی کە ئارایشی سوپای ئێران چۆن بووە و لەشەو و رۆژی شەڕی لەناو سوپای ئێراندا چ کارەساتێك رووی داوە، زانیارییەکی بەمجۆرە باش نازانین. چونکە هەموو بەڵگە مێژووییەکان لەسەر کارەساتەکانی جۆراوجۆر لەناو چووە و ئەمڕۆ تەنیا لەرووی وتەی مێژوونوسانی یۆنانی کەم تاکورت دەبێ لەرەوشی سوپای ئێران لەم شەڕەدا تێبگەین. ئەم تێبینییەمان لەم بارەوە بەپێویست زانی کە خوێنەران سەریان سوڕ نەمێنێت کە بۆ لەبارەی سوپای یۆنان ئەوەندە قسە کراوە، بەڵام لەبارەی سوپای ئێران شتێك نەوتراوە. وەرگێر-

چـونکه شـەڕ دەسـتی پێکرابـوو و ئێرانییـەکان پـەلاماریان دەسـت پێکردبوو. بێ گومـان یەکـەمین سـەرکەوتنەکان بۆ ئێرانییـەکان بـوو. لـە یەکەم کاتژمێرەکانی شەڕدا، دووبارە لە دواوەی سوپای ئەسکەندەرەوە هـاتن و لای چەپی سوپای ئەسکەندەر کە بە ڤالانژ پشتیان بەستبوو، هەڵتەکاند" لەم کاتەدا پارمنیو دیسان لە ئەسکەندەر داوای یارمەتی کرد.

ترسـێکی گـەورە کـەوتبووە نـاو سـەردارەکانی ئەسـکەندەر، چـونکە رەوشی شەڕ دەیسەلماند کە سوپای یۆنان شکست خواردنی مسۆگەرە. بەڵام لـەم کاتـەدا ڕووداوێکی چاوەڕوان نـەکراو هاتـە پێشەوە و ئـەوەیش ئەو بوو کە ئەو سوپاییيانەی وا بەشێك لـە کەمینـە رەگـەزەکان بوون و لـە سوپای ئێراندا شەڕیان دەکرد، یەکسەر جێیان چۆڵ کرد و هـەڵاتن و ئـەم بابەتە، رۆڵی بارودۆخی بەرەی ئێرانی سەراوبن کرد و سوارەکانی چەکی قورسی ئەسکەندەر کە شوێنەکەیان چۆڵ بینی، هێرشیان کردە ئەوێ.

بۆچی ئەم ریزە کەمینە رەگەزەی سوپای ئێران، هـەڵاتن، بۆ ئێمـەش لـە بواری مێژووییەوە نادیارە. ئێران ئیمپراتۆرییەکی گەورە بوو کـە هەنـدێك لـە نەتـەوەکانی تـر لـە ژێـر ئـاڵای ئـەودا دەژیـان و بـوونی کەمینـەکانی رەگەزیی لە سوپای ئێراندا، بە شتێکی نائاسایی نەدەژمێردرا.

ئەمـە دووەم جار بـوو کـە ئێرانییـەکان خەیانـەتیان دەکـرد و ئەگـەر ئـەم خەیانەتـە نـەدەبوو، حەتمـەن لـە کـەناری ڕوبـاری دجلـەدا سـوپای ئێـران سەردەکەوت.

بۆ دووەمین جار بە هۆی ئەم خیانەتەوە، داریووشی سێهەم ناچار بە پاشەکشە بوو و پاشەکشەی یەکەم وەکو باسمان کرد لە شەڕی ئیسیۆس رووی دا.

ئەگەر داریووشی سێهەم، دوای ئەو خەیانەتە خێرا پاشەكشەی نەكردایە، لە گەڵ تەواوی ئەنجوومەنەكەیدا دەستگیر دەبوو، چونكە بە هۆی چۆڵ بوونی شوێنی ناوبراو، داریووش و سوپاكەی نێوان ریزێكی ڤالانژ و ریزێك لە سوارەكانی چەكی قورس یۆنانی دەمانەوە.

ئەم پاشەكشەیە كە لە بواری تاكتیكییەوە پێویست بوو، بە سەرنج دان لە و خەیانەتەی سەرەوە كە بوو بە هۆی ئەوە كە بەشەكانی تری سوپا سارد بێنەوە و بەم جۆرە ئەسكەندەر دیسان بە هۆی كارەساتێكی چاوەڕوان نەكراوی تر، كە نەخۆی و نە ئێرانییەكان پێش بینیان نەدەكرد سەركەوت.

ئەم شەڕە بەوەی كە لە ناوچەی "گوگاملا" رووی دا لە مێژوودا بە ناوی شەڕی "ئەربل"، یان "ئەربیل" دەناسرێت و هۆكاریشی ئەوەیە كە مێژوونوسانی سەدەكانی دوایی، ناوی "ئەربیل" كە پارچەیەك لەناوچەیەكی كوێستانی بوو، شەست (میل) لە "گوگاملا" وە دوور بوو، لەسەر ئەم شەڕە دانا.

بەڵام راستییەكەی كە لە نووسراوەكانی هاوڕێیانی ئەسكەندەر دەبینرێت" هەر ئەوەیە كە لە ناوچەی "گوگاملا" شەڕ رووی داوە، نەك "ئەربیل"" رۆڵی شەڕیش كە لە دەشتایی ئەنجام دراوە، دەسەلمێنێت، كە لە ئەربیل – ناوچەیەكی كوێستانی رووی نەداوە.

شەڕی گوگاملا لە لایەن مێژوونوسانی سەدەكانی دوایی، بە ناوی شەڕی "ئەربل" یان "ئەربیل" لە مێژوودا تۆمار كراوە" لە لایەن مێژوونوسانی یۆنانی، بە دەستەواژەی ئەمڕۆ، ئامێری گەورە بوو بۆ پڕوپاگەندە.

ئەوانە ئەم شەڕەیان بە گەورەترین نموونەی زاڵ بوونی هێزی پیادە بە سەر هێزی سوار زانیوە و ووتیان لە شەڕی ناوبراودا، هێزی پیادەی کەمی مەقدوونی، ئەبوایە لە بەرامبەر هێزی سواری لە ڕادەبەدەری ئێرانی، لە ناو چووبا" چونکە دەشتی "گوگاملا" تەخت بوو و باشترین جێ بوو بۆ ڕمبازێنی سوارەی ئێرانی.

مێژوونوسانی یۆنان، ڕووداوێك کە لە سەدا نەوەد، سەرچاوەکەی شانس بووە، ئەوان بە توانای نائاسایی ئەسکەندەر و ڕێك و پێکی سوپای مەقدوونیە و گرنگی و بایەخی جەنگیی سەربازەکانی یۆنانییان داناوە.

لە کاتێکدا لە دەورانی دواییدا، هەر لەم ناوچەیە، یان ناوچەگەلی وەکو ئەو، چوار سوپای بیانی بە دەستی سوپای ئێرانی لە ناوچوون" چونکە لەو چوار شەڕەدا، ئێرانییەکان خەیانەتیان نەبینی و هەرجارێك، هێزی سواری سوپای بیانییەکانیان لەم شوێنەدا، قڕ کرد.

یەکەم: (مارك ئانتوان) خۆشەویستی بە ناوبانگی (کیلیۆپاترا) شاژنی میسری لەم ناوچەدا لە گەڵ سوپای ئێران ڕووبەڕوو بوونەوە و هێزی سواری ئێرانی بەجۆرێك شیرازەی سوپاکەی تێکدا کە بە زەحمەت رایان کرد و هەندێك لە یەکەکانی خۆیانیان کۆکردەوە و ڕۆیشتن.

دووەم: سوپایەکی ڕۆمی بە فەرماندەیی "کراسوس" لە دەشتی سوریا کە ئەویش دەشتاییەکی تەخت و هاوشێوەی دەشتاییەکانی قەراخی دجلەیە، لە گەڵ هێزی سواری ئێرانی ڕووبەڕوو بووەوە و ئێرانییەکان بە هێرشێك وەها سوپای ڕۆمیان خاپوور کرد کە بە تەواوی ڕێکخراوی سوپا و یەکەکانی لە ناو چوو و خودی "کراسوس"، سەرکردەی ڕۆمی کوژرا.

سێهەم: سوپایەكی تر بە فەرماندەیی "والرین" ئیمپراتۆری رۆم بە دەستی هێزی سواری ئێرانی ون بوو و ئێرانییەكان، خودی "والرین"یان بەدیل گرت" كە ئێستا چۆن بە دیل گرتنی والرین لە سەر یەكێك لە نەخشە بەردینەكانی ئێران نەخشێنراوە.

چوارەم: سوپایەكی تری رۆمی بە فەرماندەیی "ژوولین" ئیمپراتۆری رۆم هەر لەم دەشتەی گوگاملا لە قەراخی دجلە بە دەستی هێزی سواری ئێرانی تێك شكا و "ژوولین" هەوڵی دا كە پاشماوەی هێزەكەی بكشێنێتەوە" بەڵام لە رێگادا ژیانی لە دەست دا.

بێ سود نییە كە پێتان رابگەیەنین هەر لەم ناوچەدا، ماوەی پێش شەڕەكانی ئەسكەندەر، سوپایەكی یۆنانی بە فەرماندەیی "گزنفون" بە دەستی هێزی سواری ئێران خاپوور كرا و "گزنفون" دە هەزار كەس لە سەربازەكانی پیادەی خۆی كۆ كردەوە و بە خێرایی گەڕایەوە.

مێژوونوسانی یۆنانی ئەم پاشەكشەیان گەورە كردوە و ئەوە وەك یەكێ لە رواڵەتەكانی سرووشتی سەربازی یۆنانییەكان نیشان دەدەن و دەڵێن "گزنفون" لە گەڵ دە هەزار سەرباز هاتنە دڵی خاكی ئێران بێ ئەوەی ئێرانییەكان بتوانن بەریان بگرن" بەڵام ئێرانییەكان دەیانزانی كە بكەونە ئەو شوێنە چەند سەربازێكی راكردوو كە ئامێری شەڕیان پێنییە و لە هیچ شوێنێكدا ناتوانن راوەستن، لە بواری سەربازییەوە بێ سوودە. ئێرانییەكان ئاگاداربوون لەوەی كە ئەمانە هێزیان نییە كە یەك رۆژ لە شوێنێكدا راوەستن" بێ ئەوەی سەیری دواوەی خۆیان بكەن، دەبوایە رێیان بگرتایە بەر تا بگەنەوە وڵاتی خۆیان" لەم رووەوە ئەوانیان بە حاڵی خۆیان هێشتەوە كە رانەكەن، چونكە بینیان لە بواری سەربازیدا بەخت كردنی چەند سەربازێك بۆ بەرگرتن لەوان كارێكی نالۆژیكییە. هەر چۆنێك

بێت، داریووشی سێهەم پاشەکشەی کرد" بەڵام خەیانەتی ئامـاژە پێکراو بوو بە هۆی ئەوە کە هەندێك لە سەربازە دلێرەکانی ئێران بە دیل بگیرێن و هەندێك فیلی زرێپۆش و ئامێرەی جەنگی کەوتە دەستی یۆنانییەکان" بەڵام ئەسکەندەر نەیدەزانی کە داریووشی سێهەم لە کام لاوە پاشەکشەی کردووە.

تا کاتی رۆژئاوابوون، ئەسکەندەر و سەربازەکانی خەریکی کۆکردنەوەی دەستکەوتەکان بوو" دوای ئەوە جارێکی تر ئەنجوومەنی شەڕیان کۆکردەوە کە چبکەن" ئایا بەرەو رۆژهەڵات بڕۆن، یان بەرەو باشوور؟

لەو زانیارییانەوە کە لە رۆژی شەڕدا بەدەست کەوتن، روون بووەوە کە لە لای رۆژهەڵات کێوی سەختزۆرن و تێپەڕ بوون لەوانە بۆ یۆنانییەکان مەترسیدارە.

لەو کێوانەدا تەنگەبەری وا هەیە کە گرووپێکی هەزار کەسی دەتوانن بەرگری لە سوپایەکی یەك سەد هەزار کەسی بکەن.

لەم رووەوە ئەسکەندەر لە باتی ئەوە کە بەرەو رۆژهەڵات بڕوا، بەرەو باشوور رۆیشت. چونکە کاروانە رێیەکی گەورە لە درێژایی ڕوباری دجلە بەرەو باشوور دەرۆیشت و رێپێوانی ئاسان دەکرد و ئامێر و بەردهاوێژەکانی یۆنانی، بە بێ کێشە لەوێوە تێپەڕ دەبوون.

هەروەها بە مەزەندە، ئەسکەندەر پێی وابوو کە داریووش لەو شوێنەوە رۆیشتووە و جیا لەم دوو بابەتە، ئەسکەندەر بیستبووی یەکێ لە چوار پایەتەختەکانی ئێران کە "شوش"ە کەوتۆتە خوارووی ئێرانەوە.

ئیمپراتۆری ئێران ئەوەندە بەربڵاو بوو کە لە دەورانی هەخامەنیشیەکان، پاشاکانی ئێران بۆ ئەوەی کە بتوانن ئەیالەتەکان

ئیـداره بکـەن، هەرچـەند جـاریٚ لـە یـەکیٚ لـەو چـوار پایەتەختـە دەیانگوزەراند" یەکیٚ لە ئەیالەتەکانی ناوەندی، شوش بوو.

ئەسـکەندەر کـە ناچار بـوو مەیتـەکان بنیٚـژیٚت و بریـندارەکانیش بخاتـە ژیٚر چارە سەرەوە، بانگی لە پارمنیو کرد و پیٚی ووت: کە لـە گـەلٚ هەندیٚ لەو سەربازانەدا کە ساغ کەمتر ماندوو بوون، بـە دریٚـژایی باشـوور بکەونـە شویٚن داریووشی سیٚهەم" تاویٚ دوای رۆژئاوابوون پارمنیو کەوتە ڕیٚ!

خـودی ئەسـکەندەر و پاشمـاوەی سـەربازەکان تـا دوای نیوەشـەو پـشواياندا و ئیٚنجـا کەوتنـە ریٚ و مـاوەی چـل کاتـژمیٚر، شەسـت میـل ریٚپیٚوانیـان کـرد. لـە گـەلٚ راوەسـتان کـاتی بـۆ دەرچـوونی ماندوويـەتی سەربازەکان و ئامیٚری شەڕ" تا ئەوەی کە گەیشتنە پاوچەی "ئەربیل" یان "ئەربل" لە دامیٚنی کیٚویٚکدا.

ئەسـکەندەر دەیتـوانی لـە بلٚنـدایی قـەلاٚی ئـەربیل لـەوە بـە هـۆی تـەپ و تۆزەوە کاروانە ریٚیەکان ببینیٚت کە بەشیٚك لـە هیٚزەکـانی داریـووش بـەرەو باشوور و بەشیٚکی تر بەرەو باکوور کەوتبونە ڕیٚ.

کاتیٚ کە هیٚزەکانی ئەسکەندەر گەیشتنە ئەربیل، سەیری کرد کە لەویٚدا دوو شت لە داریووشی سیٚهەم بە جیٚ ماوە، یەکیٚ ئەڕابەکەی و ئەوی تر تیردانەکەی کە هیٚشتا بڕیٚك تیری تیٚدا بوو.

لـە قـەلاٚی نـاوبراودا، ئەسـکەندەر ئەفسەرەکانی سـوپاکەی کـە ژمـارەی سەربازانیان سیٚ هەزار کەس بـوو، کـۆی کـردەوە و ئەنجومـەنیٚکی جـەنگی پیٚك هیٚنا و داوای بۆچوونی کردن.

ئەو باسانە کە لە کۆبوونەوەی ناوبراودا هاتە ئاراوە بریتی بوو لەمانە :

راستە کە لە شەڕی گوگاملا، هێزەکانی ئەسکەندەر توانی کە هێزەکانی داریووش بشکێنی" بەڵام ئەم شەڕە لە بواری سەربازییەوە، بایەخی هەمیشەیی نییە.

داریووشی سێهەمیش لەم شەڕەدا شکستی خواردووە، بۆ پێك هێنانی سوپایەکی تر، تووشی کێشە نابێت. چونکە ئێران وڵاتێکە بەربڵاو، کە لە هەر ئەیاڵەتێکیدا دەتوانرێت سوپایەکی گەورە بێتە ئاراوە و داریووشی سێهەم دەتوانێ لە سووزیان "خوزستان" یان لە "پارس" یان لە گورگان و سکستان "سیستان"، سوپایەکی بە هێز پێك بێنێت و پێشی ئەسکەندەر بگرێت.

بەدەست هێنانی خاك بۆ سوپایەك، کاتێ بایەخدارە کە سەربکەوێ، کە سوپای دوژمن بڕوخێنێ. تا داریووشی سێهەم مابێت، هەنگاو بنێتە هەر شوێنێك، سوپایەك پێك دێنێت. سێ هەزار سەربازی ئەسکەندەر کە لە هەر شەڕێکدا، هەندێك لەوانە کەم دەبنەوە، ئەگەر لە پێکدادانەکانی داهاتووشدا سەرکەوتن، ئەوەندە کەم دەبنەوە کە بایەخی جەنگی خۆیان لە دەست دەدەن. لەم کاتەدا کە لەم وت و وێژەدا بوون" یەکێ لە ئەفسەرەکانی ئەسکەندەر ووتی: ئێمە شەڕمان لە گەڵ مرۆڤدا نییە، بەڵکو لە گەڵ بوونەوەرێکی مەترسیداری ئەفسانەییدا شەڕ دەکەین کە سەدان سەری هەیە و هەریەك لەو سەرانە کە دەبڕێ، سەرێ تر لە جێی شین دەبێ و ئێمە هەرگیز ناتوانین دوایین سەری ئەم بوونەوەرە لێکەینەوە.

ئەفسەرێکی تر ووتی: ئێمە کە لە وڵاتی خۆماندا بووین وابیرمان دەکردەوە کە مەقدوونیە مەملەکەتێکی گەورەیە و ئێستا کە هاتووینەتە ناو ئێران، دەبینین کە هەر ئەیاڵەتێك لە ئەیاڵەتەکانی ئێران،

مەقدوونیەیەکە بۆخۆی، داریووشی سێهەم هەر چی بیەوێ لە ئەسپ و سەرباز و چەك و پارە بەدەستی دەهێنێت.

وە لە بیر نەکەن کە ئێرانییەکان ولاتپارێزترین گەلەکانی جیهانن. کاتێ کە نیشتمانی خۆیان لە مەترسیدا دەبینن ، هەموو ئاژاوە ناو خۆییەکان دەنێنە لاوە و تا دەست بدات یارمەتی مادی دەنێرن بۆ پاشاکانی سەردەم بۆ ئەوەی بتوانن لە شەڕ لە گەڵ دوژمن، هەرچی ئامێرە لە بەردەستیاندا بێت.

تا ئەمڕۆ داریووشی سێهەم بە پێی ئەو گەنجینە و ئەمبارانەی کە هەیەتی، بۆ پارە پێویستی بەکەس نەبووە، بەلام کاتێ کە هەست بکات کە پێویستی بەپارە هەیە هەرچەندی پێویست بێت، ئێرانییەکان پێ دەدەن.

بەلام هەریەك لە ئەیالەتەکانی ئێران لە بواری کشتوکالی و پیشەسازی، یەکەیەکی دەوڵەمەندە، چونکە لە هەر ئەیالەتێك، ئەوەندە گەنم و مالات هەیە بۆ ئازوقە. ئەوەندە پیشە ساز هەیە کە شمشێر و ڕم و قەڵخان و تیرو کەوان و گورز دروست دەکەن و لە بەردەستی سەربازەکان دای دەنێن.

لەم ڕووەوە ئێمە دەبێ لە خاکی ئێران، خۆمان بۆ خولێکی شەڕی پەنجا یان سەد ساڵە ئامادە کەین" ئەوەش بەو مەرجە کە ژمارەی سەربازەکانی ئێمە بۆ درێژەدان بەشەڕ بەس بێت. چونکە ئەگەر لە هەر شەڕێکدا، تەنیا هەزار سەربازی ئێمە تێدا بچێت، دوای سێ شەڕ، تەنانەت سەربازێکیش نامێنێتەوە و ئێستا کە ژمارەی سەربازانی ئێمە سێ هەزار کەسە. بایەخی شەڕی سوپا، بە پێی ڕوانینێك کەم بووە و لە شەڕی دوایی تەنیا خواکان گەیشتنە فریامان و لە گوگاملا یەکەیەك لە ڕەگەزی بیانیەکان کە لە ناو

سوپای ئێران شەڕیان دەکرد، بەسەرگەورەکانی خۆیان خەیانەتیان کرد" ئەگینا دەرفەتی سەرکەوتنمان نەبوو.

لەم رووەوە ئێمە تەنیا بە شێوازێك دەتوانین کە بە هیوای وە دەست هێنانی سەرکەوتن بین و ئەوەش ئەوەیە کە داریووشی سێهەم لە ناو بچێت" ئەگینا تا ئەو رۆژە وا داریووشی سێهەم زیندووە، زاڵ بوون بە سەر ئەم گەلە ولاتپارێزە و سەربازە دلێرەکانی ئێرانیدا، خەیاڵێکی بۆشە.

بەلام هێشتا ئەسکەندەر نەیزانیوە کە ئایا داریووش بەرەو باشوور رۆیشتووە یان بەرەو رۆژهەلات، ئایا رێگای بابلی گرتۆتە بەر، یان رێگای شوش (کە هەردوو بەرەو باشوور بوون)، یان ئەوەی کە بەرەو ئەیالاتی ناوخۆی ئێران رۆیشتووە.

بۆ دروست بوونی ئەم بابەتە، دوو کەس لە کاربەدەستانی خۆی بەرەو شوش و بابل نارد (کە دوو پایەتەخت لە پایەتەختەکانی ئیمپراتۆری ئێران بوو و بەوانەی وت

یەکەم لەوە بکۆڵنەوە کە ئایا داریووش بەرەو ئەم ئەیاڵەتانە رۆیشتووە، یان نا" ئەگەر نەڕۆیشتووە، ئایا ئەو ئەیاڵەتانە ناوبراو، خاوەنی هێزی بەرگرین هەیە، یان نا؟ ئەو دووانە رۆیشتن و خێرا ئەسکەندەر کەوتە رێ. واتە چاوەڕێی ئەو دووانە نەبوو و وا بیری دەکردەوە کە لە ڕێدا بەوانە دەگات.

***

# باخەكانی بابل " باخچە هەڵواسراوەكان"

پەلەیەك كە ئەسكەندەر كردی بۆ ڕۆیشتن، لە بڕیاری ئەنجوومەنی شەڕی ئەفسەرەكانەوە سەر چاوەی گرتبوو

چونكە لە ئەنجوومەنی ناوبراودا وترا كە هەر كات داریووشی سێهەم دەرفەتێك بە دەست بهێنێت كە هێز ئامادە بكات، سەرنگوم بوونی سەربازان و كار بەدەستانی مەقدوونی لە ئێراندا مسۆگەرە و دەبێ بە جۆرێكی واخێرا كار بكرێت كە بوار بە داریوش نەدرێ لە هیچ ناوچەیەكدا سوپا كۆ كانەوە. ناوچەی گوزەری ئەسكەندەر بۆ گەیشتن بە بابل، لە دەشتەكانی قەراخی دجلە بوو. ئەو دەشتانەی لەو سەردەمەدا، بە یەكێ لە بەرهەم هێنەرترین ناوچەكانی جیهان لە قەڵەم دەدران.

بەو جۆرە كە هاوڕێكانی ئەسكەندەر لە سەفەرنامەكانی خۆیان نووسیویانە لە بابل (مێزۆپۆتامیا) ی ئێستاكە ئەوندە داری خورما هەبوو كە ئەوان بە درێژایی رۆژ لە ژێر سێبەرەكانی دارە خورمادا دەكەوتنە جوڵە و جگە لە درەختی خورما لەو ناوچەیە، درەختەكانی میوە، بە تایبەت پرتەقاڵ و لیمۆترشیش بە فراوانی دەبینرا.

لە هەندێك لە ناوچەكانی دجلە، ئاو راستەوخۆ دەڕژایە نێو زەوییەكان و تێر ئاوی دەكرد و لە هەندێك لە ناوچەكانی تردا كە ئاو نەدەڕژایە نێو زەوییەكانەوە، بە ئامێری چەرخی تایبەت لە چۆم ئاویان دەكێشایە دەرەوە و دەیانگەیاندە مەزراكان.. لە هەندێك لە ناوچەكانیشدا كە

مەزراكان لە گەڵ ڕووبارەكان لێك دوور بوون، كاناڵ و جۆگەكان ئاوی دجلەی بەمەزراكان دەگەیاند.

بە بوونی گەرمای هەوا، بە هۆی نزیك بوونی دجلە و فراوانی باخەكان و درەختە خورماكان، مەقدوونییەكان لە گەرما ئازاریان نەدەبینی.

كار بەدەستێك كە بەرەو بابل ڕۆیشتبوو، گەڕایەوە و ڕایگەیاند كە بابل ئامێری بەرگری نییە و دوای ئەوە كاربەدەستێك كە ڕۆیشتبووە شوش، هەواڵێكی هاوشێوەی ئەم ڕاپۆرتەی هێنا و ووتی: "شوش" یش ئامێری بەرگری نییە. هۆی ئەمە كە بابل و شوش بێ بەرگری بوون ئەمە بوو كە داریووشی سێهەم، بە باشی نەزانی كە لەم دوو پایەتەختە بەرخۆدان بكات و ئەوەی بە باش زانی كە بەرەو ئەیالاتی ناوخۆیی بڕوات. چونكە بیری دەكردەوە كە هەركات لە بابل، یان شوش بەرخۆدان بكات، لە دواوەی خۆی شتێكی نابێت كە كاتی پاشەكشە بەوەوە پشت ببەستێ. لە كاتێكدا لە ئەیالەتەكانی ناوخۆیی ئێران، گۆڕەپانی پاشەكشە بەربلاو دەهاتە بەرچاو و هەرچەند كە دەچووە پێشەوە، زەوی تر هەبوو كە دەیتوانی خۆی بەو زەوییانە بگەیەنێت و هەرچەند دەرفەت یارمەتی بدات، هێز كۆ بكاتەوە.

ئەسكەندەر و سەربازەكانی كاتێك گەیشتنە بابل، لە گەورەیی شار سەریان سوڕما و كۆشكە بڵندەكانی ئەو شارە، ئەوانی خستە سەرسوڕمانەوە و كاتێ كە بەرەو ئاسمان سەیریان دەكرد، دەیانبینی كە دەڵێی لە ئاسماندا، باخی زۆریان دروست كردووە. چونكە شارەكە لە دامێنی گردێكی بڵندا هاتۆتە ئاراوە، بەرەو سەرەو و دانیشتوانی شار كە لە لێژایی گردەكەدا، خانوو و كۆشك دروست كردبوو، باخەكانیان لە سەریەك پێك دەهێنا.

لە مانەشی زیاتر منارە، پەرستگاکان، بەرەنگی زێڕین و سپی و یاقوتی، سەرنجی سوپاییەکانی ئەسکەندەری راکێشا. بە تایبەت ئەوە کە لە رۆژئاوا بووندا. گەیشتنە ئەو ناوچە و تیشکی خۆر سەری زێڕینی منارەی مەعبەدەکانی دەبریقاندەوە.

دوای چوونە ناو بابل، مەقدوونیەکان شێوەی بیناکان کە هاوشێوە نەبوون لە گەڵ شێوەی یۆنانیدا، نیشانی یەکتر دەدا و دوو کەس کە پەیکەرسازی بە ناوبانگ بوون و لە گەڵ سوپای ئەسکەندەردا بوون، لە پەرستگاکاندا دەسوڕانەوە بەڵکو پەیکەری مرۆڤ بدۆزنەوە!.

بەڵام هیچ پەیکەرێکیان نەدۆزییەوە و هەرچییان بینی، پەیکەرەی گیانداری سەیر بوو کە سەرێك وەکو مرۆڤ و باڵەکانیان وەك هەڵۆ و پێیەکانیان وەکو مانگا یان گیانداری تر بوو

هەرجارێك کە یۆنانیەمان چاویان کەوت بە پەیکەرێکی ئەم زیندەوەرە سەیر و زلانە، دەیانووت: کە ئەمە پەیکەرەی خاتوونی تاریکییەکانە.

باسی پەیکەرەکان تەواو بوو، مەسەلەی دیکە کە وا سەرنجیانی رادەکێشا، پەرتووکخانەیەکی گەورە بوو لەوێدا کە خشتەکانی لە جۆرێك خاکە" بەڵام سوور کرابۆوە و بینیان کە لە سەر ئەو خشتانە، مێژوو و یاسای کۆنی بابل نەخش کراوە و تەنانەت لە ناو هەندێك لە خشتەکاندا نووسراو گەلێکیان دەبینی پەیوەندی کە بەزەمانی "نبۆکەدنەزەر"، عەرەبەکان ئەم پاشایەیان، بە "بەختوئنەسر" ناو دەبرد.

مەقدوونیەکان تێگەیشتن کە دانیشتوانی بابل بۆ ئەوەی کە بتوانن لەفێنکی هەوا، بەتایبەت لە کاتی شەودا کەڵك وەرگرن، تەنانەت تا ئەو جێیە توانیویانە، بیناکانی خۆیان بەشێوەی (هەرەم) و بڵند سازیان کردووە، بە جۆرێك کە هەر نهۆمی سەرەوە لە نهۆمی خوارەوە بچوکترە و

زۆربەی بینا بڵندەکانی ناوبراو بە دەستی کۆیلەکان دروست کراون و هەندێك لە بیناکان تەنانەت پانزە نهۆمی سەرەوە دەڵێیت جیاوازە" تێدەگەی کە هەوا لە چاو زەوی زۆر فێنکە.

ئەرستۆ بە ئەسکەندەری ووتبوو: کە میزۆپۆتامیا، ناوچەیەکە کە لەوێدا دوو هۆکاری ژیان بە فراوانی دەست دەکەوێ یەکێك هەتاو و ئەوی تر ئاو" لەم رووەوە دەتوانی بڵێیت کە لەم ناوچەیەدا نەش و نمای گیا و گوڵ زۆر بەهێزە و ئەفسەرەکان و سەربازەکانی ئەسکەندەریش وەکو خودی ئەو لەم خاڵە تێگەیشتوون و لە دانیشتوانی ناوچەکە بیستیان کە هەندێك لە دانەوێڵەکان لە بابل ساڵێ دوو جار دەچێنرێ و بەرهەمی لێ هەڵدەگیرێتەوە و هەر دوو جار بەری فراوان دەدات.

باخچە هەڵواسراوەکان، یان ئاسمانییەکانی بابل، لە ڕوانگەی هاوڕێیانی ئەسکەندەر، لە ئەهرامی میسر، سەرسوڕهێنەرتر و سەرنج ڕاکێشتر هاتە بەرچاو و ووتیان: ئەگەر ئێمە بەحاڵی خۆمان بهێڵن، ئامادەین کە پاشماوەی تەمەنمان هەر لێرەدا بەسەر بەرین و هەر لەم ناوچەیەش بمرین.

بە جۆرێك وا وترا لە شەڕی ئیسیۆس، (ڕووباری ئیسیۆس کە ئەمڕۆ لە تورکیا بەڕوباری سیهان ناو دەبرێت)، دایك و خێزانی داریووشی سێهەم بەدیل گیران و خێزانی داریووش سك پڕ بوو و پێش ئەوە کە ئەسکەندەر بچێتە ناو بابل، ژنی ناوبراو، بەهۆی دووگیانی نائاسایی ژیانی لە دەست دا ووتی

کاتێ کە هەواڵی مەرگی ژنەکەی داریووشی سێهەمیان بە ئەسکەندەر ڕاگەیاند، فەرمانی دا کە مەیتەکەی بە مەراسیمێکی ڕەسمی بە خاك بسپێرن و لە سەر مەیتەکە، ئاڵای ئێران دابنێن.

لە رۆژی مەراسیمی ناشتن، ئەسکەندەر، یەك پارچە قوماشی رەشی خستە سەر کڵاو و ماسکی درەوشانی خۆی و ، شمشێری لە کەلان دەرهێنابوو و نوکی شمشێرەکە بەرەو زەوی بوو، پیادە تا گۆڕستان بە دواوەی مەیتەکەدا رۆیشت.

لەوێدا پێیان ووت  کە ژنەکەی داریووشی سێهەم، چونکە خاوەنی ئایینی ئێرانییە،(زەردەشتی بوو) بە شێوەی رەسمی ئێرانییەکان بە خاکی دەسپێرن و ئیدی هەبوونی ئەسکەندەر پێویست نییە و دەبێ بگەڕێتەوە. ئەسکەندەر گەڕایەوە و کە بینای هەڵبەستی بەشکۆوە گرتە ئەستۆی خۆی.

لە بابل، ئەسکەندەر کە ئەیویست بەخێرایی بە دواوەی داریووشدا بڕوا، چ شتێکی زیادەی هەبوو ، بە جێی هێشت.

ژنان و هونەرمەندانی یۆنانی کە لە ڕێدا بۆ سوپای ئەسکەندەر ئەنجام ئەدا، لە بابل مانەوە. هەر وەها تەواوی دروشمەکانی شەڕی کە بە دەستی ئەسکەندەر کەوت، لە بابل بە ئەمانەت دانرا، تا ئەو کاتەی کە ئەو دەگەڕێتەوە و ووتی  ئەگەر من کوژرام ، کەسانێ کە لە باتی من فەرماندەیی سوپا دەگرنە ئەستۆ، بە شێوەیەك کە خۆی پێی خۆش بێت" وا دەکات.

تەنانەت لە بابلیش ئەسکەندەر لە گەڵ سەربازەکانیدا وت و وێژی دەکرد و لە گەڵیاندا خواردنی دەخوارد و سەردارەکانی وەکو پێشو هەر بە ناوی ئەسکەندەر بانگیان لێ دەکرد و گرەوی یاری شمشێر بازی لە گەڵ دەکرد ئەگەر بیرۆڕایانەیە پارەکەیان لێ دەسەند.

لەو رۆژانەدا کە ئەسکەندەر لە بابل بوو، رۆژانە لە رووباری دجلە حەمامی دەکرد و شەوانە لە یەکێك لە باخچە هەڵواسراوەکان (ئەو

باخانەی کە بائاسمانەوە بوون) بابل دادەنیشت و هەندێك لە ئەستێرە ناسانی بابلی لە دەوروبەری خۆی کۆ دەکردەوە و لە گەڵ ئەواندا لە بارەی ئەستێرەکان باسی دەکرد و بنەمای ئەستێرەکانی لەوان دەپرسی و بە تایبەتی چاکی ئەوانە و ئەوەی کە لە چارەنووسی بەشەر چ کاریٚ دەکەن، لێکدانەوەی دەویست.

لە دواییدا ئەسکەندەر کارەکانی خۆی لە بابل تەواو کرد و دەیویست کە لەویٚ بڕوا و بەدوای داریووشی سێهەمدا بگەڕێت. ماوەیەك لە بابل دوور کەوتەوە،ئەو کار بە دەستەی کە بۆ شۆشی ناردبوو ، لە ڕێگا بینی.

کاربەدەستی ناوبراو لە سەر ئەسپێکی بەهێز بەڕێوە بوو و کاتیٚ گەیشتە ئەسکەندەر، رای گەیاند کە شوش بیٚ بەرگرییە و لەوێدا خەزێنەیەکی گەورە هەیە و ئەوانەی کە خەزێنەکەیان لە دەستی دایە، چونکە دەیانزانی ئەسکەندەر نزیکە زاتیان نەبوو کە ئەوانە بەرن.

کاتێك مەقدوونیەکان گەیشتنە شووش، بە سەرسوڕمایی بینیان کە ئەو شارە هاوشێوەی بیناکانی بەناوبانگی "ئاکرۆپۆلیس"ە کە لە شاری "ئاتینا" دروست بووە و هەروەها بیستوویانە کە لە وەرزی هاویندا، داریووشی سێهەم لەو شارەدا دەیگوزەراند و کاتی زستان کە هەوا لە شووش سارد دەبوو، دەگوازرایەوە بۆ بابل.

لە شاری شووش کە دەست کەوتێکی گەورە بە نەسیبی مەقدوونیەکان بوو، یەکەم خەزێنەی ئەو شارە، پەنجا هەزار کوپەی زێڕ، واتە بەرامبەر بە بەرهەمی کانزا بەهادارەکانی مەقدوونییەی بە درێژایی پەنجا ساڵی لەخۆ دەگرت.

دووەم: پەیکەرەکانی یۆنانی کە تەقریبەن هی دوو سەدە پێش ئێستایە لە پاشاکانی هەخامەنشی، لە شەڕ لە گەڵ یۆنانییەکاندا لە شاری

"ئاتینا" بۆ ئێران یان هێنابوو ئەسکەندەر ئەو پەیکەرانەی بۆ "ئاتینا" ناردەوە.

مەقدوونییەکان وا خورافە پەرست بوون، دۆزینەوەی ئەو پەیکەرانەیان لەویّ و گەڕانەوەیان بۆ یۆنان بەشتێکی باش دەزانی.

کاتیّ ئەسکەندەر و سەربازەکانی گەیشتنە شووش (شووش، ناوچەیەك بووە لە باکووری ئەهوازی ئێستا)، شارە زۆر گەرم بوو و مەقدوونیەکان لە ترسی خۆر نەیان دەویّرا لە مالّ بێنە دەرەوە، چونکە دەترسان وەکو کەباب ببرژێن.

هەندێك لە نووسەرانی مەقدوّنی کە لە گەلّ ئەسکەندەردا بوون. لە بارەی گەرمای شووش لە هاوینی ئەوسالّەدا هەندیّ شتیان نووسیوە کە گوایا موبالەغەی تێدایە. چونکە ئەم ناوچەیە لە باکووری ئەهوازی ئێستایە و هەرچەندە هەوا لەویّ گەرم دەبیّ، بەلاّم بەوجۆرە نییە کە مەقدوونیەکان لە کتێبەکانی خۆیاندا باسیان کردووە.

بۆ نموونە نووسیویانە (مارمێلکەکان) [1] کاتیّ دەیانەویست لە سەر جادە بەرد کراوەکانەوە تێپەڕ بن، دەبوون بە کەباب و ئێمەش هەموو خواردنەکانی خۆمان بە بیّ ئاگر دروست دەکرد بەجۆرێك کە تەنیا گۆشتەکە بکەینە ناو قاپێك و لە بەر خۆر رایبگرین" تا ئەوەی کە ببێت بە کەباب.

ئەو جۆرە نووسینانە نیشاندەری ئەوەن کە سەفەر کەرەکانی ناوبراو، وەکو هەندێك لە گەریەکانی ئەو سەردەمە دەیانەویست هەواڵگەلێك لە سەفەرنامەکانی خۆیاندا تۆمار بکەن کە خەڵك سەریان سوڕ بمێنێت.

---

(١)

ئیمپراتۆریـــەتی ئێــران خــاوەنی چــوار پایەتــەخت بــوو لــە قۆنـاخی جیاجیادا کە کۆنترینیان (سوزا)، یان (شووش) بوو کە لە "خوزستان"ی ئەمڕۆدا یە.

"شــووش" لــە قۆناغــە کۆنەکانــدا، واتــە لــە قۆناخــەکانی بــەر لــە هەخامەنشییەکان بە دەستی سوڵتانەکانی "ئیلام" دروست کراوە و دوای ئـەوەی کـە هەخامەنـشییەکان هاتنـە سـەر دەسـەڵات، ئـەو پایەتەختـەیان پاراسـت. پایەتـەختی دووەم "هـك ماتانـا" هەمـەدانی ئەمڕۆکـە بـوو کـە ســـوڵتانەکانی مـــاد دروســـتیان کـــرد و ئـــەو پایەتەختـــەش دوای هەخامەنشییەکان هەر پارێزرا.

بابــل بــە پایەتــەختی ســێهەم دەناســرا کــە دوای چــوونی هێــزی سوڵتانەکانی "ئاسوور" یان "ئاشوور" لە میزۆپۆتامیا پێك هات.

سـوڵتانەکانی بـەدەر لـە ئەسـکەندەر, ئـەو سـێ پایەتەختـەیان پێـك هێناوە.

تەنیا یەك پایەتەخت لە لایەن خودی سوڵتانەکانی ئێرانی دروست کرا و بە نـاوی "ئێرانـشار"، بە زمـانی یۆنانییـەکان "پێرس پـۆلیس" ناویـان دەبرد. ئەو پایەتەختە لە ناو فەلاتی ئێران، لە ناوچەیەکدا دروست بوو کە ئاو و هەوایەکی خۆشی هەبوو، جگە لەوەی کە ناوەندی ئیمپراتۆریەتێکی ئێرانی بوو، بە ناوەندی رۆحانیش دەناسرا.

سوڵتانەکانی ئێران، پایەتەختە کۆنەکانیان لە بەر ئەوە دەپاراست و بە لانـی کەمـەوە یـەك سـاڵ جارێـك دەچـوونە ئـەو پایەتەختانـە بـۆ ئـەوەی ئیمپراتۆریەتی خۆیان بەڕێوە ببەن و بە کاروباری خەڵك رابگـەن. شێوازی ژیانی کۆمەڵایەتی ئێرانییەکان، لە سەر بنەمای ئاییني دێرینیـان و داب و نـەریتی کۆنیـان، بـە جۆرێـك بـوو کـە نـاکۆکی لـە نێـو خەڵکـدا کـەمتر

دەردەکەوت و ناکۆکییەکان زۆرتر لە سەر میرات بوو و سوڵتانەکانی ئێران ناچار نەدەبوون کە کاتی خۆیان بە چارەسەر کردنی ناکۆکییەکانی خەڵك بەسەر بەرن و زۆربەی کات خەریکی پێ ڕاگەیشتن بە ئاوەدانی وڵات بوون.

مەقدوونییەکان ، بابلیان وەك شارێکی بێ پاراستن بینی. کاتێك گەیشتنە شووش، بینیان کە ئەوێش بێ پاراستنە، چونکە داریووش دەرفەتی ئەوەی نەبوو کە لە شووش سوپایەکی تازە بۆ بەرگری لە ئەسکەندەر پێك بێنێت" ئەوە بوو کە ڕێگای ڕۆژهەڵاتی، (ناوخۆی ئێران)ی گرتە بەر.

ئەسکەندەریش لە شووشدا زیاتر لە چوار ڕۆژ نەمایەوە چونکە، هەر وەکو باس دەکرا ئەو دەیزانی هەرکات داریووش دەرفەتی هەبێ لە سوپایەکی نوێ، لە ناو خۆی ئێراندا پێك بێنێت لە ناوچوونی مەقدوونیەکان حاشا هەڵنەگرە. کاتێك مەقدوونیەکان بە هاوڕێیی ئەسکەندەر کەوتنە ناوخۆی خاکی ئێران، لە فراوانی باخەکان و مەزراکان لەم لا و لەولای جادە سەریان سوڕما.

ئەوان دەیانزانی هاتوونەتە وڵاتێك کە لە ساڵدا، جگە لە زستان و بەهار، بارانی تێدا نابارێ، پێیان سەیر بوو کە لەو وڵاتە وشکەدا، ئەو هەموو باخ و مەزرایە لە کوێوە هاتۆتە ئاراوە و ئێرانییەکان چۆن، زەوی و زارەکانیان بێ کەڵك وەرگرتن لە باران ئاودێری دەکەن" لە کاتێکدا کە ڕووبار و ڕووبارەکانیش بە دەگمەن لە سەر ڕێ دەبینرێت.

ئەسکەندەر، لەو بارەوە لە ئەفسەرەکانی خۆی داوای ڕاپرسی کرد و ئەوان واقیان وڕما.

ئێنجا لەخودی دانیشتوانی ناوچەکە راپرسیان کرد و دەرکەوت کە فراوانی زەوی و زار و باخ لەخاکی ئێراندا بەهۆی دوو شتەوە، یەکەم ئەوەی کە بڕوای ئایینی ئێرانییەکان هانیان دەدات کە زەوی ئاوەدان بکەنەوە و لە رەحمەتێك کە خواوەند بەوانی داوە کەڵك وەرگرن و کەڵك وەرنەگرتن لەو داهاتانە لە ڕوانگەی ئێرانییەکانەوە، ناسوپاسی بەرەکەتەکان لە قەڵەم دەدرا.

ئەو داهاتانەی کە خواوەند بە نەوعی بەشەری داوە، بە بیر و ڕای ئێرانییەکان بریتییە لە زەوی و ئەسپ و هەتاو و هەوا؛ بنەماکانی خاوێنی سرووشتین و هەرکەس لە دەورەی تەمەنیدا دەبیٚ لەم داهاتانە کەڵك وەربگرێت، تا ئەوەی کە خۆی بەختەوەر بکات و ببێتە هۆی بەختەوەری بەجێ ماوەکانیان.

لەم رووەوە هەرکەس لە دەورەی ژیانیدا، ئەرکی خۆی دەزانێت کە پارچە زەوییەك دەچێنێت و لەوێدا، درەختەکانی بەرهەم هێنەر بکێڵێت" یان ئەوەی کە مەزرایەك بۆ کشت و کاڵی بەرهەمەکانی باش ئاوەدان بکاتەوە. بابەتی دابین کردنی ئاویش بۆ ئێرانییەکان بە کارێز چارەسەر کراوە و کارێز ئاوێکە کە لە کەناڵێکی ژێر زەمینییەوە تێپەڕ دەبێت و وردە وردە دێتە سەرەوە تا دەگاتە ئاستی زەوی.

سەرچاوەی یەکەمی کارێز، لە دۆڵی چیاکان یان گردە بەرزەکان چونکە چیاکان و گردە بەرزەکان بە پێی بەرزاییەك کە هەیانە، زیاتر بەفر و باران بە خۆوە دەگرن و ئاویش لە چینەکانی ژێرینی زەوی لە وەر دەگرن و ئێرانیەکان خاوەنی کارناس گەلێکن کە کوڕ بەدوای باوکدا، کاریان پەیدا کردنی ئەو سەرچاوەیان ژێرزەمینیانەیە و هەر ئەوەی کە یەك سەرچاوەیان دەدۆزییەوە، بە هەڵکەندنی چاڵەکان و گەیاندنی

چاڵەکانیش بە یەکتر، بە کەناڵێکی ژێرزەمینی، ئاویان دەگەیاندە زەوی و زار و باخاتەکان.

لەوە زیاتر، ئێرانییەکان بۆ ئاودێری زەوییەکانیان ئامێرێکی تریان هەیە کە بریتیە لە دروست کردنی بەنداو، لە بناری شاخەکاندا.

لە سەر ئەو بنەمایە کە لە هەندێك ناوچە کوێستانییەکان، بە کەڵك وەرگرتن لە بەرد و ساروج،[1] دیواری بەرز و ئەستووریان دروست دەکرد بۆ ئەوەی پێش ئاوی باران بگرن و کاتێك وەرزی بارین تەواو بوو. زرێوارێکی دەستکرد پێك دەهات کە بەشێکی زۆری ئاو تێدا کۆ بۆتەوە. هەندێك لەو زرێوارانە ئەوەندە بەرین و فراوانە کە تا کۆتایی هاوین توانای ئاودێری هەموو باخ و زەوی و زارەکانی ئاواییەکی هەبوو.

***

---

[1] ساروج، بەردێکە کە دێرینیەکان بەجوار مادەی تێکەڵاو دروستیان دەکرد کە بریتیە لە: هێلکەی خاو، ناو، قسڵ و خۆڵی سپی کە زۆر سەختە و بە کوتك و شتی و ناشکێت؛ مەگەر بە تیزابی سۆلفۆریکی ۹۸٪ - کا پاشاکان جەواهیراتیان تێدەنا و دەیانشاردەوە.

# "شەڕ لە کێوی ئۆڵەمپ"

کاتێک کە ئەسکەندەر و سەربازانی بەرەو رۆژهەلات دەڕۆیشتن، گەیشتنە ناوچەی خێڵی "خوزا" ئەو خێڵانە لە گۆڕانکارییە سیاسییەکانی جیهان ناگا بوون و نەیاندەزانی کە داریوشی سێهەم پاشەکشەی کردوە و کاتێک بینیان ئەسکەندەر و سەربازانی دەیانەوێت لە ناوچەی ئەوانەوە تێپەڕ بن، پەیامێکیان بۆ ئەسکەندەر نارد کە ئێوە دەبێ هەر وەک جاران گومرگی خۆتان بدەن.

ئەسکەندەر پرسیاری کرد: ئەو برە پارەیە لە سەر ناوی چی دەبێت بدرێت؟

نوێنەرانی خێڵ وتیان: لێرە رەسم وایە کە هەر "گەورە پیاوێک" لەو ناوچەیەوە تێپەڕ دەبێ برێک پارە وەکو گومرگ پێشکەشی ئێمە بکات. تەنانەت خودی پاشای گەورەی ئێران کاتێک لێرەوە تێدەپەڕێت بەرەو "شووش" یان لەوێوە دەگەڕێتەوە لە دانی ئەو برە سەرپێچی ناکات.

ئەسکەندەر وتی: بەگەورەکانی خۆتان بڵێن کە بێن و حەقی رێگاکە وەرگرن.

گەورە پیاوانی خێڵ لە کەژەکانی دەوروبەر بوون و لە گەڵ مەڕ و مالاتیان لە بەرزایی کێو ژیانیان دەگوزەراند و بە گشتی بژێوی خێڵی "خوزا" لە ڕێی ئاژەڵدارییەوە دابین دەبوو.

لە هەمان شەودا ئەسکەندەر فەرمانی دا بە تاقمێك لە سوپاکەی کە وەڕێ کەون و کێوەکە ئابلۆقە بدەنو لە گەڵ هەڵاتنی خۆری بەرەبەیان تاقمێکی تریش لە سوپاکەی، چەند ئاواییەکیان کە لە بناری کێوەکەوە دەبینران داگیر کرد.

بە جۆرێك، کاتێك کە گەورەکانی خێڵ هاتن بۆ وەرگرتنی باجەکە، بینیان کە ئابلۆقە دراون.

"ئاریان" یەکێك لە هاوڕێکانی ئەسکەندەر لە کتێبەکەی دا دەنووسێت لەو کاتەدا (ترسێکی گەورە کەوتە نێو گەورەکانی خێڵ، بەڵام خوێن ڕێژی لێنەکەوتەوە)، چونکە دایکی داریوش کە بە پێچەوانەی ژنانی تر (کە ووتمان لەبابل مانەوە) لە گەڵ ئەسکەندەر دەربازی خاکی ئێران بوو، نێوانگیری کرد و ووتی : ئەو خێڵانە کە تەنیا مەڕ و بزنیان هەیە، هیچ داهاتێکیان نییە و تاکە داهاتیان ئەو بڕە کەمەیە کە لە گەورە پیاوانی وەردەگرن.

زیاتر لەمەش ئەد خێڵەڵانە هەر ساڵ وەکو باج دان برێك ئەسپ و مەڕ دەدەن بە پاشاکان.

دایکی داریووش ووتی : یەك سەد ئەسپ و پێنج سەد گا و سێ هەزار مەڕ، باجی ساڵێکی کۆمەڵی خێڵانی ئەم ناوچەیەیە و چونکە پارەیان نییە، ئەمانە، وەکو کاڵا دەدەن.

هەندێ لە ساڵانیش کە ئافەتێك لە نێو مەڕ و ماڵات دەردەکەوێ، پاشای ئێران، لە دانی ئەو باجە خۆش دەبێت و پارەیەك کە ئەوانە لە گەورەکانی وەردەگرن لە ڕاستیدا پاداشت و دیارییەکە کە گەورەکان پێیان دەدەن و وەك هەڕەشەیەك نییە.

شیکارییەکانی دایکی داریووش کاری لە ئەسکەندەر کرد و ئەویش کە ڕێزێکی تایبەتی هەبوو بۆ دایکی داریووش و دەیگوت: سەرەڕای ئەوەی کە من بەبێ وەرگێڕێك لە زمانی ئەو ژنە تێناگەم هەست بەوە دەکەم کە ژنێکی پایەبەرزە.

لەو کاتەدا ئەسکەندەر برێکی وەکو پاداشت دا بە گەورەکانی خێڵات و ڕۆیشتن. بە پێی نووسینی ئاریان ئێنجا گەورەکانی خێڵ بە وەرگرتنی ئەو دیارییە لە ئەسکەندەر، خۆشحاڵ بوون.

ئەسکەندەر لەم شوێنەدا، زانی کە لە دوو ڕێوە دەبێ بەرەو ئێرانشار (بە وتەی یۆنانییەکان پێرس پۆلیس) بڕوات"

یەکێ لە ڕێگای جادەی بەرین وە ئەوی تر لە یەك ڕێگای کوێستانییەوە و لە بە شێوەیەك ئەگەر لەمەیانەوە بڕۆن، ڕێگاکە کەم دەبێتەوە و ئەو ئومێدەوار دەبێت کە بگاتە داریووشی سێهەم. ڕێگای ئەڕابەڕۆ چەند سودێکی هەبوو، کە بریتی بوو لەوەی کە: سێ ئەڕابە دەیتوانی لە لای یەکەوە لەو ڕێگایەوە تێپەڕ بن. لە هەموو شوێنێك ئاو و خوراك پەیدا دەبوو" چونکە جادە لە ناوەڕاستی باخەکان و مەزراکان و لە هەندێك لە ناوچەکان، لە ناوەڕاستی دارستانەکاندا تێپەڕ دەبوو.

بەڵام ئەم جادەیە بۆ ئەوەی کە لە کەناری شارە ئاوەدانەکانی باشووری ئێران تێپەڕ ببێت، بە شێوەی مارپێچ دەگەیشتنە ئێرانشار. ڕێگای کوێستانی، ئەم قازانجانەی نەبوو و لەوانەیە کە لە چیادا تووشی کەم ئاوی بین، بەڵام لەو ڕێگایەوە زووتر دەگەیشتنە ئێرانشار.

ئەسکەندەر دوای پرس و ڕا لە گەڵ ئەفسەرەکانیا، بەشێك لە هێزەکانی خۆی لە کاروانەڕێوە بەرە و ئێرانشار نارد کە تێکەڵ بوو لە ئەڕابە جەنگییەکان و بەردهاوێژەکان و هەندێك لە سەربازەکان، هەندێك لە

سەربازە دلێر و بەتاقەتەکانی خۆی هەڵگرت و لە ڕێگای کوێستانەوە کەوتە ڕێ.

جادەیەك وا ئەسکەندەر گرتیە بەر لە لای دۆڵێکەوە تێپەڕ دەبوو و کوێرەڕێیەك بوو کە جارجار لە قووڵایی دۆڵەکەوە دەرباز دەبوو و هەندێك جار دەگەیشتە لووتکەی چیا بەرزەکان. یەکەم ڕۆژ ڕووداوێکی شایانی باس رووی نەدا جگە لەوە کە سەربازەکانی مقدوونی لە سەرەوەی خۆیان، برێك مەڕە کێویان بینی و ویستیان راویان بکەن" بەڵام ئەسکەندەر نەیهێشت و ووتی: راوی گیاندا کێوی هۆی دواکەوتنی ڕۆیشتنە.

سەربازەکان لە بینینی مەڕەکان زۆر سەریان سوڕمابوو، بە جۆرێك لە دوایی وا بیریان دەکردەوە کە مەڕەکان ماڵین. چونکە هەموو شتێکی ئەوان هاوشێوەی مەڕی ماڵی بوو. لە بەر خۆیانەوە دەیانووت چۆن لە سرووشتدا مەڕی بەو شێوەیە پەیدا دەبن" بێ گومان، مەڕە ماڵییەکان لە ڕەگەزی ئەم گیانەوەرانەن. وە لەوانەیە، مەڕەکانی ئورووپا لە ئێرانەوە بۆ ئەوێ براین. چونکە لە چیاکانی یۆنان، مەڕی کێوی نییە. تا بوترێت کە مەڕ ئاژەڵێکی ماڵیی یۆنانە.

سەربازەکان پەشۆکا بوون کە مەڕە کێویەکان چۆن خۆیان بە سەر تەختە بەردەکانی لێژ و سافەکانەوە رادەگرن و ناخلیسکێن و ناکەونە نێو دۆڵەکان؟ سەرسوڕمانی دیکەیان لەوەدا بوو کە لە سەر چیاکان ئاو نییە، چۆن تینوویيان دەشکێنن؟ تا ئەوەی کە چاوەکانیان، لووتکە بەرزەکانیان بینی کە بە بەفر داپۆشرابوو و زانایانی سوپا ووتیان ئەم بەفرە بە هۆی گەرمای هەتاوەوە دەتوێتەوە و لەو سەرەوە جۆگە بچوکی ئاو، خوڕەی دەهات و دەهاتە خوارەوە و مەڕە کێوییەکان لەو جۆگانە، تینوویتیان

دەشکێنن و خۆراکی ئەوانە چەکەرەکانە کە لە درزی بەردەکاندا شین دەبن.

سەربازانی مەقدوونی کە لە دەشتە گەورە سووتێنەرەکانی خوزستان چوونە دەرەوە، لە کاتی رێپێوان لە ناو دۆڵەکاندا، چێژی زۆریان وەردەگرت و هەوای فێنك لە ڕوومەتیانی دەدا و ئەسکەندەر کاتی نیوەڕۆان بۆ ماوەی دوو کاتژمێر، کاتی دەدانێ بۆ پشوودان و دوایی وەڕێ دەکەوتنەوە. چونکە لە ناوچەی کوێستانی تێپەڕ دەبوون، بە هۆی فێنکی هەوا لە ڕێپێوان ئازاریان نەدەبینی. جارجارێ یەکێ لە سەربازەکانی مەقدوونی بە یادی نیشتمان، گۆرانییەکی دەست پێدەکرد و وەها دەیخوێند:

"ئاتینا بە زوڵفە زێڕینەکانیەوە، قاپێك پڕ لە شیری گرتۆتە دەست و قەراخێ دەریا چاوەڕێی گەڕانەوەی خۆشەویستی خۆیەتی و بە ئاتینا بڵێن دەست بەر بدات لە گریان، چونکە ئیدی خۆشەویستی خۆی نابینێت"

ئەم گۆرانیە یۆنانییە وەها لە دڵی سەربازەکاندا کاریگەری دەکرد کە هەندێ لە چاوەکان فرمێسکاوی دەبوون بە یادی وڵاتەکەیان و ئەو کچەجوانانەی کە دوور لە خۆیان بە جێ هێشتبوون. لە ناو سەربازەکانی سوپا کەمتر کەسێ بوو کە ئومێدی هەبێت جارێکی تر یۆنان ببینێت. چونکە دەیانزانی کە رێپێوانی ئەسکەندەر لە درێژایی رۆژهەڵات کۆتایی پێ نایێت و لەوانەیە ئەوەندە سەفەر درێژە پێ بدرێت تا بگەینە سەرچاوەی خۆر.

لە رۆژی سێهەمدا ماوەیەك دوای خۆر ئاوابوون، سەربازەکان کەوتنە رێ و بینیان کە کوێرەڕێیەکە بەرەو سەرەوە دەڕوات و دۆڵەکە تەسك

دەبێـت. هەرچـی دەچـوونە سـەرەوە، زەمینـە کوێـستانییەکان سـەخ تـر دەبوون و سێبەری کێوەکان نەدەما و لە پڕێکدا لە ملەی چیاکەوە تیرباران کران و هەندێك لە سەربازەکان پێکران.

ئەسکەندەر کە هەر ئەسپەکەی خۆی بە دەسـتەوە گرتبوو، سـەرنجی دا کە لە سەرەوەی ستون کارەساتێك رووی داوە و هەر کە زانی لە سەرەوەی ملـەی چیاکەشـدا رێگـا بەسـراوە و هەنـدێك لـە سـەربازەکان کـوژراون، یـا برینـدار بوونـە، فـەرمانی دا کـە شـەیپوری گەڕانـەوە لـیٚ بـدەن و ئـەو سەربازانەی کـە رۆیـشتبوونە سـەرەوە، کوژراوەکـان و برینـدارەکانیان لـە گەڵ خۆیاندا هێنایەوە.

تیربارانەکەی سەر سەربازانی مەقدوونی سەلماندبووی کە ژمارەی ئەو کەسانە کە رێگەیان گرتووە، زۆرن.

ئەسکەندەر ووتی  بڕۆن و هەندێك لە تیرەکان بێنن، سـەربازەکان چەند تیریـان هێنـا و ئەسـکەندەر نـوك و چێوی تیرەکـانی سـەیر کـرد و ووتـی بـاوەڕ ناکرێـت کە ئـەم تیرانـە لـە کەمانی سـەربازەکانی داریووشـی سێهەم دەرچوو بێـت. چـون تـیرە دوو لەتییـەکان دروشمـی تایبـەتیان پێوەیـە کـە دەتوانرێت ئەوانە بناسرێتەوە و لەوانەیە کەسانیٚ وا رێیان لە ئێمە گرتبیٚ کە، بەشێك لە خێڵەکانی ئەم نیشتمانەن.

بڕۆن و پێیان بڵێن چییان دەوێت و ئەگەر داوای باجی رێگاکە دەکەن، ئامـادەین باجیـان پـیٚ بـدەین" بـە مـەرجێك کـە ئاسـتەنگیمان بـۆ دروسـت نەکەن و رێگامان پیٚ بدەن.

یـەکیٚ لـە رێناسـەکان کـە ئەسـکەندەر لـە گـەڵ خـۆی هێنـابووی، چـووە پێشەوە و هاواری کرد هۆ هۆ هۆ...

دەنگی ئەو لە ناو کێوەکان گەڕا و دوای ئەوەی کە گەڕانەوەی دەنگەکە تەواو بوو، قایم ووتی  پیاوێکی گەورە کە منی ناردووە بۆ ئێرە دەڵێت: کە ئێوە کێن و لە ئێمە چیتان دەوێ و ئەگەر داوای باجی ڕێگاکە دەکەن، ئەو ئامادەیە کە باج بدا و بەلام دەرباز ببێت.

پیاوی چەکدار (بەتیروکەوان) کە کلاوخودی لە سەر بوو، لە پشت بەردێکەوە سەری هێنا دەرەوە و ووتی  ئێمە کە باجی ڕێمان لە کەسێك ناوێت و تەنیا ئەڵێین هەر لەو ڕێگایەوە کە هاتوونە، بگەڕێنەوە و بچنە شوێن کاری خۆتان.

دوایی ڕێناس ووتی: ئێوە کێن و بۆچی ڕێتان لە ئێمە گرتووە؟

ئەو پیاوە ووتی  ئێمە نیشتەجێی ئەم ناوچەیەین و ئێرە شوێنی ئێمەیە و حەزمان لێ نییە کە بێگانە هەنگاو بنێتە جێی ژیانی ئێمە.

ئەو وەلامانە کە ڕێناس لەو پیاوە بیستبووی بەئەسکەندەر رای گەیاند و ئەسکەندەر ووتی  بڕۆن و پێی بڵێن کە بۆ خێڵەکەیان زەحمەتی دروست نەکەن" چونکە ئەگەر ڕێمان پێ بدەن و ئێمە لێرە تێپەڕ بین، کارمان بەکەس نییە و بەلام ئەگەر بەرمان بگرن، ناچارین بەشەڕ لێرە تێپەڕین.

ئەو پیاوە لە وەلامی ڕێناس دا ووتی  ئێمە لە هەڕەشە ناترسین وناهێڵین کە بێگانە بێتە ناو نیشتمانمانەوە. ئایا ئەگەر بێگانە هەنگاو بنێتە ناو نیشتمانی ئێوە، ڕێگای پێ دەدەن؟

ئەسکەندەر لە ملەی کێوەکە گەڕایەوە و لە گەڵ سوپاکەیدا لە ناو دۆڵەکەدا سەقامگیر بوو و راوەستانیان لەو دۆڵە مەترسیدار بوو. دوای ماوەیەکی کورت پاشەکشەی کرد و گەیشتە شوێنێك کە دۆڵەکە پەرەی دەگرت و بەرزایی کێوەکان لەم لاو و لەولاوە کەم دەبوو.

لەوێدا ئەسکەندەر ووتی ئێمە ناتوانین لەم شوێنەوە دەرباز بین، دەبوایە بۆ کردنەوەی ڕێ، هێزەکانی خۆمان کردبا بەدوو بەش و یەکێ لە ئەفسەرەکانی خۆی بەناوی "کراتروس" ی بانگ کرد و پێی ووت من فەرماندەیی بەشێك لە سەربازەکان کە لێرە رادەوەستن، بەتۆ دەسپێرم و خۆم لە گەڵ هێزێکی تر دەوری ئەم کێوە دەدەینەوە بەجۆرێك کە بتوانم لە پشت ملەی چیاکەوە لێیان دەرکەوم. تۆش دەبێ ئاگات لێ بێ لە گەڵ ئەوەی کە ئێمە لەپێشەوە دەستمان بەهێرش کرد، تۆش لێرەوە بکەویتە ڕێ و هێرش بکەی، بۆ ئەوەی کە هێرشەکانمان لە یەك کاتدا بێت. پێشەنگی سوپاکەت دەبێ لە رەوشی ملەی چیاکە ئاگادار بێت.

"کراتروس" هەمیشە جل و بەرگی جوانی لە بەر دەکرد و کڵاوخودەکەی هەمیشە دەدرەوشایەوە، چونکە هەر شەو پاکی دەکردەوە.

ئەسکەندەر قژێکی کورتی هەبوو. بە جۆرێ کە قژی نەدەگەیشتە سەر شانی. بەڵام کارتروس قژی درێژ بوو و بە پێی جوانی بازو و سینگی، کاتێ کڵاوخودی لە سەر نەبوو، جل و بەرگێکی هەڵدەبژارد کە سینگ و بازووی نیشان بدات و سەربازەکان و هەندێك لە کاربەدەستان، ئەویان تاوانبار دەکرد کە مەبەستی ئەوەیە خۆشەویستەکەی ئەسکەندەر بۆ لای خۆ راکێشێت و دەیانزانی کە ئەسکەندەر چەندی خۆش دەوێت و پێوەی گرێدراوە، بەڵام لە دڵێری ئەو گومانیان نەبوو.

ئەسکەندەر لە گەڵ هێزێکدا کە خۆی هەڵیگرتبوو، بەشەو لە کێوەکە دەرباز بوو سەربازەکانی خۆی ناچار کرد کە بە خێرایی بڕۆن و دەوری کێوەکە بدەن و چونکە پێشبینیان کرد کە لە سەر ڕێگەکەیاندا رووبارێك هەیە، ئەسکەندەر هەندێك لە ئەندازیارانی سوپای لە گەڵ خۆیدا برد. هێشتا نیوەشەو نەببوو کە گەیشتنە رووبارەکە و بینیان کە ئاوی زۆری

هەیە و ناتوانرێت لەوێ تێپەڕ بێت و ئەسکەندەری دوا خست. بەهەرحاڵ لە کاتی خۆر ئاوابووندا، دەوری کێوەکەیان داو و لە بەرامبەر ملەکەوە سەریان هێنا دەرەوە.

سەربازانی ئەسکەندەر بە درێژایی شەو بەهۆی ڕێپێوانەوە ماندوو بوون و ئارەزووی پشودانیان هەبوو، بەڵام ئەسکەندەر ووتی "ئەگەر بخەون، دەرفەت لە دەست دەچێت". فەرمانی دا کە دەنگی شەیپور و کەڕنا لێ بدەن سەربازانی کراتروسیش لە ناو ملەی چیاکەوە دەست بە هێرش بکەن.

ئەو خێڵانە وا ڕێگای ملەی چیاکەیان لە سەربازانی ئەسکەندەر بەستبوو، کاتێ کە بینیان لە دوو لاوە کەوتوونەتە بەر هێرش، ناچار مان سەنگەرەکانیان چۆڵ بکەن و "ئاریان" کە دەوترا لە هاوڕێیانی ئەسکەندەر بوو ئاوای نووسیوە : هێشتا خۆر بەباشی دەرنەکەوتبوو کە شەڕ دەستی پێکرد. ئەسکەندەر لە گەڵ یەکەی "ڤالانژ" لە پێشەوە (لە رۆژهەڵاتەوە) دەهات و کراتروس بە دوو یەکەی "ڤالانژ" و پاشماوەی سەربازان لە دواوە (لە رۆژئاواوە بەرەو رۆژهەڵات دەستیان بە هێرش کرد).

بە پێی ڕەوشی ناوچە کوێستانییەکان، ، یەکەکانی ڤالانژ کە نەیان دەتوانی شێوەی خۆیان بە تەواوی بپارێزن، لەم رووەوە تێدەکۆشان کە تا ئەو جێ یە کە بۆیان دەکرێ، چوارگۆشەکە بپارێزن.

خێڵەکان ئەگەر لانی کەم پێش بینیان بکردایە و بەڕادەی پێویست تەختە بەردیان کۆ کردایەتەوە و بە سەر ئێمەدا بیانڕشتایە" دەیانتوانی زەرەرێکی زۆرمان لێدەن. بە هۆی نائاگاییان لە تاکتیکی سەربازی، یان بە هۆی ئەوەی کە ئامێری کێو هەڵکەندنیان نەبوو، نەیانتوانی کە تەختە

بەردە گەورەکانی کێو، بە سەرماندا ببارێنن. لە ناوەڕاستی شەڕدا، کوت و پڕ تاقمێك مەڕی کێوی رایان کردە ناوەڕاستی گۆڕەپانی ململانێ و ئەوانە مەڕانێك بوون کە شەوی پێشوو بە هۆی جوڵەی بازنەی ئەسکەندەرەوە سڵیان کردبوو چونکە لە رۆژهەڵات و رۆژئاواوە رێی راکردنیان نەبوو، ناچار بوون کە پانایی گۆڕەپانی شەڕ لە درێژایی باکوور و باشوور بپێون.

شەڕێکی مەترسیدار هاتە ئاراوە و ترس لە لێدان و خواردن ئەوەندە بوو کە هەندێك لە شەڕ کەرەکان، خۆیانیان لە سەر کێوەکەوە، فڕێ دەدایە قوڵایی دەریا و هێشتا هەتاو چارەگێك لە پەڕەی ئاسمانی نەپێوابوو کە شەڕ کۆتایی پێ هات و دوو بەشەکەی سوپای ئەسکەندەر گەیشتنە یەك و تێکەڵ بوونەوە. لە بەرامبەرماندا، دەشتێکی بەرین دەبینرا کە لەوێوە گردەکان دەهاتنە بەرچاو و دوای گردەکان تا چاوبڕی دەکرد دارستان دەبینرا. ئێمە لەچەند کەس لە کەسانی خێڵ کە بەدیل گیرابوون، پرسیارمان کرد ئەوێ کوێیە؟ ئەوان بەپەنجە ئاماژەیان بەرەو رۆژهەڵات کرد و وتیان ئەوێ "ئێرانشارە کە بە هۆی بوونی دارستان نابینرێت. بەڵام کاتێ گەیشتنە داوێنی گرد، لە سەر ئەوەوە دەتوانن ئێرانشار ببینن.

دیسان "ئاریان" و هەروەها "ئەسترابون" (کە ئەویش لە گەڵ ئەسکەندەردا بوو) دەنووسێت: بە دیل گیراوانی خێڵ لە بینینی مەقدوونیەکان دەپەشۆکان و هەندێك لەوانە وتیان : کاتێ کە ئێمە ئێوەمان بینی و سەیرمان کرد کە ریش و سمێڵتان نییە و پێستی بەدەنی ئێوە سپییە و بێ مووە، وامان زانی ئێوە ژنن، سەرمان سوڕما کە ئەم ژنە چەکدارانە لە کوێوە هاتوون کە مەبەستیان دەرباز بوون لەم وڵاتەیە و تەنیا ئەو کاتەی رۆژی پێشوو نوێنەری ئێوە داوای رێگای لە ئێمە کرد بۆ دەرباز بوون، تێگەیشتین کە ئێوە پیاون، بەڵام لە ڕەگەز و نەتەوی ترن و

دۆستانی ئێمە وتیان ئەم خێڵە کەسانێکن کە پیاوەکانیان ریش و سمێڵیان نییە و لە بەرامبەردا ژنەکانیان ریش و سمێڵیان هەیە و ئێوە چۆن لە گەڵ ئەو ژنانە زەماوەند دەکەن؟

سەربازانی ئەسکەندەر دوای شەڕی گەورەی ناوبراو کە یۆنانییەکان ناویان نابوو (کێوئۆلۆمپ)" ماندوو بوون و ئەو رۆژە تا نیوەڕۆ لە بان ملەکە پشویان دا و کاتێ کە هەتاو کەمێ لە ناوەڕاستی ئاسمان تێپەڕ بوو، دیسان ئەسکەندەر فەرمانی جولەی داو بە کاربەدەستانی خۆی ووت : کاتی رێپێوان بە سەربازان بڵێن کە ئەم رێپێوانە پێویستە. چونکە داریووشی سێهەم چۆتە پێشەوە تاکو کە یەك یان چەند سوپای تر ئامادە بکات و هەرکات ئەو دەرفەت پەیدا بکات کە سوپا نوێیەکانی پێك بێنێت، یەك سەربازی یۆنانی زیندوو نامێنێت و دەبێ ئەوەندە خێرا بڕۆین کە داریووشی سێهەم دەرفەتی نوێ کردنەوەی سوپای نەبووبێ.

***

# دەشتی ئێرانشار "پێرس پۆلیس"

لە مێژووەوە ئەم راستییە سەربازییە، سەرنجی* پسپۆرانی راکێشاوە کە بەدەست هێنانی خاك لە شەڕدا، لە بواری بەدەست هێنانی سەرکەوتنەوە گرنگی نییە، بەڵکو ئەو شتەی وا گرنگی هەیە، ئەوەیە کە بتوانن سوپای بەرامبەریان لە ناو بەرن. ئێمە لە کاتی خۆماندا، هەر ئەم دواییانە، ئەم راستییەمان بە چاو بینی و سەیرمان کرد کە سوپای ئەڵمانیا لە خاکی روسیا" نزیك هەزار کیلۆمەتر، بەڵکو زیاتر، پێشکەوتووە، بەڵام نەیتوانی کە سوپای روسیا لە ناو بەرێ. لەم رووەوە ئەو پێشکەوتنە خێرایە و بەدەست هێنانی ئەو هەموو زەوی و زارە، بۆ ئەو بێ سوود بوو و لە ئەنجامدا شکستی خوارد.

ئەمرۆ لە وانەیە بەدەست هێنانی هەندێك لەو ناوچانە کە گرنگی پیشەسازی و پەیوەندی هەیە، وەکو کانزاکان و کارخانەکان و ناوەندەکانی رێگای ئاسن و بەندەرەکان بۆ سوپایەکی هێرش کەر، بە سوودی خۆی نیشان بدات (هەرچەند سوپای دوژمنی لە ناو نەبردبێت). چونکە شەڕەکانی ئەم سەدەیە، شەڕی پیشەسازییە، بەڵام لە مێژوودا وا نەبوو و سەنعەتەکان لە شەڕدا دەوریان نەبوو و بە دەست هێنانی زەوی و زار بە بێ لە ناو بردنی سوپای دوژمن بە، کارێکی بێ سوود دەژمێردرا و نەیدەتوانی چارەنووسی رەهای شەڕ دیاری بکات.

ئەسکەندەر کە لەم راستییە ئاگادار بوو، دەیزانی کە تەنیا یەك شانس هەیە بۆ سەرکەوتن و ئەوەیش ئەوەیە کە داریووشی سێهەم، بەر لەوە کە بتوانێ سوپایەکی گەورە لە رۆژهەڵاتی ئێراندا بێنێتە ئاراوە، لە ناو بەرێ.

کەسێك ناتوانێ ئێرانییەکان بەلاوازی تاوانبار بکات و بڵێت ئەم گەلە ترسی لە سێ هەزار سەربازی ئەسکەندەر هەبوو" ئەمە هەر ئەو گەلەیە کە پاشاکانی، چۆکی بەئیمپراتۆری رۆم دادا و لە دەریا تێپەڕ بوون و یۆنانیش بەو گەورەیی و هێزەیەوە لە دەستیان بەگیر هاتن.

بەڵام بایەخی گەلێك لە شەڕدا کاتێك دەردەکەوێ کە بەڕێوەبەرێکی باشی هەبووبێ و داریووشی سێهەم بەڕێوەبەرێکی باش نییە و جگە لەوەش لە مردن دەترسا.

خودی مێژوونوسانی یۆنانی شاهیدی ئەوەن کە لە ئەسکەندەر نەیدەتوانی ئێران بگرێت ئەگەر ترسنۆکی بەڕێوە بردنی خراپی داریوش نەبوایت، ئەگینا لەوانە نەبوو کە سێ هەزار سەربازی مەقدوونی و ئەیالەتی دیکەی یۆنان بتوانن ئیمپراتۆرییەکی گەورە وەکو ئێران داگیر بکەن کە لە هەر ئەیالەتێکی ئەوەوە رەنگە سوپایەکی دووسەد هەزاری پێك بهاتایە.

راستە کە داریووشی سێهەم لە دوو شەڕی ئیسیۆس و قەراخی رووباری دجلە خەیانەتی بینی، بەڵام هەر جار ئەم خەیانەتە لە لایەن سەربازانێکەوە رووی دا کە ئێرانی رەسەن نەبوون. داریووش ئەگەر پیاوێکی بەڕێوەبەر و دلێر بوایە، بە کەڵك وەرگرتن لەم دوو خیانەتە دەیتوانی بە جۆرێك هەستی وڵاتپارێزی ئەم گەلە دلێرە واتە ئێران هان بدات کە سوپای سێ هەزار کەسی ئەسکەندەر قڕ بکا.

داریووشی سێهەم لە پاشەکشەی گەورەی خۆی بە جۆرێك پەلەی کرد کە بنەمای سەرەکی بابەتەکە و هۆی پاشەکشەی لە بیر چوو و لە هیچ شوێنێکدا ئەوەندە رانەوەستان کە سوپایەك پێك بێنێت.

یەکێ لە باشترین ناوچەکان بۆ بەرگری لە هێزەکانی ئەسکەندەر جولگەی "ئێرانشار" ە. لەم دەشتە، بە هۆی فراوانی دانیشتوانی ناوچەیی و هاوردە، داریووشی سێهەم دەیتوانی سوپایەك لە سوار و پیادە بێنێتە ئاراوە و ئەسکەندەر و سەربازەکانی لە ناو بەرێت. چونکە سوارەی نیزامی ئێران، لە دەشتە تەختەکان هێزێکی زۆری هەبوو. ئەگەر ئەو ماوەی حەوتەیەك لەم دەشتە رادەوەستا و ئێرانیانی دلێر و ولاتپارێزی بۆ ناو سوپا بانگ دەکرد" ئەسکەندەر و سەربازەکانی لە ئێران نەدەگەرانەوە.

بەلام ئەگەر وتەی "ئاریان"[1] مێژوونوسی یۆنانی قبول بکەین، داریووشی سێهەم جۆرێك فێری سەرخۆشی و خواردنەوە بوو کە نەیدەتوانی خۆی ئامادە بکات بۆ تەحەمول کردنی ئەو زۆری و زەحمەتییانەی وا پێویستی بەپێك هێنان و بەرێوەبەری سوپایەك هەیە.

لەوانەیە ئەم ووتارە دروست ببێت، چونکە چ لە قەراخی رووباری ئیسێۆس و چ لە قەراخی دجلە، کاتێ مەقدوونیەکان گەیشتنە شوێنی حەوانەوەی داریووشی سێهەم، بینیان ئامرازی سەرخۆشی و خواردنەوە دابین کراوە و خۆراکیە چێژ و شەرابی خۆش لە چادرەکانیانیدا دەکەوتە بەرچاو. ئەسکەندەر کاتێ لە کێو تێپەر بوو، چووە ناو دەشتی ئێران شارەوە.

لە کێو تا خودی ئێرانشار، چل و پێنج میل رێ بوو و لە تەواوی ئەم ناوچەیە دارستانێکی چر هەبوو" من ئەم دارستانەم لە ئێراندا نەبینیوە

(ئەم رستەیە هارۆڵد لەمب نوسەری پەرتووکەکە دەڵێت)" بەڵام رەوشی زەوی و زارو توانای زەوی و هەبوونی ئەو شتانە کە ئوروپاییەکان بەناوی "ئوموس"[(١)] ناوی دەبەن، لە خاکی ئەم دەشتەیە، دەسەلمێنێت کە نووسراوەی مێژوونوسانی یۆنانی راستە و لە مێژە، لێرە دارستان هەبووە.

دوای ئەوەی کە ئەسکەندەر و سەربازانی ماوەیەك لە دارستان رێیان کرد، چوونە ناو زەوی وزاری مەزراکان و فراوانی رووبارەکانی ئاو بووە هۆی سەرسوڕمانی ئەوان.

لە کاتژمێرێکەوە کە یۆنانییەکان لە کێو دەرباز بوون تا کاتێ کە شاری پێرس پۆلیس (ئێرانشار) کەوتە بەرچاو، پشوویان دا" چونکە ئەسکەندەر دەترسا کە هەر کات داریووشی سێهەم دەرفەت پەیدا بکا لە ئێرانشار، سوپایەکی گەورە کۆ بکاتەوە و ئەو لە ناوبەرێ. تەنانەت ئەسکەندەر بە سەربازەکانی خۆی دەرفەتی خواردنی نانی نەداو ووتی : لە رێدا خواردن بخۆن.

لە ڕوخساری ئەو جووتیارانە وا لە مەزراکاندا خەریکی کار بوون، نیشانەی پەرێشانی دیار بوو" وەکو ئەوەی کە چاوەڕێی هاتنی یۆنانییەکان نەبوون و یۆنانییەکان کە پەرێشانی ئەوانیان بینی، تێگەیشتن کە ئەوان زووتر لە هەواڵەکان چوونەتە ناو دەشتی ناوبراو.

---

(١) "نوموس" کە وەرگێڕی فارسی نییە و کەم تا کورتێك لەوانەیە بتوانێت "نامیە" وەربگێڕێتەوە، بریتیە لەخوێیەکانی کیمیاوی و گیانلەبەرانی زەرەبینی تایبەتێکە وا کاتێك لەهارچە زەوییەك هەبوو؛ ئەو زەوییە دەتوانێ جۆرەکانی گیا و گوڵ و درەختەکان پەروەردە بکات و ئەو زەوییانەی وا بەردەڵێن نین، ئەم "نوموس"ە لەدەست دەدەن. وەرگێر.

هێزەکانی ئەسکەندەر گەیشتنە پەناگەیەك کە تا شار زیاتر لە سێ میلی بەین نەبوو. لەوێدا ئەسکەندەر فەرمانی راوەستانی بە سەربازانی خۆی دا و بە یەکەکانی ڤالانژی ووت شێوەی جەنگی بگرن.

کاتێ کە سەربازەکان شێوەی شەڕیان گرت، ئەسکەندەر لە سەر بوسفال (ئەسپە رەش و تایبەتەکەی خۆی) لە بەرامبەر سەربازەکاندا تێپەڕی و دوایی سەرکردەی یەکەکانی لە دەوری خۆی کۆکردەوە و ووتی : ئێمە نازانین بەر لە رۆیشتن بۆ ناوشار چ دەبێت و رووبەڕووی چ هێزێك دەبینەوە. من دەزانم ئێوە زیاتر لە چل میل رێپێوانتان کردووە و ماندوون" بەلام ئەگەر سەرکەوتندا، چەند رۆژێك لە پێرس پۆلیس دا پشو دەدەین، چونکە منیش وەکو ئێوە ماندووم و پێویستیم بە پشو هەیە.

سوپا، دوایی بە شێوەی جەنگەوە لە ناوەڕاستی مەزراکان بەرەو شار کەوتنە ری" بەلام هەر چی نزیکی شار دەبوونەوە، شوێنەوارێك لە بەرخۆدانیان نەدەبینی و بەوگومانەی کە فێڵێك لە کار دایە، زیاتر وشیار بوون و تا کاتێ کە گەیشتنە دەروازەی پێرس پۆلیس.

یۆنانییەکان، ئێران شار (پێرس پۆلیس بەزمانی یۆنانی)، بە زمانی خۆیان بە "گازا فیلاکیا" ناو دەبرد، واتە شارێك کە لەوێدا خشڵ هەیە.

ئەوانە لە بارەی ئەم شارەوە بە تێبینی لە سەر گەورەیی ئیمپراتۆریەتی ئێران، خەیالاتی زۆریان دەکرد و ئەگەر لە شەڕی ئیسێۆس و قەراخی دجلە سەر نەدەکەوتن، نەدەکرا کە بیر لە گەیشتن بە ئێران شار بکەنەوە. نزیکەی ماوەی سێ سەدە، یۆنانییەکان و مەقدوونییەکان لە بارەی ئەم شارەوە ئەفسانەیان دەبیست کە بە ڕاستی بیریان لێ دەکردەوە.

"ئاریان" یەکێك لە هاوڕێیانی ئەسکەندەر لە پەرتووکی خۆیدا دەڵێت : ئێمە خەیاڵمان دەکردەوە ئەو بەردانە کە کۆلانەکانی پێرس پۆلیسی پێ

بەردڕێژ كراوە، لە زێڕ و زیوە و لە هزری ئێمەدا وا جێ كەوتبوو كە ئەم شارە كەوتووەتە ناوچەیەك كە ئەوەندە بەرزە، جگە لە هەڵۆ هیچ بوونەوەرێك توانای گەیشتنی بۆ ئەوێ نییە.

لەم رووەوە بۆ گەورەیی ئەم شارەش خەیاڵاتیان دەكرد و بیریان دەكردەوە كە ئێرانشار گەورەترین شاری دنیایە، لە كاتێكدا وانەبوو و ئێران شار لە بواری فراوانییەوە گرنگی نەبوو.

"ئاریان" دەڵێت : دوای دەرباز بوون لە سێ چوار شەقام، گەیشتنە كۆشكێك كە لە بەردی "سماق"(بەردی سوور)[2] دروست كردبوو. لە بەردەم ئەم كۆشكەدا، هیچ پاسەوانێك نەبوو و وات دەزانی كە بوونەوەرێك لەوێ ژیان ناكات. ئێمە لە پلیكانێكی بەردینی بەرین كە یەك ڤالانژ دەیتوانی لێوەی بچێتە سەرەوە، سەركەوتین و چووینە ناو تەلارەكانەوە كە دەتوانی بڵێی پڕ بوو لە زێڕ و زێو و ئەرغەوان و عەتر(بۆن).

لەم كۆشكەدا، زەرف گەلێك لە زێڕی قورس هەبوو كە یەك كەس نەیدەتوانی بەرزیان بكاتەوە و یەكێك لەو شتانە كە بووە هۆی سەرسوڕمانی ئێمە، ئەوە بوو كە چۆن ئەم هەموو زێڕ و زێو و كەرەستە بەنرخە بە بێ هیچ پاراستنێك لەم كۆشكەدا ماوەتەوە و هیچ كەس نەیبردووە و دوای ئەوەی كە ماوەیەك لە ئێران راوەستاین، تێگەیشتین كە لەم وڵاتەدا دزێك نییە و هیچ كەس تەماح لە ماڵی كەسی تر ناكا، هەرچەند بە نرخیش بێت و لەم رووەوە دانیشتوانی ئێران شار و

---

[2] سماق : سموقەسۆماك: لە زۆربەی زمانە سامییەكاندا(ئارامی، كلدانی،عیبرانی و ....) بە واتای سوورە. بەردی سماق : بەردی سوور

پاسەوانەکانی کۆشك بەوەی کە دەیانزانی خەزێنەکانی ئێران بێ خاوەنە، نەیانتوانی داگیری بکەن.

دیسان "ئاریان" دەڵێت هیچ کام لە بیناکانی یۆنان لە ڕووی جوانییەوە، نەدەگەیشتە پێی کۆشکی "پێرپۆلیس" و بەتایبەت تەلارێك لەم کۆشکەدا هەیە کە یەك سەد کۆڵەکە لەوێ دروست بووە و کۆڵەکەکان و کەڤ تەلارەکە بەوەی کە لە بەردە، هەمووی دەدرەوشێتەوە و کاتێ کە هەتاو لێیان دەدا، ناتوانی چاو لەو بەردانە بکەیت، چونکە چاو لێیان واق دەمێنێ.

هەموو کاربەدەستان و سەربازەکان لەم کۆشکەدا نیشتەجێ بوون و کۆشك ئەوەندە گەورە بوو کە سێ هەزار سەربازەکەی ئەسکەندەر زۆر ئاسایی تێیدا جێ بووەوە. هێشتا ئەسکەندەر لە گەڵ سەربازەکانی خۆیدا دەژیا و تەنانەت لە پێرس پۆلیسدا دا، سەربازان و ئەفسەرەکان، هەر بە ناوی ئەسکەندەرەوە بانگیان لێ دەکرد. لەو شوێنە دا کە ئەسکەندەر دانیشتبوو، سەربازانی خۆی دەبینی و سەربازانیش ئەویان دەبینی و هەموو شەرابیان دەخواردەوە و خواردنیان دەخوارد" چونکە ماندوی و برسیەتی بە جۆرێك لە سەریان زاڵ بوو بوو کە هێشتا بە دەست هێنانی خەزێنەکانی کۆشکی ئێرانشار، نەکەوتۆتە خەیاڵیان و ئەم کارەیان لە ڕۆژانی دواییدا دەست پێکرد.

ئێستا دەگەین بە بابەتێك کە دەبێ لە بارەی ئاگر کەوتنەوە لە کۆشکی پێرس پۆلیس قسە بکەین.

بەلام لەهیچ کام لەنوسراوەکانی هاوڕێیانی ئەسکەندەر ئەم خاڵە نابینرێت کە ئەسکەندەر، یا کاربەدەستانی ئەو بە ئەنقەست کۆشکی پرسپۆلیسیان ئاگر دابێت و بە پێچەوانەوە هەموو هاوڕێیانی ئەسکەندەر

که بیرەوەرییان لە خۆ بەجێ هێشتووە، ئەڵێن کاتێك که ئاگری تێپەڕ بوو، بۆ کوژانەوەی، هەوڵیان دا.

من نامەوێ ئەسکەندەر بێ تاوان بکەم ( ئەمە هارولد لەمب نووسەری پەرتووکەکە دەڵێت)" ماوەی ئەوە کە ئەسکەندەر قۆناغەکانی دوایی، بە جۆرێك حاڵی گۆرا و بکەری ئەوەندە تاوانی سەرسوڕهێنەر بوو کە ئاگری کۆشکی پێرس پۆلیس لە بەرامبەر ئەمانەدا، هیچ نییە، بەلاّم ئەرکی من کە شیکارییەکی مێژوویی دەنوسم ئەوەیە کە باس لەراستی مێژوو بکەم.

لە پەرتووکی ئەوانەی وا لە گەڵ ئەسکەندەردا بوونە، هیچ شتێك لە بارەی ئەو لە بەسەرهاتە بەناوبانگەنابینرێت، کە لەو شەوەدا ئەسکەندەر لە گەڵ خۆشەویستەکەیدا "تائیس" شەرابی خواردوە و سەرخۆش بووە، و تائیس ئەوی هان داوە کە کۆشکەکە ئاگر بدات.

بە پێی نووسراوی هاوڕێیانی ئەسکەندەر تائیس قەت لە ئێران شار نەبووە، واتە لەو کاتەدا لەوێ نەبووە، چونکە ئەسکەندەر جگە لە دایکی داریووش، هەموو ژنەکانی لە بابل دانا تا چالاك بێ و بتوانێ خێرا بجوڵێت و "تائیس" یش لەو کەسانە بوو کە لە بابل مایەوە.

ئەگەر بە ڕاستی لەو شەوە، یان شەوی دوایی، یان دوو شەو دوایی، بۆ تۆڵە کردنەوە لە هەخامەنشیەکان کە وا "ئاسینا" ی پایەتەختی یۆنانیان ئاگر دابوو، بیوستبایە کۆشکیێرس پۆلیس ئاگر بدات، ئەوا بۆچی هیچ کام لە هاوڕێیانی ئەو نەیاننووسیوە کە ئەم کارە بۆ وەلاّمدانەوە لە بەرامبەر سوتاندنی "ئاسینا" ئەنجام درا؟

ئەوانە لە کێ دەترسان کە ئەم بابەتەیان لە پەرتووکەکانیاندا باس نەکردووە؟

سوپایەکی سەرکەوتوو کە دەچێتە ناو پایەتەختی وڵاتێکەوە کە ئەو وڵاتە لە گەڵ وڵاتی ئەو سوپایەی سەرکەوتووە دوژمنایەتی دێرینیان هەیە، ئەگەر کۆشکێك بۆ وەلامدانەوە ئاگر بدات، کارێکی سەرسوڕهێنەر نییە" بەڵکو بە سەرنجدان لە هەل ومەرجی ئەو سەدەیە، کارێکی ئاساییە. ئەگەریش بە ڕاستی ئاگر گرتنە کە ئەنقەست بووبێ، دوایی بۆ چی هەوڵیانداوە کە بیکوژێننەوە و ئایا وا باشتر نەبوو بهێڵن هەموو کۆشکەکە بسووتێت. چونکە بە پێی ئەوە کە لە گەڵ ئاگرەکەدا خۆیان ماندوو کرد و کوژاندیانەوە، ئاگر هەموو کۆشکەکەی نەسووتاند.

لەم بارەیەوە باسم کرد و هەموو ووتیان، ئەسکەندەر بە ئەنقەست کۆشکی پێرس پۆلیسی ئاگر داوە" بەلام من لە مێژووی دێرینی یۆنان بەڵگەیەکم نەبینی کە ئەم ئاگرە بە ئەنقەست بێ.

هەر شێتیەتی تەواو بوو، کۆشکێك وا پڕ لە زێڕ و زیو و ئەرغەوان و عەترە، بە یەکجاری ئاگری تێ بەردەن و هەموو ئەو خەزێنە و سەرچاوانە لە ناو بەرن" بەگوێرەی عەقڵ، یەکەم دەبوایە خەزێنەکانی کۆشك چۆڵ بکەن و ئێنجا کۆشکەکە ئاگر بدەن" لە کاتێکدا سەر باسی هەموو مێژوونووسانی یۆنانی وهاوڕێکانی ئەسکەندەر نیشاندەرە کە کۆشکەکە، کاتێك ئاگری گرتووە کە خەزێنەکانیان چۆڵ نەکردبوو.

بۆچی ئەسکەندەر کۆشکە دارینەکانی "بابل" و "شووش"ی نەسووتاند (ئەم دوو شارەش پایەتەختی ئێران بوون – تازە دار زووتر دەسووتێت) و کۆشکی بەردینی پرسپۆلیسی کردە خۆراکی ئاگر؟

بەکورتی هیچ هۆکارێکی مێژوویی، یا شاهیدی مێژوویی رەسەن نەکەوتە دەستی من کە بسەلمێنێت ئەسکەندەر بە ئەنقەست کۆشکی ئێران شاری ئاگر داوە.

بەڵام چ بوو کە بابەتی ئاگر گرتنی بە ئەنقەستی ئەم کۆشکە بەدەستی "تائیس" کەوتە سەر زمانەکان" ئەم هەواڵە لە پەرتووکێك وەرگیراوە کە "پلۆتارك" لە بارەی شیکاری ژیانی پیاوانی بەناوبانگی جیهانی دێرین نووسیوە و پلۆتارك کەسێك بوو کە نوسینی مێژوو بەهێزی خەیاڵی خۆی پشتی دەبەست زیاتر لە بەڵگە مێژووییەکان.

ئەو لە پەرتووکی ناوبراو لە بارەی ئەو شەوە وا دەڵێت:

"ئەسکەندەر لە تەلاری (خەشایارشا) سفرەی خواردنەوەی راخستبوو و فەرمانی دا هەرکەس لەو کاربەدەستانە کە لە تەلار دێنە خزمەتی یەکتر، لە گەڵ خۆشەویستی خۆیاندا بن. دوای ئەوەی کە سەریان لە خواردنەوە گەرم بوو، ئەو کاتە، تائیس کە ژنێکی خەڵکی "ئاسینا" و خۆشەویستی "بەتلەمیووس"[1] بوو ووتی : ئەم شەو یەکێك لە شەوانی بەختەوەری هێنەری ژیانی منە، بە ئەوەی کە خۆم لە ناو کۆشکی پاشاکانی ئێراندا و لە تەلاری "خەشایارشا" دا دەبینم" بەڵام بەختەوەری و کامەرانی من کاتێ تەواو دەبێ کە مەشغەڵێك بەدەستەوە بگرم و ئەو کۆشکە ئاگر بدەم. چونکە "خەشایارشا" ئاسینای لە رابردوودا ئاگر دا" ئەوانی تر ئەم قسەیەیان بەهەرا و هوریا و شایی پەسند کرد و ئەو کات ئەسکەندەر کڵاوخودی سەربازی لە سەر نا و مەشغەڵێکی بەدەستەوە گرت و لە گەڵ "تائیس" دا کەوتە رێ و بەمەشغەڵ تەلارەکەی ئاگر دا و کاتێ سەربازانی مەقدوونی لە دەرەوە چاویان کەوت بەگڕی ئاگرەکە، بە ڕاکردن مەشعەلیان هێنا و ئاگری کۆشکەکەیان زیاتر کرد.

ئێمە چونکە هۆکارەکانی خۆمان لە بارەی چۆنیەتی دابین کردنی ئەم ئاگرە ووت، بابەتی سوتاندنی کۆشکی ئێرانشار هەر لێرەدا تەواو دەکەین

---

[1] بەتلەمیووس دوای ئەسکەندەر بووە پاشای میسر.

و تەنیا خاڵێک کە لە پەرتووکەکانی "پارمنیو" و "ئاریان" هاتۆتە بەرچاو، باسە دەکەین و ئەو دووانە دەڵێن : ئەسکەندەر کە ئەیویست لە ئاسیا بمێنێت، دەیزانی کە سوتاندنی کۆشکی ئێرانشار هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە بۆ هەمیشە ئێرانییەکان لە گەڵی دوژمنایەتی دەکەن.

پلۆتارک کەس نازانێ لە کوێوە بە پێچەوانەی ووتاری هەموو مێژوونووسانی یۆنانی کە لە گەڵ ئەسکەندەردا بوونە، بۆ هەر کاربەدەستێکی سوپا، خۆشەویستێکی دابین کردووە و ئەم ژنانە لە کوێ بوونە کە هیچ کام لە نووسەرانی تر کە لە گەڵ ئەسکەندەردا بوون، نەیانبینیوە" بەڵام "پلۆتارک" بینیویەتی، ئەوەش چەند سەدە دوای ئەسکەندەر.

مەقدوونییەکان کاتێ کە گەیشتنە ئێرانشار، وەرزی پاییز بوو و زۆری نەخایاند کە هەوا سارد بوو.

لە ئێرانشاردا، سەرمای هەوا، ئەوانەی زۆر ئازار نەدەدا" بەڵام زانیان کە دوای بارینی بەفر، جادەکانی ناوچە کوێستانییەکان گیراون. کاتێ گەیشتنە ئێرانشار، ئەسکەندەر وابیری دەکردەوە کە داریووشی سێهەم بەرەو رۆژهەڵات رۆیشتووە و مەبەستی ئەوەیە کە خۆی بگەیەنێتە سکستان (سیستانی ئەمڕۆکە لە باشووری ئێران). بەڵام دوایی تێگەیشت کە داریووش رێگای نیشتمانی دێرینی ماد (هەمەدان و کرماشان و ئازەربایجان) ی گرتۆتە بەر.

وابوو کە وەرزی زستانی ئەو ساڵە، هەوا لە ناوچەکانی شێدار و کوێستانی ئێران زۆر سارد بوو و ئەسکەندەر بیستی کە داریووشی سێهەم لە وڵاتی دێرینی ماد، گیری خواردوە و جادەکانی ئەو وڵاتە بەفر گرتوویەتی" لەم رووەوە نەیتوانیوە سوپایەکی تر کۆ بکاتەوە و تا وەرزی

بەهار و توانەوەی بەفرەکان، ئامادە بوونی سوپایەکی نوێ لە لایەن داریووشی سێهەمەوە درەنگ کەوت.

راوەستانی ئەسکەندەر و ئەفسەرەکانی لە ئێرانشار کە دوو مانگ (بە گوێرەی قسە و باس مانگ و نیوێك) درێژەی کێشا" دەرفەتی پێیان دا کە لە بارەی سەرکەوتنەکانی خۆیان و زەوی و زارانە وا داگیریان کردووە، بیر بکەنەوە. ئەوانە حسابیان دەکرد کە تەنیا لە رۆژهەلات، خێرا سێ سەد و شەست هەزار میل زەوییان داگیر کردووە و ئەم زەوی و زارانە جگە لە ولاتانی "میسر و لیبی"یە، کە بەر لە رۆیشتن بەرەو رۆژهەلات داگیریان کردووە.

چونکە ئەسکەندەر و ئەفسەرەکانی نەخشەی دروستی جوغرافیای رۆژهەلاتیان نەبوو و نەیاندەزانی زەوییە داگیر کراوەکان چەند پەرەی سەندووە و لە کارەساتەکانی دەوروبەر ئاگادار نەبوون.

تاکە ئاگادارییەك کە دەگەیشتە ئەوان، کارەساتی درێژایی جادەیەك بوو کە لە دەریای "مەرمەرە" وە دەگەیشتە ئێرانشار" چونکە ئەسکەندەر، تەنیا لە درێژایی ئەم جادە، فەرمانبەران و ئەرکدارانی خۆی دانابوو.

لە دەوروبەری ئەو جادەیە، زەوی و زارێکی بەرین هەبوو کە ئەسکەندەر ئەوانەی بەموڵکی خۆی لە قەڵەم دەدا، بێ ئەوەی بزانێت سنوور و کۆتایی ئەوانە لە کوێیە.

شەوانە لە کۆشکی ئێرانشار، ئەسکەندەر و سەردارەکانی دادەنیشتن و نەخشەی دێرینی جوغرافیای رۆژهەلاتیان کە "هکاتائوس"ی یۆنانی دایینابوو، راست دەکردەوە و بە پێی خەیاڵ و بۆچوونی خۆیان شتێکیان دەخستە سەری.

لەم شەونشینانە جوغرافیاییانەدا، دڵەڕاوکێ زاڵ دەبووە سەریان" چونکە بیریان لەوە دەکردەوە کە بۆ بەڕێوەبردنی ئەم وڵاتە بەرینە، بە ڕادەی پێویست بەڕێوەبەر و ئەرکدار نییە. مەگەر ئەوەی کە سەربازە ئاسایی و نەخوێندەوارەکان، بکەنە بەڕێوەبەری شارەکان و فەرماندەی "شارۆچکە" کان. تەنانەت بەوەیشەوە، ئەسکەندەر و ئەفسەرەکانی متمانەیان نەبوو کە بە ڕادەی پێویست هێزیان دەبێت. چونکە ئەگەر ئەفسەر و سەربازەکانیان بۆ سەرپەرشتی شار و ناوچەکان تەرخان کردبا ئیتر بۆ سوپای ئەسکەندەر ئەفسەر و سەرباز نەدەمایەوە.

بە هۆی ڕاوەستانی سوپای ئەسکەندەر لە ئێرانشاردا، ئەو هونەرمەندانەی کە لە بابل بوون خۆیان گەیاندە سوپاکە و شەوانە لە کۆشکی ئێرانشار نمایشتی شانۆگەرییان دەکرد.

هاتنی ئەو هونەرمەندانە ببووە هۆی ئەوەی کە هەموو شەو و ڕۆژەکەیان، لەو نمایشتانەدا بە سەر بەرن و ئەفسەر و سەربازەکانی ئەسکەندەریش کاتی خۆیان بۆ سەیر کردنی ئەو بەرنامانە بە فیڕۆ دەدا و کاتێك سەربازەکان مەست دەبوون، نێوان ناخۆشی لە بەینیان دەردەکەوت و لە ئەنجامی پێك هەڵچوونیاندا هەندێکیان دەکوژران یان بریندار دەبوون.

وا هەست دەکرا کە هێزی فەرماندەیی ئەسکەندەر ڕوو لە لاوازی بوو و هەرچەندە ئەسکەندەر شەراب خواردنەوەی بۆ سەربازەکان قەدەغە دەکرد، ئەوان گوێیان پێنەدەدا. چونکە خودی خۆی نەیدەتوانی خۆی بپارێزێت لە خواردنەوە.

ئەو سامانەی کە بۆ سەربازانی مەقدوونی و یۆنانی وئێجگار زۆر بوو، نەسیبی ئەوان بوو.

هەندێك لە سەربازەكان ئەوەندەیان پارەی زێڕ هەبوو كە نەیاندەتوانی لە گەڵ خۆیان بیگێڕن. لە بەر ئەوەش هیوایان نەبوو كە بەو زووانە بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان هەموویان سەرق خواردنەوەی شەراب دەكرد. هەروەها لە بەر ئەوەی لە خودی ئێرانشاردا بەڕادەی پێویست شەراب نەبوو چەند كاروانێكیان پێكهێنا و لە دەوروبەرەوە شەرابیان دەهێنا.

هەرچەندە ئێرانشار لە سەردەمی ئەسكەندەردا وەك شاری "سارد" ی لێهاتبوو لە سەردەمی كۆندا، بەڵام ڕەسەنایەتی خۆی هەروا پاراستبوو و لە هیچ یەك لە دوكانەكانی مامەڵەچی بابل ئێرانییەكان نەدەكەوتنە بەرچاو و ژنانی ئێرانی كە لە دروستی و پاكی دا ناوبانگیان هەبوو هەروا، پلەی پیرۆزی خۆیان ڕاگرت و نە درەوشانەوەی زێڕ و زیوی یۆنانییەكان سەرنجی ڕاكێشان و نە ناوی سەركەوتوویان.

ئاریان دەڵێت لە هەموو ئەو كاتانەی كە ئێمە لە ئێرانشاردا بووین تەنیا ژنێكی ئێرانیمان لە كۆڕ و بەزمەكانی خۆشیمان دا نەبینی و هەموو ژنەكان یان یۆنانی بوون یان بابلی و زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوای ئێران بوون.

ئەوە یەكێكە لە شانازییەكانی گەلی ئێران كە ژنەكانیان بە بۆنەی وڵاتپارێزی یان بە هۆی ئەوەی كە لە ڕووی دەروونییەوە پاك و داپۆشراو بوون، نەیانویست كە لە گەڵ یۆنانییەكان هەڵس وكەوتیان هەبێ.

***

# گفتوگۆی ئەسکەندەر لە گەڵ ئێرانییەکان

لەو رۆژانەی کە ئەسکەندەر لە ئێرانشار مابۆوە، لە نێو ئەفەسەرەکانی لە لایەکەوە و لە لایەکی تریشەوە ئێرانییەکان کۆمەڵە وت و وێژێکی لە بارەی ئاییینی ئێرانییەکان و رەوشتی گەلی ئێران پێك هێنا.

ئەسکەندەر کە هێشتا خوو و ژیان و بەڕبەڕیەتی دواتری پەیدا نەکرد بوو وەك ئینسانێك لە قەڵەم دەدرا، زۆری حەز لەو باسانە دەکرد. ناوبراو لە ئێرانییەکانی پرسی

چ بۆچوونێکتان هەیە لە بارەی ئەستێرەکانەوە و ئایا ئێوەش بڕواتان وایە کە ئەستێرەکان کارتێکردنیان هەیە لە چارەنووسی ئینساندا؟

ئێرانییەکان ووتیان: نا، بەلای ئێمەوە ئەستێرەکان هیچ چەشنە هێزێکیان نییە و لە دیاری کردنی چارەنووسی ئینسان کاریگەریان نییە.

ئەسکەندەر ووتی بەڵام ئێمە بە پێچەوانەوە بڕوامان وایە کە ئەستێرەکان دەستیان هەیە لە چارەنووسی ئینساندا.

دوایی پرسیاریان کرد: ئەوە چ شێوەیەکە کە خاوەنی سەرێك و دوو باڵی وەك باڵی هەڵۆیە و ئێوەش ئەوەتان لە سەرەوەی کۆشکەکانی خۆتان داناوە؟

ئێرانییەکان وەڵامیان دایەوە: ئەوە فریشتەیەکە کە لە نێوان ئاسمان و ئینسان دا نێونجییە و دوای مردنی ئینسان رۆح بەرەو پلەی ئاسمانی دەبا.

ئەسکەندەر پرسیاری کرد: بۆچی باڵەکانیتان وەك باڵی هەڵۆ لێکردووە؟

ئێرانییەکان وەڵامیان دایەوە: ئەو باڵە، کە شێوەی هەڵۆ دەدات تەنیا گوزارشتێکە، بەو واتایە و هەر وەکو هەڵۆ بەرزە فڕترین باڵندەیە، ئەو فریشتەیەش لە هەموو فریشتەکانی تر بەرزتر دەفڕێ و نێونجی مرۆڤ و ئاسمانە.

ئەسکەندەر پرسیاری کرد: ئێوە لە کام نەژادن و ئایا هەر لەو خاکەدا دروست بوونە یان لە ناوچەیەکی ترەوە هاتوون؟

ئەوان وتیان: ئێمەی ئێرانی لە وڵاتێك دا دەژیاین کە وەك بەهەشت بوو و بە "ئێران وەنەك" ی ناو دەبەین.

ئەسکەندەر پرسیاری کرد: "ئێران وەنەك" لە کوێیە کە ئێوە لەوێ ژیانتان دەگوزەراند؟

ئێرانییەکان ئاماژەیان بۆ باکوور کرد و وتیان "ئێران وەنەك" لەم رێیە دایە، زۆر سەرووتر لە باختەرییەکان، (ماوەرائەننەهر لە سەردەمەکانی دوایی) و زۆر سەرووتر لە "سندییەکان" و دیسان سەرووتر لە پارتیا (تورکستان واتە بەشەکانی باکووری ماوەررائەننەهر) و لەوێ بەهەشتێك بوو لە کەناری دەریایەکی ژێر زەوی، ئێمەش لەوێ ژیانمان دەبردە سەر و ئەسپەکانمان لەوێ ماڵی کرد و لەوێ زۆربەی کانزاکانمان دۆزییەوە. دیاریش نییە چ شتێك قەوما کە لە پڕ بەهەشتی ناوبراو لە ناو چوو و ئێمە ناچار بووین کۆچ بکەین و هاتین بۆ ئەم وڵاتە و یەکێك لە خێڵەکانی ئێمە بە ناوی پارس ناوی خۆی لەو وڵاتە نا[١]

---

[١] نوێترین لێکۆڵینەوەکانی رەگەزناسیش، پەیڕەوی ئەم تیۆرییەیە و رەگەزناسان دەڵێن: رەگەزی ئاریایی لەلای باکوورەوە هات وهەندێك لەزەوی ناسەکان باوەڕیان هەیە کە ناوچەکانی جەمسەری باکوور وا ئەمڕۆ بەستەڵەکە، لەدێریندا گەرم و ئاسایی بوو و خێڵەکانی ئاریایی لەوێدا دەژیان و بەهۆی گۆڕانی ئاو و هەوا کە هێشتا دیار نییە،

ئەسکەندەر پرسیاری کرد: بۆچی دوای کۆچ کردن ئەو ناوچەیەتان بۆ مانەوە هەڵبژارد؟

ئێرانیەکان وەڵامیان دایەوە: مالآتی ئێمە هەمان گەلە ئەسپەکان بوو و لەو وڵاتەش دا شیناوەرد بۆ لەوەڕ زۆر بوو و ئەسپەکانمان دەیانتوانی لێرە بلەوەڕێت و ئینجا ئێرەمان بۆ مانەوە دەستنیشان کرد.

ئەسکەندەر پرسیاری کرد: چۆن پاشاکانی هەخامەنشی هاتنە ئاراوە؟

ئەوان وتیان: خێڵی پارس بریتی بوو لە چەند بنەماڵەی گەورە کە یەکێك لەوانە بنەماڵەی هەخامەنشی بوو و ئەو بنەماڵەیە سەرۆکایەتی و بەڕێوەبردنی کاروباری ئێرانییەکانیان گرتە ئەستۆ و گەورەی ئەو بنەماڵەیەش بەناوی "کوورش" یان "خوروش" (یانی خۆر و هەتاو) بووبە فەرمانڕەوای پارس و توانی بە یارمەتی پیاوە سوارکارەکانی، وڵاتی مادەکان کە لە ڕۆژئاوای ئێران بوو بخاتە ژێر رکێفی خۆی و پاشان کوورش بەرەو کەناری دەریای سپی (دەریای ڕۆم یان مەدیتەرانە) وەڕێ کەوت و ئێرانییەکان لە بەرامبەر کوورش ڕێزێکی زۆریان نیشان دەدا، گۆڕەکەشی کە لە دوورەوە دەبینرێ لەلای ئێرانییەکانەوە پیرۆزەیێ.

لە ڕاستیدا گۆڕی کوورش، دامەزرێنەری دەسەڵاتدارێتی هەخامەنشی کە دەوری پڕ بوو لە داری کۆن و جۆگەیەکی ئاو لە پەنای گۆڕەکەوە تێپەڕ دەبوو دەبینرا.

---

بەیەکجاری رووی دا، یان وردە وردە گۆڕدرا، رەگەزی ئاریایی ناچاربوو کە لەجەمسەری باکوور بەرەو باشوور کۆچ بکەن؛ تاقمێك لە رەگەزناسەکانیش دەڵێن کە رەگەزی ئاریایی دوایی لە "تەبەت" کەوتۆتە ناوەندی ئاسیا، دەژیا و ئەو کاتە لەرێی باکوورەوە چووە ناو فەلاتی ئێران و لێرەشەوە چۆوە ئەوروپا و ئەگەر لەبارەی یەکەمین جێ مانەوەی رەگەزی ئاریایی لەناو زاناکاندا ئەوەندە جیاوازی هەبێت، بەتەواوی هەموو لەسەر ئەم بڕیارە یەکدەنگن، کە ئاریایی رەگەزەکان لەرێی باکوورەوە، چوونە ناو ئێرانی ئێستا. وەرگێڕ.

دوای ئەوەی کە کۆشکی ئێرانشار ئاوری گرت و کوژاندیانەوە، (دوایی ئەسکەندەر لە هەمان کۆشکدا لە بەشە ساخەکەی دا مایەوە) ئەسکەندەر فەرمانی دا کە گۆڕی کوورش دەبێ بەهێژایی بمێنێتەوە، بۆ ئەوەی کە سەربازانی لە بەرامبەر ئەو گۆڕە بێ ڕێزی نیشان نەدەن.

یەکێك لەو شتانە وا کوورش و ئەفسەرەکانی تێنەگەیشتن، بۆچی گۆڕەکەی کوورش لە شوێنێکی دوور لە ناوەڕاستی باخێکدایە کە تا ئێرانشار ماوەی هەیە.

هەروەها بۆچی گۆڕەکانی داریووشی گەورە و (خەشایار) شایش، کەوتۆتە شوێنێکی دوور و جگە لە مەنارەی ئاگرکەدەیەك کە لە سەر ئەوەوە ئاگریان دەکردەوە، گوند و بینایەکی تر لە لای گۆڕەکانیانەوە نەدەبینرا.

ئێرانییەکان وەڵامی ئەم بابەتەیان بە یۆنانییەکان دایەوە و ووتیان لەو ڕۆژەوە کە هەخامەنشییەکان لە ئێراندا پاشایەتی دەکەن، لەم شوێنەدا شەڕ نەبووە و بەم هۆیەوە ئەم ناوچەیە، وەکو ئێران وەنەك ئارام بووە و ئەوەیان بە بەهەشتی ئارامش و ئاسوودەیی زانیوە و بەم هۆیەوە هەندێك لەگەورەکانی ئێران لەم سنوورەدا لە خاك نێژراون.

بەڵام بۆچی گۆڕی پاشاکانی هەخامەنشییەکان لە ئێرانشارەوە دوورە، ئەم بابەتە سەرچاوەی لەوەوە گرتووە کە ئێرانییەکان گۆڕی مردووەکانیان لە ناوچەکانی دوور لە شار و گوند دروست دەکرد" تا ئەوەی کە هەرا و هۆریای ژیان و چالاکی ژیانی مرۆڤ، هێمنی و ئاسایشی رۆحی ئەوان تێکنەدات و رۆحیان ئاوێتەی ئاسودەیی ببێت.

ئەسکەندەر دوای ئەوەی کە ئەو شیکارییانەی لە ئێرانییەکان بیست، نامەیەکی نوسی بۆ ئەرستۆ و داوای لێکرد کە بێت بۆ ئێران و شتە سەیر

و سەمەرەكان ببینێت و ببیسێت و ئەگەر خۆشی ناتوانێت بێت، قوتابییەكانی خۆی بنێرێت.

ئەرستۆ لە وەڵامدا نوسی: من ناتوانم، بەڵام برازاكەم "كالیس تنس" م نارد.

دوای ئەوە كە بەفری زستان توایەوە و كاروانەرێیەكان كراوە، ئەسكەندەر لە پرسپۆلیس كەوتە جوڵە و مەبەستی ئەو ئەم جارە، شاری "هك ماتانا" یان هەمەدان بوو. تا ئەو جێییە كە دەكرا، ئەسكەندەر لە ناوچە نزمەكان تێپەڕ دەبوو تا ئەوە كە ئەسپەكانی سوپا بتوانن لەو ناوچانە كە گیا شین بووە، كەڵك وەرگرن.

لە ئێران شار تا هەمەدان شەش سەد میل رێیە و ئەسكەندەر دەبوایە بەشێك لەم رێگایە لە ناو خێڵەكانەوە تێپەڕ بكات و پێش بینی دەكرد كە لەوانەیە ئەوە بۆ ئەو كێشە بنێتەوە" بەڵام هیچ كێشەیەك لە ناو رێدا نەهاتە ئاراوە.

ئەسكەندەر ئاگادار بوو كە داریووشی سێهەم لە شاری هەمەدانە و دەیزانی كە سوپاییەكانی ئەو لەوێدا بریتین لە دوو هەزار سەربازی یۆنانی و تاقمێك سواری چەك سووك و پارێزەری تایبەتی خۆی.

لێرە باسێك هەیە كە بۆ ئێمە، دەربڕینی بۆچوون لە بارەی شێوازی داریووشی سێهەم دژوارتر دەبێتەوە چونكە بە جۆرێك كە بینیمان داریووشی سێهەم لە شەڕی ئیسێۆس (لە خاكی توركیای ئێستاكە) بۆیە شكستی خوارد چونكە ئەو سەربازە یۆنانییانەی وا لە سوپای ئێراندا بوون بە یەكجاری، جێیان چۆڵ كرد" هەر كەسێكی بوایا، لە باتی ئەو دوای ئەم رووداوە دەبوایە پشت بەم سەرابازانە نەبەستی.

دەبێ ئەو بە وەفاداریان پشتی بەستبێ بۆیە ئەم کارەی کردوە، ئەگینا دوای رووداوی شەڕی ئیسیۆس دەبوایە بەهەموو یۆنانییەکان رەش بین ببێ. وا بیر بکاتەوە کە سەربازانی یۆنانی لەوانەیە دیسان خەیانەت لە ئێران بکەن و ئامادە نەبن کە لە گەڵ هاوڵاتییەکانی خۆیاندا شەڕ بکەن.

ناوبەری رێی ئێرانشار و هەمەدان بەبێ هیچ رووداوێکی شایانی باس تێپەڕ بوو و تەنیا لە هەندێك لەو ناوچانە کە گۆڕی گەورەکانی رابردووی ئێران هەبوو، ئەسکەندەر ماوەیەکی کورت رادەوەستا و دەیوت: نوسراوەکانی سەر گۆڕەکان نەخوێننەوە.

ئەم گۆڕانە کە بەپێی سەفەرنامەکانی هاوڕێیانی ئەسکەندەر زۆر بوو، ئەمڕۆ لەئێراندا نییە" واتە لەژێر خاکە و ناتوانی ئەوانە ببینی. مرۆڤ لەسەفەرنامەکانی هاوڕێیانی ئەسکەندەر تێدەگەیشت کە هەندێك گۆڕانە زۆر شکۆدار بووە.

بوونی ئەم گۆڕانە دەسەلمێنێ کە ئێرانییەکان مردووەکانی خۆیان دەخستە ژێر خاك و مەبەستی ئێمە ئەوەیە کە وەکو زەردەشتییەکان، مردووەکانی خۆیانیان لەناو چادر و لەبەر هەوای ئازاد نەدەهێشتنەوە.

بەوەی کە ئەسکەندەر نێوانی ئێرانشار و هەمەدانی بەخێرایی دەپێوا، کاتێ گەیشتە ئەوێ تێگەیشت کە داریووشی سێهەم لەگەڵ دوو هەزار یۆنانی وتاقمێك سواری چەك سووك و پارێزەری تایبەتی خۆی لەهەمەدان رۆیشتبوو و ئامانجی ئەو رۆژهەڵاتی ئێرانە ومەبەستی ئەوەیە کە خۆی بگەیەنێتە خوراسانی ئێستا کە بتوانێ لەوێ، سوپایەکی نوێ پێك بێنێت.

داریووشی سێهەم راستەوخۆ رێگای خوراسانی نەگرتە بەر، بەڵکو بەرەو باکووری تارانی ئێستا رۆیشت تا لەوێوە بەرەو رۆژهەڵات بڕوا.

چونکه ئەگەر راستەوخۆ بەرەو رۆژهەڵات بڕۆشتایە، دەبوایە لە دەشتی ئێرانەوە تێپەڕ بێ و دەشتی ئێران لە وەرزی بەهار و هاویندا زۆر گەرمە و دەرباز بوونی سوپایەکی دوو سێ هەزار نەفەری لەوێوە، مەترسیدارە. چونکه ئاو وخۆراك بە ڕادەی پێویستی سوپا پەیدا نەدەبوو و لە هەندێ لە ناوچەکاندا ئاو هەر نەبوو و لە کۆنەوە زۆر رویدا کە ڕێبوارەکان لەم دەشتەدا ڕێ ون بکەن، یان ئەوەی کە لە زەختی تینوویەتی و گڕی هەتاو، ژیانیان لە دەست بدەن. کاتێ ئەسکەندەر بیستی کە دارییووشی سێهەم بەخێرایی ڕێگای باکووری گرتۆتە بەر، هەوڵی دا کە خۆی بەو بگەیەنێ و دەرفەتی نەداتێ کە سوپایەکی نوێ ئامادە بکات.

ئەسکەندەر ناوبەری هەمەدان تا سێ سەد میلی لە ماوەی پانزدە رۆژدا پێوا. سەرەڕای ئامرازەکانی هاتۆچۆی ئەو کاتە بێ گومان جوڵەی سوپایەك خاوترە لە هی چەند سوارێك. لە کاتی ئەم ڕێ ڕۆشتنە خێرایەدا هاوڕێیانی ئەسکەندەر چاویان بە چیایەك کەوت کە لووتکەکەی بەفری پێوە بوو "مازیاس" کە یەکێك لە هاوڕێیانی ئەسکەندەر بوو، ناوی نا کێوی شین کە ئەمڕۆ بەناوی "دەماوەند" ناو دەبرێ.

سەرچاوەی ئەم کێوە کە بۆچی لەلایەن ئەو کەسەوە بەناوی "کێوی شین" ناونرا، نادیارە و لەوانەیە بە هۆی ئاسمانێکی شین کە لە دەوری چیاکە بووە، ئەو ناوەیان لە سەری داناوە. لەوانەیە یەکەم جار ئەم کێوە لەدوورەوە، بەڕەنگی شین هاتبێت بەرچاوی ئەسکەندەر و هاوڕێیانی" بەڵام ئەمڕۆ کێوی دەماوەند بە هۆی بەفرێك کە لە سەر لووتکەکەیەتی، سپی ڕەنگە و من لە ئێراندا بیستبووم کە باگەلێکی توند لە لووتکەوە، بەفرەکان بەدەوری خۆیدا بڵاو دەکاتەوە.

ئەسکەندەر لە پشت دیواری شاری دێرینی "ڕەی" – "شا عەبدولعەزیم" ڕاوەستا، چونکە سەربازەکانی ماندو ببوون و نەیاندەتوانی بچنە پێشەوە.

ئەسکەندەر لەوێوە هەندێك لەسوارەکانی خۆی نارده دەوروبەر تا لە بارەی داریووشی سێهەمەوە زانیارییەك بە دەست بێنن" دەرکەوت کە داریووشی سێهەم چەند ڕۆژ لەمەو پێش، لە گەڵ سەربازەکانیدا لە شوێنێك ناسراو بە (دەروازەی خەزەر) تێپەڕ بووە.

ئەسکەندەر لە کاتێکدا لە دەوروبەر، زانیاری لە بارەی داریووشی سێهەم کۆ دەکردەوە، یەکێك لە ئەفسەرەکانی بەناوی "کونوس" ی نارد بۆ سیورسات پێی ووت هەرچەند کە دەتوانیٚ، خوراك و تفاق دابین بکات و بیهێنێت. بەرلەوەی "کونوس" بگەڕێتەوە، هەواڵێکی سەرسوڕهێنەر گەیشتە ئەسکەندەر و ئەوەش ئەمە کە یەکێك لە حاکمەکانی داریووشی سێهەم کە هەر لەو نزیکییە دایە، داریووشی ڕاوەستاندووە.

ئەمە سێهەمین خەیانەتی گەورەیە کە دەبێتە هۆی شکستی ئێران لەشەڕدا.

خەیانەتی یەکەم بەجۆرێك کە بینیمان لە قەراخی ڕووباری "ئیسیۆس" و خەیانەتی دووەم لە قەراخی ڕووباری دجلەدا ڕووی دا.

ئەگەر ئەم حاکمە (بە ووتەی یۆنانیەکان ئەم ساتراپە)، داریووشی سێهەمی نەدەوەستاند، ئەو خۆی دەگەیاندە خوراسان و لەوێداش بە پێی فراوانی جەماوەر و زۆری خوراك و پیشەسازانێك کە لەو ناوچەیەدا بوون، دەیتوانی سوپایەکی گەورە بێنێتە ئاراوە. دانیشتوانی خوراسان لە دێر زمانەوە لە دلێری و وڵاتپارێزیدا ناوبانگیان هەبووە.

بابەتی وەستانی داریووشی سێهەم بە دەست دەسەڵاتدارانێکەوە کە خودی داریووش پلەی پێدابوون، ئەوەندە سەرسوڕهێنەرە کە ئەسکەندەر

دوایی باوەڕی نەدەکرد و دەیووت : ناکرێت حاکمێك بویری کە پاشای هەخامەنشی راوەستێنێت.

بەڵام لێکۆڵینەوەکانی دوایی نیشانی دا کە هەواڵی سەرسوڕ هێنەر راستە و بە ڕاستی داریووشی سێهەم لە لایەن "ساتراپ" ێکەوە وەستێنراوە.

ئەسکەندەر کاتێ کە ئەم هەواڵەی بیست و راستییەکەی بۆ دەرکەوت بە بێ ئەوەی کە چاوەڕێی گەڕانەوەی "کونوس" و هاوردنی خۆراك و تفاق ببێت" لە گەڵ سوارەکانی و هەندێك لە پیادەبە هێزەکانی کە دەیانتوانی رێپێوان بکەن، کەوتنە رێ و پاشماوەی سوپاکەی لەشاری رەی دا بەفەرماندەیی "کراتروس" بە جێ هێشت.

رێگایەك کە ئەسکەندەر گرتیە بەر، بەرەو رۆژهەلات بوو و ئەوەندە پەلەی بوو ئارامی نەکرد تا دنیا روونان بێتەوە و بەشەو کەوتە رێ. چونکە دەترسا کە حاکمی ناوبراو لە کاری خۆی پەشیمان ببێتەوە و داریووشی سێهەم بەر بدات و ئەویش خۆی بگەیەنێتە "خوراسان"

ئەسکەندەر کاتی لە رەی دەرکەوتن ، بەقەد پێویستی دوو رۆژ خۆراك و تفاقی بۆ سەربازەکان و ئەسپەکان، هەڵگرت و ئەوەندە رۆیشت تا گەیشتە دەروازەی خەزەر و لە ناوەڕاستی دوو کێو کە دۆڵی ناوبراو پێکدێنێت، تێپەڕ بوو[(١)]

ئەسکەندەر و هاوڕێیانی تا نیوەڕۆ رێیان بڕی و لە نزیك کانییەك راوەستان وخواردنی نێوەڕۆیان خوارد. ئەسکەندەر بەهاوڕێیانی ووت دوای نێوەڕۆ، چوار سەعات بخەون تا بتوانن تەواوی شەو رێپێوان بکەن،

---

[(١)] لەبارەی ئەم خاڵەوە ناسراو بەدەروازەی خەزەر، تیۆری مێژوونوسان جیاوازیان لەگەڵ یەك هەیە و هەندێك دەڵێن: کە دۆڵی ناوبراو نزیکی "ئیوان کی" ئێستا بووە و هەندێك دەڵێن: هی شوێنی دیکەیە. من چونکە خۆم تایبەت لەبارەی ئەم دەروازەوە هیچم نەخوێندۆتەوە، ناتوانم لەبارەی رەوشی ئەوەوە شتێك بڵێم. بەڵام جیا لەمێژووی ئەسکەندەر، ئێمە لەمێژووی رووداوەکانی تریش، ناوی ئەم دۆڵە دەبیسین. وەرگێڕ.

وەهایان كرد و دروست كاتێ كە خۆر ئاوا دەبوو، كەوتنە رێ و تا بەیانی بێ راوەستان رێیان پێوا و لە كاتی رۆژهەڵاتندا، گەیشتنە ناوچەیەك كە یەك رۆژ و نیو بەر لەوە، داریووشی سێهەم و هاوڕێیانی لەوێوە دەرباز بوون.

ئەسكەندەر لەوێدا بیستی، ئەو حاكمی ئێرانی كە داریووشی سێهەمی وەستاندووە، لە گەڵ ئەودا بەرەو رۆژهەڵات رۆیشتووە و رووالەتا ئەو ساتراپە لە كاری خۆی پەشیمان بۆتەوە و لە داریووشی سێهەم داوای لێبوردنی كردووە و لە گەڵیدا رێگای رۆژهەڵاتیان گرتۆتە بەر، تا لە خوراساندا كە ئەو كاتە- لەو سەدەیەدا بەناوی "باختریان"[(٢)] ناو دەبرا، سوپایەكی نوێی بۆ بەرگری لەئەسكەندەر پێك بێنن.

ئەم هەواڵە وا ئەسكەندەر پێش بینی دەكرد، زۆر پەشۆكاندی و بە هاوڕێكانی ووت بكەونە رێ و تا كاتی نیوەڕۆ رێ بپێون و ئینجا پشوو دەدەین. تا كاتێك كە هەتاو گەیشتە ناوەڕاستی ئاسمان، خەریكی رێپێوان بوون و لەو كاتەدا گڕی هەتاو ئەوەندە توند بوو كە ناچار تا ئێوارە راوەستان و ئەینجا شەو تا نیوەڕۆی رۆژی داهەتو رێیان پێوا و ئەم جارە گەیشتە ناوچەیەك كە داریووشی سێهەم بیست كاتژمێر پێش، لەوێ دەرچوو بوو.

ئەسكەندەر لێرەدا ناچار بوو كە بۆ دۆزینەوەی داریووشی سێهەم لە خەتی كاروانەڕێ لا بدات.

ئەسكەندەر تا ئەو كاتە بە درێژایی رێی ئەو جادەیە كە بەرەو رۆژهەڵات (خوراسانی ئێستا) دەڕۆیشتن" رێی دەپێوا.

---

(٢) هەموو وا بیر دەكەنەوە كە "باختەر" بەمانای رۆژئاوایە، لەكاتێكدا وانییە و "باختەر" مانای باكوور دەدات و "باختەرییان" بریتی بوون لەزەوی و زارەكانی "خوراسانی ئێستا" و ناوچەكانی باكووری تانزیكەی رووبارەكانی جیحون و سیحون – وەرگێڕ-

بەلاّم لەوێدا تێگەیشت کە دەبێ بەرەو ڕاست واتە بەرەو باشوور بڕوات، وە لەباشووردا دەشتی بەناوبانگی ئێران دا هەبوو.

من، (واتە نوسەری پەرتووکەکە، هارولّد لەمپ) وەسفی ئەم دەشتەم لە سەفەرنامەکانی هاوڕێیانی ئەسکەندەردا خوێندوەتەوە" بەلاّم خودی ئەوەم نەدیبوو تا دوای شەڕی جیهانی دووەم کە چوومە ئێران و ئەوکاتە تێگەیشتم کە هاوڕێیانی ئەسکەندەر ئەوەی لە بارەی ئەم دەشتەوە وتویانە، ڕاست بووە.

من و دوو کەس لە هاوڕێیان سەرەڕای ئەوەی کە بە ئۆتۆمبێل دەڕۆیشتن و ئاویشمان پێ بوو، بە بنکەی پۆلیسمان وتبوو کە ئەگەر کارەساتێك بۆ ئێمە پێش هات و نەگەڕاینەوە، فریامان کەون، دیسان دەترساین" چونکە هەوا زۆر گەرمە و ئاو لە دەشتدا دەگمەنە و جادەش نەبوو و تەنانەت باڵندەش لەوێ باڵی لێك نەدەدا و وێرانەی لەم شێوەیە لە جیهاندا تاکن" یەکێك لەوانە بیابانی ناوەندی عەرەبستانی سعودی و ئەوی تر بیابانی ڕۆژهەلاّتی ئافریقایە و یەکێکیش بەشەکانی ناوەندی دەشتی ئێرانە کە لە وەرزی هاویندا لە تیژی هەتاو، مەل لە ناوەڕاستی ڕۆژدا لەوێ دەرباز نابێت و ئێمە لەو ڕۆژەدا کە لە دەشت تێپەڕ دەبووین، مەلێکمان نەبینی و تەنانەت لە هەندێك لەو ناوچانە دڕکی (موغیلانیش) نەبوو.

ئەو بابەتەی کە دەشتی ناوەندی ئێران بۆچی لە هاویندا ئەوەندە گەرمە" مەسەلەیەکە لە باسی ئەم پەرتووکە بەدەرە. بەلاّم ئەو شتەی کە من لەم دەشتەدا، لە ناو ئۆتۆمبێلدا سەرەڕای بوونی سەهۆلاّو و خواردن بینیم، نموونەیەك بوو لە ئەشکەنجەیەك کە هاوڕێیانی ئەسکەندەر لەم ولاّتە، بۆ دۆزینەوەی داریووش کێشاویان.

لەوێدا ئەسکەندەر کە دەبوایە لە جادەی کاروانەڕێوە بێتە دەرو و بەرەو ڕۆژهەلاّت بڕوا، پێنج سەد کەس لەو سوارانەی زۆر ماندوو بوون، دابەزاند

و باشترین ئەسپەکانی بۆ رۆیشتنی ناو دەشت هەڵبژارد. سەربازە ماندووەکان و ئەسپە بێ تاقەتەکانی لەوێ دانا و ئەو شەوە دوای ئەوەی کە مانگەشەو دەرکەوت، بەوانەی کە لە دواوە دەمانەوە، دەوت: ئێوە لە گەڵ ئاو و خۆراکی پێویستتان لە دواوەی ئێمەوە وەرن، لەوانەیە بتوانن یارمەتیمان بدەن، بەڵام هێزی جەستەیی خۆتان بە فیڕۆ مەدەن.

بەڵام، ئێمە ناچارین کە بە خێرایی بجوڵێین و لەم چرکەوە وا ڕێ کەوتین، ئیتر ڕاناوەستین، مەگەر ئەوەی کە داریووشی سێهەم ببینین.

کاتێ کە لە دەشت با هەڵناکا، شوێن پێی دەرباز بوونی کاروانێك بریتی لە سوار، یان پیادە بۆ ماوەیەك لە سەر زەوی دەمێنێتەوە. بە جۆرێك کە ئەسکەندەز و هاوڕێیانی بە بێ کێشە دەیانتوانی شوێن پێی کاروانی داریووشی سێهەم ببینن و بکەونە شوێنیان.

تا کاتێ کە دنیا تاریك و فێنك بوو، سەربازە یۆنانییەکان بە بێ سەختی ڕێیان دەپێوا، بەڵام کاتێ هەتاو دەرکەوت، گڕی هەتاو زەحمەتی ئەوانی زیاتر کرد.

ئەوانە بە هۆی ئەوەی کە دەیانویست بە خێرایی بجوڵێنەوە، بەشی خۆیان ئاویان نەبرد و ئەمە یەکێك لە هەڵەکانی ئەسکەندەر بوو کە بە نرخی گیانی ئەو و سەربازەکانی تەواو بوو. ئەسکەندەر و سەربازەکانی بە هۆی ناشارەزاییان لە گەڵ هەل ومەرجی دەشتی ئێران، وایان دەزانی کە دەشتی ناوبراویش، دەشتێکە وەکو دەشتی میسر کە ڕووبارێك وەکو "نیل" لە ناوەڕاستیەوە دەرباز دەبێت و هەموو کاتێ دەتوانن خۆیان بگەیەننە ئاو.

بێ ئاگا لەوەی کە ئەگەر لە دەشتی ئێراندا، ڕێنمایەك نەبێ کە هەندێ لە کانیاوەکان و چاڵاوەکان بە کاروانەکان نیشان بدات، لەوانەیە کە ئەوانە لە سەرانسەری خەتی ڕۆیشتنی خۆیان، دڵۆپێك ئاو بەدەست نەهێنن.

ئەگەر ئەسكەندەر و سەربازەكانی، بهاتایە و چوار كاتژمێر درەنگتر بگەیشتنایە داریووشی سێهەم، لەوانەبوو هەموویان بفەوتانایە و تینوویەتی هەموویانی لە ناو ببردایە.

نیوەڕۆی ئەو رۆژە لە تەواوی سوپای ئەسكەندەردا، دڵۆپێك ئاو نەبوو و سەربازەكانی ئەو وەكو زیندەوەرانی دارین، بێ دەسەڵات دەجوڵان" بە جۆرێك كە ئەسكەندەر ناچار بوو كە هەندێك بۆ دۆزینەوەی ئاو بۆ دەوروبەر بنێرن. لە وانە، تەنیا یەك كەس لە ناو خودەكەیدا ئاوی هێنا بوو، گەڕایەوە و ووتی : لە پاڵ گردێكدا، ڕوباری ئاوی تەسك هەبوو كە دڵۆپ دڵۆپ دەتكا و منیش ماوەیەك سەبرم كرد تا ئەو دڵۆپانە، كڵاوەكەی من پڕ بكات. ئەو كاتە كڵاوەكەی خۆی دا بەدەست ئەسكەندەر و ووتی بخۆرەوە.

ئەسكەندەر ئاوەكەی لە دەست ئەو پیاوە گرت و چاوێكی خشاندە سەربازەكان و ئەسپە تینووەكانی ئەوان و لە پڕدا، بێ ئەوەی بیخواتەوە، ئاوەكەی رژاندە سەر زەوییەكە و ووتی : لە جێگایەك كە هەموو تینوویانە، یەك كەس نابێ ئاو بخواتەوە. ئەو كاتە فەرمانی دا كە سەربازەكانی بكەونە ڕێ.

سەربازەكان یەكێك لە كاربەدەستانیان ناردە لای ئەسكەندەر كە لە پێشەوەی ستوونی نیزامییەوە دەڕۆیشت و پێیان ووت : ئێستا كە هەوا گەرمە و ئێمە و ئەسپەكان تینوومانە، وا باشە كە راوەستین و ئەو چادرانەی كە لە گەڵ خۆمان هێناومانە، هەڵی بكەین كە لانی كەم لە ژێر سێبەردا بین. چونكە بە درێژەدانی ئەم رێپێوانە لە ژێر ئەم هەتاوە سووتێنەرە ئەگەر ئێمەش ماندوو نەبین، ئەسپەكانمان ماندوو دەبن.

ئەسكەندەر ووتی كاتێ ئەسپەكان ماندوو بوون، ئێمە دادەبەزین و هەرچییەك بێت من تا نەگەمە داریووشی سێهەم، راناوەستم.

بە جۆرێك کە دوایی ئاشکرا بوو، داریووشی سێهەم و راوێژەکانی، نەدەهات بە بیریاندا کە یۆنانییەکانی سپی پێست و لەش ناسکەکان وا لە ناوچە فێنکەکان گەورە بوون، بتوانن رێپێوانێکی درێژ لە ناو دەشتدا بەرۆژ بکەن.

ئەوانە لە لای خۆیانەوە وای بۆ دەچوون هەر چەندە ئەسکەندەر بە پەلە بجوڵێت، تەنیا شەوانە دەتوانێ رێپێوان بکات و رۆژ، توانایی جوڵەی نییە. بە هۆی ئەوەی کە ئەوان چەند رۆژ لە پێش ئەوەوەن، ناتوانن پێیان بگەن و بە ئەوان لە کۆگاکانی ئاوی دەشت ئاگادار نین و ناشارەزان و ئێرانییەکان قەت رێنماییان بە ئەستۆ ناگرن، ماوەیەکی پێ ناچێت کە لە ناو دەشتدا لە برسیەتی و بەتایبەت لە تینوویەتیدا گیانیان لە دەست دەدەن. (هیچ ئێرانییەك ئامادە نەبوو، رێنمای ئەسکەندەر بێ و کانیاوەکان و چاڵاوەکانی ئاوی دەشت بەوان نیشان بدات).

مێژوو نوسانێك کە لە دەشتدا لە گەڵ ئەسکەندەر بوون، وەها دەڵێن:

هەتاو ئەوەندە گەرم بوو کە ئەسکەندەر و سەربازەکانی نەیاندەتوانی کڵاوخود لە سەریاندا راگرن و کڵاوخودیان لە سەر هەڵگرت و هەریەك کڵاوی لێوارەداری ئاساییان لە سەر نا تا روومەتیان لە گڕی هەتاو بپارێزێت.

بەتایبەت روومەتی ئەسکەندەر بە جۆرێك سوور ببوو دەتوت، خوێنیان بە سەر روومەتیدا ڕشتووە و لە چاوەکانیدا، بریقەیەك وەکو بریقەی ئاو دەدرەوشایەوە.

کاتێك کاتژمێرێك لە نیوەڕۆ تێپەڕ بوو، ئەسپەکان ئیتر نەیاندەتوانی درێژە بەرێگا بدەن، تەنیا بەزەبری شەللاق ئەوانیان دەخستە جوڵە و دەتوت، زیندەوەرانی تینوو و برسی، دەپاڕانەوە کە ئەوەندە ئازاریان نەدەن.

***

# ئێرانییەکان و مەکدوونییەکان

سەربازەکان و کاربەدەستان، چاویان بڕیوەتە ئەسکەندەر بزانن کە خۆی کەنگێ ماندوو دەبێت و ئیتر هێزی رێپێوانی نامێنێت. بەڵام سواری بوسفال (ئەسپەکەی بەم ناوە، ناودەبرا) وەکو ئەوەی کە نە ماندو بێ و نەتینوو" هەر دەڕۆیشت، ئەوانیش ناچار بوون بڕۆن بە دوایدا.

ئەم رێپێوانە لە ژێر هەتاو دا سەربازەکانی رەش کردبوو، تا کاتژمێری شەشی دوای نیوەڕۆ درێژەی بوو.

لەم کاتەدا لە پڕێکدا ئەسپەکان تێك چوون و بە لووت هەوایان هەڵمژی و سەرباز و کاربەدەستان، تێگەیشتن کە دەبێ لەو نزیکییە، کانی، یان رووباری ئاو هەبووبێ کە تێکەڵاوی ئەوە لە گەڵ هەوادا، ئەسپەکانی تێکدابێ.

لەمەو بەدوا ئەسپە بێ گیانەکان وەکو زیندەوەرانێك کە رۆحی نوێ کەوتبێتە جەستەیانەوە، بە خێرایی کەوتنە رێ و لە پڕدا لە دوورەوە، تۆزەلانێك سەرنجی ئەسکەندەر و سەربازەکانی راکێشا و تێگەیشتن کە ئەو تۆزەلانە هی کاروانی داریووشی سێهەمە.

کاتێك کە سەربازانی ئەسکەندەر گەیشتنە کاروانی داریووشی سێهەم، ئەوەندە ماندوو بوون وا بیریان دەکردەوە کە بێت و شەڕ رووبدات ئەوان چیبکەن و چۆن بەو تینوویەتی و برسیەتییەوە شمشێر راکێشن و بچنە گۆڕەپانی شەڕەوە. نائارامی ئەسپەکان کە کەوتبووە نێو هێزەکەوە و هەرچەند تۆزێك ئەوانی هاندابوو، بەڵام سەربازێك کە لەئێوارەی رۆژی

رابردوو تا ئێوارەی رۆژی تر لەسەر ئەسپ بووە و لە تەواوی ئەم ماوەیە تینوو و برسییە و تەنانەت سەعاتێك نەسرەوتووە، ناتوانێ وەکو تازە نەفەسێك شەڕ بکات.

بەڵام سەربازانی ئەسکەندەر و خودی ئەو لەوە بێ ئاگا بوون کە دیسان چ خەیانەتێکی گەورەی تر رووی داوە و جارێکی تر بەخت یاوەریانە.

سەیرە کە لە گەڵ پەلاماری ئەسکەندەر بۆ سەر ئێران، ئێمە هەنگاو بە هەنگاو رووبەڕووی خەیانەت دەبینەوە و خەیانەت بوو کە دەروازەکانی ئاسیای بچوکی لە ئەسکەندەر کردەوە و خەیانەت بوو کە ئەسکەندەری هێنایە ئێران و لەو رۆژەشدا کە دوژمنان دەڕۆیشتن تا بەیەك بگەن و شەڕ لە نێوان دوو سوپا روو بدات، جارێکی تر خەیانەت کاری خۆی کرد.

ئەسکەندەر و سوپاییەکانی کە لە خەبات ترسیان هەبوو، لە ناکاو ئەو دیمەنەیان بینی کە ئەڕابەیەك، کە بە دوو هێسترەوە بەسترا بوو، لە سوپای داریووش جیا بۆوە و غاری دا و ئەوانی تر، واتە ئە سەربازە یۆنانییاکانەی کە لە گەڵ داریووشدا بوون و هەندێکی تر کۆڵیان دا. ئەسکەندەر هاواری کرد داریووش لە کوێیە؟ و سەربازانی یۆنانی ئەڕابەی ناوبراویان نیشان دا کە بە خێرایی دوور دەکەوتەوە و ئەسکەندەر لە ترسی ئەوەی کە داریووشی سێهەم رابکا، لە گەڵ بیست کەس لە سوارەکانی خۆی بە دوای ئەڕابەکە کەوت گەیشتە کانیاوێك لە پاڵ گردێکا.

لەوێدا هێسترەکان کە بە مەبەستی ئاو ئەڕابەیان هەڵگرتبوو، راوەستان و ئەسکەندەر و سوارەکانی نزیك بوونەوە و بینیان کە تەرمی خوێناوی داریووشی سێهەم کەوتۆتە ناو گالیسکەکە و دیار نییە کە بە چەند زەربەی شمشێر، یان خەنجەر، کوشتوویانە.

ئەسکەندەر کە باسی ژیانی دلێرانی دەورانی دێرینی لە حەماسەکانی یۆناندا بیستبوو و نەیدەزانی کە بەشێك لەو بەسەرهاتانە ئەفسانەیە، ئاردزووی بوو کە خۆی لە چوارچێوەی دلێران و قارەمانانی ناوبراودا ببینێت و چاو لە کارەکانی ئەوان ببڕێت. چونکە بیستبووی کە لە شەڕی "تروا" قارەمانەکان کاتێ کە لە بەرامبەر تەرمی دوژمن تێپەڕ دەبوون، بالاپۆشی خۆیان دەخستە سەر تەرمەکە. ئەو هەروەها بەغاری ئەسپەوە لەبەرامبەر گالیسکەی هەڵگری تەرمی داریووش تێپەڕ بوو و بالاپۆشی سپی رەنگی خۆی لە حاڵی غاردان، خستە سەر تەرمی داریووشی سێهەم.

خەیاڵم نەدەکرد کە مێژوونوس بەم جێگایەی بەسەرهاتی داریووشی سێهەم بگات و بۆ حاڵی ئەم پیاوە کە یەکسەر لە لایەن دەوروبەرییەکانیەوە خەیانەتی بینی، خەفەت نەخوات.

داریووشی سێهەم بێ تاوان نەبوو و بەو جۆرەی کە مێژوو گەواهی دەدات، هەندێك لەو کەسانەی وا خەیاڵیان دەکرد کە لەوانەیە لە بارەی دەسەلاتی هەخامەنشییەوە خۆیان بە خاوەن زانیبێ و کوشتبێتیان، بەلام دەبێ رەسمی کات و شوێنیش لە بەر چاو بگرین و هەموو شتێك بە چاوی رۆحیات... و بنەمای ئەخلاقی ئەمڕۆ نەبینین.

پێشینیان، خەڵکانێکی توندوتیژ بوون کە لە لای ئەوان هەندێك لە بنەمایانە کە ئەمڕۆ جێی بایەخی ئێمەیە" بێ بایەخ بوو. کاتێ دەسەلاتدارێك لە ناوچەیەکدا، دەسەلاتی بە دەستەوە دەگرت، چاوەڕوان بوون کە ئەوانی تریش پەیڕەوی لێ بکەن و ئەوانەی کە ئەویان بە تازەکار و بێ ئەزموون دەبینی، ئامادە نەبوون کە لەو فەرمان وەرگرن و ئەویش بۆ ئەوەی کە بتوانێ، هێزی خۆی نیشان بدات ناچار بوو کە هێزی زوڵمی خۆی بەکار بگرێت. ئەمڕۆ یاساکان و نیزامەکان لە هەموو ولاتان، هەر

جۆره رژێمێك لەوانه هەبێ، هەڵس و كەوتی هێزە سیاسییەكانی وڵات بە یەكەوه دیاری دەكا و بۆ فەرمانـدەیی دەسـەڵاتداری و سـەركەوتوویی یاسایی لە بەر چاو گیراوه و ئەوانی تر بە حوكمی یاسا ئەركیان هەیە كە بۆ فەرمانڕەوا رێز دابنێن و دەسەڵاتی ئەو بە پێی یاسا بە ڕەسمی بناسن. بەڵام لە ڕابردوودا نە ئەم یاساگەلە لە هەبوو، نە ئەو بنەما ئەخلاقی و كۆمەڵایەتیانـەی كـە لـە گـەڵ ئـەم یاسـاگەلەدا هاتۆتـە ئـاراوه. بـۆ دەسەڵاتدارێك وەكو داریووشی سێهەم كە بە یەكجاری دەبێتە دەسەڵاتدار، بـۆ سـەقامگیری حـوكمی خـۆی جگـە لـە بەكارهێنانی هێـزی زوڵـم و زۆر، ئامرازێك نامێنێتەوه.

من ناڵێم كە كاری داریووشـی سێهەم تەنانـەت لـەو كاتەشـدا، جێگـای پەسـندكردنە" بەڵام ئـەوه دەڵـێم كـە بـە پێـی ڕووداوەكـانی زەمـان ئـەنجام دەدرا و لەم ڕووەوه خەڵكی ئاسایی سەریان سوڕ نەدەما.

بەڵام ئەو خەیانەتانەی كە لـە داریووشـی سێهەمیان كـرد، نـە بەشـێوەی ڕووداوەكانی ئەمڕۆ بوو، نـە بە پێـی بنـەماكانی ئەخلاقی و ڕووداوەكـانی ئـەمڕۆ، وە ئـەم خەیانەیـەك بـە دوای یـەك كانـە بـووه هـۆی ئـەوەی كـە داریووشـی سێهەم لـە نـاو بـچێت و ئێـران لـە لایـەن یۆنانییەكانـەوه داگیر بكرێت.

ئەسـكەندەر كـاتێ كـە تێگەیشت داریووشـی سـێهەم كـوژراوه" كەوتـە شـوێن ئـەوەی كـە بزانێـت كـێ كوشـتوویەتی" بـەڵام بكـوژی داریـووش بەووتـەی سـەربازە یۆنانییـەكان هـەمان "سـاتراپ" بـوو كـە داریووشـی سێهەمی ڕاوەستاند و ئەسكەندەر نەیتوانی ئەو پەیدا بكات و دیار بوو كە خۆی شاردبێتەوه

چونکە ئەسکەندەر و سەربازەکانی گەیشتنە کانیاوێك و تێرئاو بوون، شەو لەوێ مانەوە و بەیانی ئاهەنگی گەڕانەوەیان لێدا.

لە ڕێگا، بەو هێندە سەربازە کە لە جادە ئەوانیان جێ هێشتبوو، ڕووبەڕوو بوون و بینیان کە ئەوانە بە ئاو و خۆراکەوە هاتوونەتە پێشوازیانەوە. بەڵام ئیتر سەربازەکانی ئەسکەندەر پێویستیان بە ئاو نەبوو" چونکە ئەزموونی تاڵی ڕۆژی رابردوو ناچاری کُرد بوون کە کاتی گەڕانەوە، لە کانیاوی ناوبراو بڕێ ئاو لە گەڵ خۆیاندا بێنن.

ئەسکەندەر فەرمانی دا کە تەرمی داریووشی سێهەم بپارێزن تاکو بە ڕێ و ڕەسم بینێژن" بە شێوەیەك کە دوایی لە بارەیەوە باسی دەکەین.

پێمان وایە کە پێویست بە باسی پێشووی گەلی مەقدوونیە و ئەسکەندەر ناکات" چونکە هەموومان لەوە دەزانین. لە بارەی ئێرانەوەش لە بواری بەلاوەنانی دوژمنایەتی و داب و نەریتییەوە زۆر باس ناکەین" چونکە مێژووی گشتی ئێران بەناوبانگە. هەموو دەزانن کە کوورش بنیاتنەری سیستەمی دەسەڵاتی هەخامەنشی دەیەویست کە جیهانێك بێنێتە ئاراوە کە لە ناویدا هەموو گەلان خاوەنی سەربەخۆیی نەتەویی بن وە لە ئاشتی و سلامەتی بێ بەش نەبن.

کوورش ئەگەر زیندوو بمایا، یان ئەگەر جێگرەکانی هەرکات عەقڵ و ئینسان دۆستی و دادوەری کوورشیان هەبوایە، ئەم ئایدیا گەورەیە بەدەستی ئێرانییەکان دەکەوتە پراکتیکەوە.

لەم ڕووەوە دیارە کە لە زەمانی ژیانی کوورش، یەك "ئەتازوونی" گەلانی یەکگرتووی ژێر دەسەڵاتی ئێران، دوو جیهانی بوونی هەبوو کە لە ناویدا، هەر گەلێك خاوەنی ئازادی و سەربەخۆیی بوو و کوورش لە داب و نەریتی ئەو گەلانەی کە لە ژێر ئاڵای ئێران دەژیان، ڕێزی دەنا و لە

بەرامبەر تاپۆکانی ئەوان سەری دادەنواند، چونکە خۆی بە زەردەشتی دادەنا.

لە هەر یەك لەو وڵاتە ئازاد و سەربەخۆیانە کە لە ژێر ئاڵای ئێراندا دەژیان، نوێنەرێك لە لایەن پاشای ئێران بوو کە پێی دەوترا "ساتراپ"

ئێمە نازانین کە لە زمانی فارسی کۆندا، ساتراپ ناوی چ بووە و هەر ئەوەندە دەزانین کە لە زمانی یۆنانیدا ئەم ووشەیە "ساتراپ" نوسراوە و لەوانەیە ووشەی ئێرانییەکەی ساتراپ بووبێ" چونکە ئەم ووشە زۆر هاوشێوەی ووشەکانی فارسی کۆنە.

ساتراپەکان وەکو فەرمانڕەواکان کە ئەمڕۆ لە لایەن پاشای بەریتانیاوە دەنێردرێن. تەنیا نوێنەرێکی نائاسایی و پایەبەرز تەشریفاتی بوون کە لە کاری ناوخۆیی ئەو وڵاتانە کە لەوێ دەژیان، مافی دەستێوەردانیان نەبوو و تەنیا دەبوایە سەرنج بدەن کە هەندێك لە ڕەسم و داب و نەریت، وەکو ڕێز گرتن لە پاشا و ئاڵای ئێران لەو وڵاتانە بمێنێتەوە. دوای ئەوەی کە کوورش لە ناوچوو، ئەم ڕێ و ڕەسمانە لە دەورەی داریووشدا هەر مایەوە، بەڵام دوای ئەوە وردە وردە حاڵی ساتراپەکان لەو وڵاتانە کە لەوێدا دەژیان و نوێنەری نائاسایی شای ئێران بوون، گۆڕدرا.

ماوەی ناوبەری نێوان ناوەندی ساتراپەکان و پایەتەختەکانی ئێران لە لایەکەوە و بارودۆخی ناوچەیی و نەژادی ئەو نەتەوانەی کە لە ژێر ئاڵای ئێراندا دەژیان لە لایەکی دیکەوە، لە بەر ئەوەی کە ساتراپەکان نەیاندەتوانی لە فەلسەفەی باڵای ئایدیای کوورش تێبگەن، بووبە هۆی ئەوەی کە هەر ساتراپێك لە ناوەندی حکومەتی خۆیەوە، ببێتە دەرەبەگایەتییەك و دوای ئەو کوڕەکەی، جێی ئەوی دەگرتەوە. هەندێك لە

ساتراپەکان بە جۆرێ بە هێز و نەترس بوون کە لە فەرمانی شای ئێران سەرپێچیان دەکرد.

ئەو کات وڵاتی ئێران کە دوایی گەلێکی یەکگرتوو بوو، گۆڕا بەوڵاتێکی دەرەبەگایەتی خێڵێکی کە لەوەدا، هەر ساتراپێك، لە دەورانی حکومەتی خۆیدا، هێزی بە پێی جیاوازییەك کە لە نێوان ڕۆحیات و جۆری ژیان و ئایدیۆلۆژیای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا هەبوو ، نابێت وا بیر بکەیتەوە کە دەرەبەگی خێڵەکانی ئێران هاوشێوەی دەرەبەگی خێڵەکانی ئەورووپا بوو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا. بەڵام لەو ڕووەوە ساتراپەکان فەرمانی شای هەخامەنشییان جێ بەجێ دەکرد و لە کاتی خۆیدا بۆ سەلماندنی وەفاداری خۆیان، دیاری یان بۆ ئەو دەنارد و بەشێك لە باجەکانی وڵاتیان دەخستە ناو خەزێنەکانی ئێرانشار، یان پایەتەختەکانی تری ئێران. لە کۆتاییەکانی سیستەمی هەخامەنشی دا، هێزی ساتراپەکان ئەوەندە زۆر ببوو کە لە هێرشی ئەسکەندەر، داریووشی سێهەم نەیتوانی لە یارمەتی ئەوان بە دروستی کەڵك وەربگرێت. وە تۆ دەتووت کە هەر ساتراپێك، هێرشی ئەسکەندەری بۆ سەر ئێران، بە شەڕێك دەزانی کە مافی بەوەوە نییە.

ئەگەر جگە لەمە بوایە و ساتراپەکان شەڕی ئەسکەندەریان، بەشەڕێك بزانیایە کە مافی بەوانەوە هەیە، لە بەرامبەر یۆنانییەکاندا، داریووشی سێهەمیان تەنیا نەدەهێشت و زیاتر لەوەش ساتراپی شاری (ڕەی) هەڵنەدەستا بەڕاگرتنی داریووشی سێهەم کوشتنی لە دوایدا.

ئەنجامدانی ئەم خەیانەتە، هۆی تەواوی ئەوەیە کە ساتراپەکانی ناوبراو خۆیان بە فەرمانڕەوایەکی سەربەخۆ دەزانی و لە بەرامبەر داریووشی سێهەمدا هیچ جۆرە ئەرکێکیان بۆ خۆیان لە ئەستۆ نەدەگرت.

ئەسکەندەر دوای گەڕانەوە لە (رەی)، لە (هەك ماتانا) بۆ یەکەم جار قایل بوو کە ئەو بەناوی پاشای ولاتانی رۆژهەلات بناسن. ئەو ناوە بووە هۆی نارازی بوونی هەندێك لە دەوروبەرییەکانی ئەسکەندەر و بەتایبەت "بەتلەمیوس"" ئەوانە وتیان ئەسکەندەر پاشای مەقدوونیەیە، نەك پاشای رۆژهەلات و لەم رووەوە کە ئەم هەواڵە بگاتە مەقدوونییە و ئەوانەش بزانن کە ئەسکەندەر لە هێزەکانی خۆی گۆڕاوە و ناوی پاشای ولاتانی رۆژهەلاتی لە سەر خۆی داناوە، زۆر ناڕازی دەبن.

ئەسکەندەر وتی : من گرنگی بە ڕازی نەبوونیان نادەم و ئەم هەستانەی دانیشتوانی مەقدوونیە کە ژمارەیان شەش سەد هەزار بوو بە لای زۆرینەی ئەفسەرەکانی ئەسکەندەرەوە قورسی بوو (جەماوەری نەبوو).

یەکێك لەو هونەرمەندانە کە لە سوپای ئەسکەندەردا بوو، ناسراو بە "لیسیپوس"، بڕیاری دا کە پارەیەکی نوێ بۆ ئەسکەندەر دروست بکات، کە لەوەدا سەرکەوتنەکانی ئەو لەرۆژهەلاتدا بیر بخاتەوە. ئەم پارەیە، ئەسکەندەری بە جۆرێك نیشان دەدا کە لە پشتیەوە، شێرێك راوەستاوە و ئەسکەندەریش پارەی ناوبراوی زۆر بە دڵ بوو و فەرمانی دا کە لەوە هەر چەند دەتوانن پارە دەر بکەن و بینێرن بۆ دەوروبەر.

ئەسکەندەر ئەو دەستکەوتانەی وا لە شارەکانی ئێراندا، واتە چوار پایەتەختەکەی ئێران بە دەستی هێنا، یەك سەد و هەشتا هەزار کوپەی زێڕ و زیو و جەواهیر بوو و کاتێ حیسابیان کرد، بینیان کە ئەگەر ئەم سامانە لە ناو شەش سەد هەزار کەس دانیشتوانی مەقدوونیە بەش بکرێت، نە تەنیا هەموویان تا کۆتایی تەمەنیان دەوڵەمەند دەبن" بەڵکو

منداڵەکانیشیان دەتوانن بە بێ ئەوەی کە پێویستیان بە کار کردن هەبێ، ژیان بکەن.

ئەسکەندەر کە ئاوا سامانێکی زۆری بە دەست هێنابوو، تێگەیشت کە زێڕ و زیو لە بنەڕەتدا نرخی نییە، بەڵکو لەم ڕووەوە کە ئامرازی گۆڕینەوەی کاڵایە، بایەخدارە.

ئەو نەیدەزانی و کەسێك پێی نەدەوت کە هەرکات ئەم سامانە زۆرە بگاتە مەقدوونیە، لە باتی ئەوەی کە ئەم وڵاتە ئاوەدان بکات، بە پێچەوانەوە، دەبێتە هۆی وێران کردنی. چونکە جووتیار لە کشتوکاڵ و پیشەساز لە پیشە وبازرگان لە بازرگانی، واز دێنێت.

هەر واش بوو و گەیشتنی خەزێنەکانی ئێران بۆ مەقدوونیە، بە یەکجاری لەو وڵاتە گرانی هێنایە ئاراوە و نرخی هەندێك لە کاڵاکان تا پەنجا ئەوەندەی خۆی چووە سەرەوە و چۆن لە هەر وڵاتێکدا کەسانێك هەن کە لە لایەکەوە ناتوانن لە دەستکەوتەکانی گشتی کەڵك وەرگرن" ژیان بۆ ئەوانەی وا لەم سامانە نەسیبیان نەبردووە، بە جۆرێك بووەکێشە کە ناچار بوون لە مەقدوونییە بار بکەن و ئەوێ بەجێ بێڵن. چونکە دەرئەنجامی کاری یەك مانگیان، خەرجی دوو ڕۆژیانی نەدەدا و چونکە خودی ئەسکەندەر لە مەقدوونییە نەبووە، نەیدەتوانی بۆ گرانی، چارەسەرییەك پەیدا بکات.

لە هەك ماتانا (هەمەدانی ئێستا)، بابەتێکی تر هاتە پێشەوە و ئەوەش ئەمەیە کە داواکاری ئەو سەربازانە وا لە مەقدوونییەوە هاتوون چییە و ئایا دەبێ بەوانە ئیزن بدرێت، یان نا؟ سەربازانی ناوبراو دوای چوونە دەرەوە لە مەقدوونییە، ماوەی چوار ساڵ لە گەڵ ئەسکەندەردا بوون تا ئەوەی کە چوونە ناو ئێران.

دوای شەڕی كەناری دجلە، كاربەدەستان بەوانیان ووت كە ئیتر شەڕێكمان لە پێش نیە و ئیدی لەم رووەوە ئەسكەندەر پێویستی بە سوپایەك نییە، ئەوانە ئیزن دەدات.

بەڵام دوای چوونە ناو ئێرانشار و بینینی خەزێنەی ئەو پایەتەختە، ئەسكەندەر تێگەیشت كە لە سەرهەندێك لە گۆزەكان و سندوقەكانی زێڕ نوسراوە كە ئەم زێڕە لە "سند"[1] ەوە هاتووە. چونكە هەر لە كۆنەوە، هیندوستانییەكان زێڕیان بە ناوی رووبارێك كە لە رۆژئاوا بوو، بەناوی "سند" ناویان دەبرد و ووشەی "هند"، وشەیەكی كە لە"سند" گیراوە.

ئەسكەندەر لێكۆڵینەوەی كردووە تا بزانێ كە لە كوێیە و پێیان ووتوە سند ولاتێكەی بەربلاوە كە كەوتۆتە رۆژهەلاتی ئێرانەوە و خاكەكەی زێڕی تێدایە و لەو ولاتە رووبارێك هەیە بەناوی "سند" كە چیاكانی "پاراپانی ساد" هێمالای ئێستا، دەڕژێتە خوارەوە. لەو رۆژەوە كە ئەسكەندەر ناوی ئەو ولاتە تازەیەی بیست و زانی كە لەوێدا زێڕی زۆر هەیە، بڕیاری دا كە بچێتە سند، لەكاتێكدا سەربازەكانی وا بیریان دەكردەوە كە دەورەی شەڕەكان كۆتایی پێهاتووە و لە سەر بازی رەها دەبن.

ئەسكەندەر وای دەزانی كە ماوەی سەفەرەكەی بۆ رۆژهەلات، واتە بۆ سند زیاتر لەیەك ساڵ درێژەی پێ نادرێت، لەكاتێكدا ماوەی حەوت ساڵی خایاند، تا بگەڕێتەوە. یەكێ لەهەڵە گەورەكان وا هەندێك لەمێژوونوسان دەیكەن ئەوەیە كە وا بیر دەكەنەوە كە پەلاماری ئەسكەندەر بۆ سەر ئێران،

---

[1] "سند": پاكستان پێنج بەشە، كە سند بەشێكی گەورە لەو ولاتەیە. لەدێرین بەشێك لەهیندستان بووە، كە كاتی گاندی، محەمەد عەلی جەناح دراوە بەپاكستان و بووبە بەشێك لە جمهوری پاكستان. وەرگێڕی كوردی.

پەلاماری گەلێکی دڕندە بووە و ئێرانییەکان لەو سەردەمەدا شارستانی ترین گەلەکانی جیهان بوون.

مەقدوونیەکان تەنیا دوو شتیان دەزانی" یەکێ شەڕ و ئەوی تر کشتوکاڵ، بەڵام کشتوکاڵی ئەوان سەرەتایی دەژمێردرا وجگە لە مستێ گەنم و جۆ و هەندێك لەدرەختەکانی میوە، نەیاندەتوانی شتێك بچێنن.

کاتێك هاتنە ئێران و حاڵی ژیانی گەلی ئێرانیان بینی و مەزراکان و باخەکانی ئێرانیان سەیر کرد و لە گەڵ سیستەمی ئاودێری ئێرانییەکان و قەناتەکان ئاشنا بوون و جل و بەرگی رازاوەی ئێرانییەکانیان سەیر کرد و داب و نەریتەکانی شایستەی ئەوانیان کەوتە بەرچاو، تێگەیشتن کە خۆیان زۆر لە ئێرانییەکان دواکەوتووترن.

لە تەواوی مەقدوونییەدا، بینایەك نەبوو کە بتوانێ هاوسەنگی بکات لە گەڵ بیناکانی ئێراندا، وە کاتێ کە مەقدوونیەکان چاویان کەوتە میوەکانی ئێران، واقیان بردەوە و ئەوەندە نائاسایی میوەیان دەخوارد کە نەخۆش دەکەوتن" چونکە نەیاندەتوانی لە چێژی خواردنی میوە واز بێنن.

مێژوونوسانی یۆنانی دەڵێن کە ئێمە لە گوندەکانی رۆژهەڵاتی شاری رەی، شووتی گەلێکمان بینی کە ئەوەندە شیرین و بە چێژ بوون کە دوای ئەوەی سکمان لە خواردنیان بای دەکرد، دیسان نەماندەتوانی لەخواردنی شووتییەکان واز بێنین. بەشێك لەو درەختە میوانەی و لە ئێران و میزۆپۆتامیا و ئاسیای بچوکدا هەبوو، قەت لەیۆناندا نەبووە و تەنانەت تا سەدەی چواردەهەم و پانزەهەمی زایینی، واتە تا چوارسەد – پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر، بەشێك لەو میوە گەلە و بەوتەی ئەوانە لە باشووری ئێران و رۆژهەڵاتی زەوی، لە ئوروپا دەگمەن بوو.

رەوشــی بینــای خــانوو و راهێنــانی مــاڵات و پاراســتنی درەختــە میوەدارەکــان و کــشتوکاڵی مــەزراکان و پاراســتنی میوەکــان لــەوەرزی میوەکــان و لــەوەرزی زســتان و چــنینی جۆرەکــانی قومــاش کــە لــە مەقدوونییەدا بوو، بۆ مەقدوونییەکان لە ئێراندا تازە بوو.

لـەو شـتە سـەیرە و پێداهەڵوتنانـەی کـە لـە پەرتووکـەکانی هاوڕێیـانی ئەسکەندەردا دەبینرێت، دیارە کە مەقدوونییەکان دوای هاتنە ناو ئێران، وەکو گەلێکی نیوەشارستانی، یان دڕندە بوون کە هاتوونەتە ناو وڵاتێکی شارستانی.

کە لە دواپدا، زمانی یۆنانی، زمانی دێرینی ئێرانی خستە ژێـر تیشکی خـۆی و خـەتی یۆنـانی بـووە جـێگیرەوەی خـەتی ئێرانـی بـوو، هـۆی شارستانییەتی پێشکەوتووی مەقدوونییـە نییـە. بـەڵکو لـەوە سەرچاوە دەگرێ کە گـەلێکی سـەرکەوتوو لـە شـەڕدا، زمـان و خـەتی خـۆی لـە سـەر گەلێکی ژێردەست سـەپاندووە و ئـەم دەورە زۆری نەخایانـدووە و خـەت و زمانی ئێرانییەکان، گەڕانەتەوە و ئاسەواری یۆنان لە ئێران نەماوە.

مەقدوونییەکان کە لەوڵاتی خۆیاندا خاوەنی ژیانێکی سـەرەتایی بـوون، کاتێـك کـە هاتنـە نـاو ئێـران و بەتایبـەت دوای ئـەوەی کـە خەزێنـەکانی پایەتەختــەکانی ئێرانیــان دەســت هێنــا، ســامانێکی زۆر و خۆڕاییــان بەدەســت کـەوت" روویـاڻ لـە مـاڵ پەرەسـتی کـرد و لـە ئێرانـدا دەسـتیان بەکڕینی خـانوو و مڵك کرد و بڕیاریـان دا کە لاسایی ژیـانی گـەورەکان و خۆشــگوزەرانەکانی ئێــران بکەنــەوە. چــونکە بــۆ لــە بــەین بردنــی پێداویستییەکانی خۆیان لە ئێران، ناچار بوون کـە لـە گـەڵ ئێرانییەکانـدا خزمایــەتی بکــەن" خێــرا هەنــدێك کاربەدەســت و وەرگێــڕ و ســکرتێر و خزمـەتکار، دەوریـان گـرت و هەریـەك لـە کاربەدەسـتان و ئەفسەرەکانیان،

بوونه خاوەنی دام و دەزگایەکی بەربڵاو، کە خودی ئەسکەندەر کاتێك کە پاشای مەقدوونییە بوو، لە وڵاتی خۆیدا ئاوەها دەزگایەکی نەبوو.

نامەیەك وا "ئۆلۆمپیا" دایکی ئەسکەندەر لە مەقدوونییەوە بۆ کوڕەکەی نووسیویە، لە بارەی ئەم بابەتەوە، نموونەیەکی بەرجەستە دەخاتە بەردەست و ئۆلۆمپیا لەو نامەیەدا دەڵێت: "من سەرەڕای ئەوەی کە دایکی تۆم، لەم وڵاتەدا ئەمڕۆ بەدوو- سێ خزمەتکارەوە دەژیام، لە کاتێکدا ئەمڕۆ لە ڕۆژهەڵات، هەر ئەفسەرێکی سوپاکەت، لە ماڵی خۆیدا پانزدە خزمەتکاری هەیە.

ئینجا کە ئەفسەرەکان، تەنانەت سەربازەکانی ئەسکەندەر لە ئێراندا خوویان بەژیانێکی خۆشگوزەران کردبوو، بۆ ئەوانە زەحمەت بوو کە واز لەم ژیانە بێنن و لە گەڵ ئەسکەندەردا بەرەو "سند" بڕۆن و کاتێ کە بیستیان، ئەسکەندەر مەبەستی ڕۆیشتن بەرەو ڕۆژهەڵاتە، بەکاری جۆراوجۆر، ڕۆیشتنی ئەویان دوا خست.

یەکێ لەم کارانە، بەرپا کردنی کۆڕی سەرخۆشی و خواردنەوە و ئامرازی دیکە بوو، هاندانی ئەسکەندەر بۆ ڕاو، بەتایبەت لە دوای ئەوەی کە ساتراپی ناوچەی هیرکانیا (مازەندەران و ئەستەرئاوای ئێستا) فەرمانی ئەسکەندەری جێبەجێ کرد" بە حیساب دەهات. چونکە لەمازەندەران و ئەستەرئاوای ئێستا، شێر و پڵینگ و گای کێوی هەبوو، ئەسکەندەریان بۆ ڕاو بردە ئەو دارستانانەی کە دەکەوێتە قەراخی دەریای خەزەرەوە.

ئەسکەندەر لە وێنەکان و نەخشەکانی ئێراندا بینی کە ئەوانە بەچەکی وەکو "زووبین"، یان شمشێری دووسەر، پەلاماریان دەکردە سەر شێر و بۆ ئەوەی کە نیشان بدەن لە دلێریدا لە ئێرانییەکان کەمتر نین،

بەشمشێری دووسەر، لە دارستانەکانی "هیرکانیا" پەلاماری شێری دەدا، رۆژێك کە لە گەڵ شێرێکدا لە دارستان رووبەڕوو بوونەوە، یەکێك لەو کەسانەی کە پێشوازی لە مەقدوونییەکان کرد وتی: "من کاتیێ کە بینیم ئەو لەگەڵ شێرێکدا خەریکی شەڕە، نەمتوانی تێبگەم کە کام یەك لەو دووانە بەهێزتر بوون"

مێژوونوسانی رۆمی کە مێژووی هاتنی ئەسکەندەر بۆ ناو ئێرانیان لەچەند دەستەوە گرتووە" دەڵێن: ئەسکەندەر تا کاتێك کە لەئێراندا سەرنەکەوتبوو، غروری نەبوو، بەڵام دوای ئەوەی کە ئێرانی گرت، بەوەی کە ئێرانییەکان ناوی گەورەیان لەسەر دانا، لەخۆبایی بوو و بەجۆرێك خۆ بەزل زانی لەئەسکەندەردا زاڵ بوو کە لەدواییدا، حەزی دەکرد کە خەڵك خۆ بخەنە بەر پێی.

مێژوونوسانی رۆمی سەرچاوەی ئەم بابەتە لە زمان لووسی ئێرانییەکان دەزانن و دەڵێن کە گەلی ئێران بووە هۆی ئەوە کە ئەسکەندەر کۆڵی دا.

من وابیر دەکەمەوە کە هەرکەس بە نووسراوەکانی ئەو مێژوونوسانە وا لە گەڵ ئەسکەندەردا بوونە سەرنج بدات و ئەوانە بخوێنێتەوە، لە هەڵە رزگاریان دەبوو.

لەوانەیە کە لە وڵاتی ئێران، هەندێك زمان لووس دەوری ئەسکەندەریان گرتبێت" تاڕادەیەك گومانی تێدا نییە" چونکە هەندێك لە لای ئەسکەندەر و ئەفسەرەکانییەوە خزمەتیان دەکرد" بەڵام حیسابی چەند کەس دەبێ لە حیسابی گەلێك جیا بکەیتەوە.

لە شەڕی جیهانی دوایی دا، سوپای هیتلەر، وڵاتی فەرەنسایان داگیر کرد وهەندێك لەفەرەنساییەکان لەو دەزگایانە کە هیتلەر لەفەرەنسا پێکی هێنابوو، خەریکی ئیش بوون و هەندێك لەدامەزراوەکانی سەنعەتی

فەرەنسا وقۆناخی پیشەسازی، دیواری ئاتلانتیکیان ( رۆژئاوای ئەورووپا) بۆ هیتلەر دروست کرد و لەبەرامبەریدا ئەژنۆیان دادەدا و دەکەوتنە خاك" ئایا شێوازی هەندێك فەرەنسایی، دەتوانرێ بکەوێتە حیسابی شێوازی سەرانسەری گەلی فەرەنسا.

ئەو نووسراوانەی کە ئەفسەرەکانی ئەسکەندەر بەجێیان هێشت، لەم بەشەدا، ئامارە یا ئەو هۆکارانە دەخاتە بەردەستی ئێمە کە دەیسەلمێنێت کە ئەسکەندەر لەخۆبایی بووە، بەهۆی زمان لووسی گەلەکانی دیکەی رۆژهەلات بووە، نەك ئێرانیەکان. بۆ نموونە لەم نووسراوەدا دەخوێنن کە لەتەواوی ئەو جەژنانەی وا ئەسکەندەر و ئەفسەرەکانی لەئێراندا دەیانگرت" بڕێکی دیاریکراو لەئێرانییەکان ئامادە دەبوون، واتە هەر ئەو کەمینەیە کە بەشێك لەدەوروبەرییەکان و خزمەتکارەکانی یۆنانییەکان بوون و گەورەکانی ئێران و بەگشتی خەڵك، لەیۆنانییەکان دووریان دەکرد وئارەزوویان نەبوو کە لەگەڵیاندا هەڵسوکەوتیان ببێ. چونکە دەیانزانی کە ئەوانە بۆ نیشتمانی ئێرانیەکان بێگانەن و بەزوڵم و زۆرەوە هاتوونەتە ناو خاکیانەوە. لەتەواوی ئەو ماوەیە کە ئەسکەندەر لەئێراندا بوو، رووی نەدا کە توێژی رۆحانی ئەو کاتەی ئێران، یەك کەس لەئەنجوومەنی ئەسکەندەر و ئەفسەرەکانیدا دەربکەوێ.

جارجار ئەسکەندەر بۆ باسە زانستییەکان بانگهێشتی لێیان دەکرد کە تا لەمەجلیسەکەیدا بگەن بەیەك، بەلام ئەوان نەدەچوون.

***

# مەراسیمی پرسەی داریووشی سێهەم

ئەسکەندەر ماوەیەك لە ئێراندا ناچار بوو کە بۆ سەربازەکانی خۆی بڕێ قەڵخان و کڵاوخود دروست بکات.

لەم تەکنیکەدا ئێرانییەکان زۆر کارامە بوون و دەیانزانی کە یۆنانییەکان پارەیەکی چاك بەوانە دەدەن، بەڵام ئامادە نەبوون کە راسپاردەی یۆنانییەکان بگرنە ئەستۆ و بۆ ئەوانە چەك دروست بکەن. بەجۆرێك کە ئەسکەندەر ناچار بوو روو بکاتە پیشەسازانی بابل و لەوانە داوا بکات کە پێداویستییەکانی بێننە دی.

پارێزێك کە ئێرانییەکان لە یۆنانییەکانیان دەکرد، ئەوەندە بوو کە دوای سەد ساڵ ژیانی یۆنانییەکان لە ئێران، لە هەندێك لە ناوچەکانی ئێران، ئێرانییەکان نەیاندەتوانی لە گەڵیاندا خزمایەتی بکەن و ئەمڕۆ کە زیاتر لە دووهەزار ساڵ لەو مێژووە تێدەپەڕێت، هەر کەسێك خوێندنێکی لە ڕەگەزناسیدا هەبووبێ، دەتوانێت ئەم راستییە بەباشی ببینێت. ئەگەر ئەسکەندەر بەناوی ئەسکەندەر شا، ناوبراوە، لە لایەن مێژوونوسانی دواییەوە بووە، نەك لە لایەن ئێرانییەکانەوە" گرنگ ئەوەیە کە ئێرانییەکان ئامادە نەبوون کە ئەو بە شا قبوڵ بکەن.

لە ئێراندا پەرتووکێك بە ناوی ئەسکەندەرنامە هەیە کە هەندێك لە نووسەران و مێژوونوسانی ئەم سەدەیە لەو بەڵگە دەگرن و رایان وایە کە ئەم پەرتووکە لە کاتی هاتنی ئەسکەندەر بۆ ناو ئێران نووسراوە و

ئێرانییەکانیش ئەسکەندەریان بەیەکێك لە قارەمانەکانی مێژووی خۆیان لە قەڵەم داوە"

لە کاتێکدا خەت و زمانی پەرتووکەکە دەیسەلمێنێت کە ئەم پەرتووکە لەم سەدەیەدا نووسراوە، واتە کاتیٚ نووسراوە کە بەڵگەکانی رابردوو بە تەواوی فەوتاوە و ئێرانییەکان لە گەڵ یۆنانییەکاندا، هەڵس وکەوتیان نەبووە و ئەسکەندەریان نەناسیوە و نەیانزانیووە ئەو کێیە و لە کوێوە هاتووە و ئەفسانەوێژێك، پەرتووکێکی بەم ناوە نووسیوە و بووەتە هۆی ئەوەی کە هەندێك لە بیرەوەری نووسانی ئەو کاتە وابیر بکەنەوە کە ئێرانییەکان، ئەسکەندەریان تا ئاستی نیوە خواوەندی بەرز کردۆتەوە. بەڵام راستی جیا لەمەیە و، بە جۆرێك کە وتمان، کە کەمینەیەك لە هەر گەلێکدا، وە لە هەر سەدەیەکدا، هەن و بەهۆی پێداویستییەکانی مادی، وەکو مێشێك کە لە شیرنی دەئاڵیٚ، دەوروبەری ئەوانی تر دەگرن. زۆرینەی ئێرانییەکان لە یۆنانیەکان خۆیان دوور دەخستەوە و لە گەڵیاندا نەدەسازان، بەهۆی ئەوەی کە لە بواری شارستانییەتەوە ئەوانیان بە قەرزاری خۆیان دەزانی و خودی یۆنانییەکانیش دوای هاتنیان بۆ ئێران، هەستیان کردبوو کە لە بواری شارستانییەتەوە لە ئێرانییەکان دواکەوتووترن. بەڵام غروری ئەسکەندەر راستییەکی مێژوویەو دوای ئەوەی کە لە ئێران دەرکەوت و چووە ناو وڵاتانی ترەوە وسەیری کرد هەندێك لە گەلان بە جۆرێك بە سەر و باڵای هەڵدەڵێن وەك ئەوەی بوونەوەرێکی نائاساییەبێت.

بەجۆرێك غرور بە سەریدا زاڵ بوو، وا چاوەڕوان بوو کە یۆنانییەکانیش لە بەرامبەریدا سەردانەوێنن" تەنانەت لە یەکێك لە مەجلیسەکانی مەی خواردنەوە، یەکێك لە دۆستە نزیکەکانی خۆی، بە دەستی خۆی کوشت"

چونکە هەڤالی ناوبراو وتبووی: "ئەی ئەسکەندەر تۆ لە بیرت چۆتەوە کە کوڕی فیلیپ و پاشای مەقدوونییەیت و لە بیرت چووەتەوە ئەو کەسانە کە ئەمڕۆ لەم مەجلیسە دان، چەندین جار بۆ سەرکەوتنی تۆ، گیانی خۆیانیان بەخت کردووە"، لەو کاتەدا رووی ئەسکەندەرئەوەندە توند بوو تا ئەو رادەیەی کە هەرکاتێك دەچووە مەجلیسی مەی خواردنەوە، چەکدار، شمشێری لەوێ دوور دەخستەوە، نەکا لە حاڵی مەستیدا، هەڵسێت بە کوشتنی کەسێك.

ئەسکەندەر تۆزێ لای چەپ و ڕاستی خۆی سەیر کرد تا شمشێرەکەی بدۆزێتەوە و ئەو مرۆڤە بکوژێت، شمشێرەکەی نەبینی و بە جارێك لەجێ ڕاپەڕی و ڕمەکەی لە دەستی پاسەوانێك کە لە بەرامبەر ژوورەکەوە پاسەوانی دەکرد، گرت و بەهێزەوە کردیە ناوسکی ئەو پیاوە یۆنانییەدا، و ڕمەکە لە پشتی ئەو پیاوە هاتەوە دەر. ئەو کوژرا و ئەسکەندەر هاواری کردە سەر ئەوانی تر شەراب بخۆنەوە... شەراب بخۆنەوە... من حەز ناکەم لە ئەنجامی ئەو رووداوەدا، سەرخۆشی من تێك بدرێت.

بەڵام هیچ کەس ئارەزووی خواردنەوەی شەرابی نەمابوو و چاوەکان پڕ ببوو لە فرمێسك و بۆ ئەوەی ئەسکەندەر فرمێسکی چاوەکانیان نەبینێت، سەریان دادەخست، ئەسکەندەر دوای خواردنەوەی شەراب لە هەستا و چووە شوێنی خەوەکەی وخەوت و سبەینێ بەیانی کە سەرخۆشی لە سەری دەرچوو، تێگەیشت کە کارێکی ئێجگار پیسی کردووە و نە تەنیا یەکێك لە ئەفسەرە دلێر و وەفادارەکانی خۆی کوشتووە، بەڵکو بووەتە هۆی ئازاری ئەوانی تر و بەڵێنی دا کە ئیتر شەراب نەخواتەوە و ووتی ئەم کارە لە کاتی مەستیدا لە من رووی داوە، بەڵام نەیتوانی بەڵێنی خۆی راگرێت و دیسان شەرابی خواردەوە.

پوختە ئێرانییەکان لە دەوری ئەسکەندەر کۆ نەبوونەوە" تا ئەوەندەی بۆیان دەکرا لە هەڵس وکەوت لە گەڵ ئەسکەندەر و ئەفسەرو سەربازەکانی ئەو، خۆیان دوور دەخستەوە، بەڵام گەلانی تر بە جۆرێك ماستاویان بۆ ئەسکەندەر دەکرد کە ئەوی زیاتر دەکرا، تا ئەو رادەیەی کە لە گەڕانەوە لە رۆژهەڵاتی ئاسیا بەرەو بابل، لە ڕووی یۆنانییەکاندا دەیووت من پێویستیم بە یۆنانی نییە، بەڵکو کۆیلەم دەوێ.

ئەم بابەتە، واتە گۆڕانی رەوشتی ئەسکەندەر بەوەی کە سەرچاوەکەی دەگەڕایەوە بۆ ئێرانییەکان، هەروەها لە بەر ئەوەیە کە مێژوونوسانی رۆمی بەبێ سەرنج دان لە سەر نووسراوەکانی مێژوونووسانی یۆنانی نووسیویانە و ئەگەر ووتەی مێژوونووسانی رۆمی دروست بوایە، بۆ چی دوای سەد ساڵ کە یۆنانییەکان لە ئێراندا بوون، بچوکترین ئاسەوارێك لە شارستانییەت و بڕوا و رەسمەکانیان لە ئێراندا نەمایەوە؟

لە یەکێك لەبەشەکانی رابردوودا ووتمان کە ئەسکەندەر دوای ئەوەی کە چووە ناو ئێرانەوە و سەرکەوت" هەستا بە کەڵك وەرگرتن لە میتۆدی کوورش بۆ دابین کردنی فیدراسیۆن (وڵاتانی یەکگرتوو) لە وڵاتانی ئاسیا و هەروەها ووتمان کە نەیتوانی ئەم مەبەستە بەئەنجام بگەیەنێت. چونکە پەیڕەوی کردن لە سیاسەتی بەڕێوەبەرانە و لە سەر بنەمای بەربڵاوی بۆچوون وەکو سیاسەتی کوورش پێویستی بەوە بوو کە جێبەجێ کەری سیاسەتی ناوبراو، هەمان ئەو سینگ فراوانییەی ئەوەی هەبوایە و دەبوایە دەوریشی بتوانن لە سیاسەتی ئەسکەندەر تێبگەن" لە کاتێکدا ئەوانەی دەوری ئەسکەندەر توانای تێگەیشتنی ئەم سیاسەتەیان نەبوو و ئەوانە خۆیانیان بە فەرمانڕەوا و ئەفسەرانی سوپایەکی سەرکەوتوو

دەزانی و وایان بیر دەکردەوە کە لە گەڵ ئەو وڵاتانە وا لە ژێر دەسەڵاتی ئەواندا هەبووە" دەبوایە وەکو سوپایەکی سەرکەوتوو رەفتار بکەن.

بۆ نموونە ئەسکەندەر فەرمانی دابوو کە لە ناوچەی رۆژئاوای ئێران "فیلاتووس" فەرماندەی "ساخلۆی" یۆنانی لە مەسەلە پەیوەندیدارەکان بە دەزگای کاروباری وڵات لە گەڵ "ساتراپی" ناوچەیی هاودەنگ بێت و دەنگی ئەو لە دەزگای کاروباردا قبوڵ بکات.

لەو کاتەدا کاروانێکی وا لە کاروانە رێیەکانی رۆژئاوای ئێران تێدەپەڕی، کەوتە بەر پەلاماری رێ گرانە و ماڵی ئێرانییەکان بە تاڵان چوو و چەند کەس لەکاروانییەکان کوژران. "ساتراپی" ناوچەیی ئەم رووداوەی بە تاوانی "فیلاتووس" زانی و ووتی ئەو نە ئیزن دەدات کە سەربازە ناوچەیی، جادەکان بپارێزن و نە سەربازە یۆنانییەکان بۆ ئەم کارە تەرخان دەکات و دەڵێت : سەربازە یۆنانییەکان، نۆکەری ئێرانییەکان نین کە بۆ ئەوان جادە بپارێزن.

ئەسکەندەر کاتێ کە دوو ڕاپۆرت، یەکێ لە "فیلاتوس" و ئەوی تر لە ساتراپی ناوچەیی.بە دەست گەیشت و بینی راپۆرتی ساتراپی ناوچەیی راستە، لە کاتێکدا راپۆرتی فیلاتوس نادیارە و لە رستەکانییەوە ئاشکرا دەبێت کە فەرماندەی ساخلۆی یۆنانی ویستویەتی لەم رێیەوە بەرپرسیارێتی لە خۆی بستێنێتەوە.

ئەسکەندەر بۆ لە بەرچاو گرتنی حاڵی فیلاتووس بە دەستەواژەی ئەمڕۆ، فایلەکەی راوەستاند و زۆری نەخایاند کە هەر لەو جادە و بەشێوازێکی هاوشێوە بەکاروانێکی تر کەوتە بەر تاڵان و ئەم جارەش هاواری بازرگانەکان و کاروانییەکان بەرز بویەوە و وتیان ئەم جادە، ساڵانێك هێمن بووە و هێرشی رێ گری لەسەر کاروانەکان لەوێ نەکراوە.

مەبەستی كاروانییەكان و بازرگانەكان ئەمە بوو كە رابگەیەنن یۆنانییەكان لەو رووداوە بێ ئاگا نین.

ئەم جارە كاتێ ئەسكەندەر لە فیلاتووس داوای ڕوونەكردنەوەی كرد، ئەو تێكچوو و لە وەڵامی ئەسكەندەردا ئەم نامەیەی نووسی

"ئایا ئێمە فەرمانڕەوای ئەم مانەین، یان بە كۆیلەی ئەوان دەژمێردرێین" و فیلاتووس كە ئەم وەڵامەی بۆ ئەسكەندەر نووسی، بە یەكێك لە رۆشنبیرانی یۆنانی دەناسرا و لە ناو ئەفسەرە یۆنانییەكاندا، لە هەموویان زیاتر هۆش و ئاگای هەبوو.

ئێستا سەیر بكەن كە شێوازی بیری ئەوانی تر لەم بارەیەوە چۆن بووە.

بەماوەی دوو حەوتە دوای ئەم رووداوە ئەسكەندەر فەرمانی دا كە تەرمی داریووشی سێهەم بەڕێ و رەسمی شاهانەوە، لە ئێرانشار بنێژرێ و بۆ ئەوەی كە رێ و رەسمی ئامادە پێكراو بە پێی رێ و رەسمی دێرین ببێ، فەرمانی دا كە هەموو ساتراپەكانی ئێران لە ئێرانشار كۆ ببنەوە.

دوای ئەوەی كە بەرپرسانی خێڵەكانی ئێران وا لەم شارەدا كۆ بوونەوە، ئەسكەندەر نامەیەكی نارد بۆ دایكی داریووشی سێهەم كە لە هەك ماتانا (هەمەدان) بوو و ووتی : لە گەڵ كوڕەكەی داریووشی سێهەمدا وەرن.

ئەم كوڕە تا ئەو كاتە لە لای دایە گەورەی دەژیا و دوایی ئەسكەندەر ئەوی لە دایەگەورەی گرت و هێنایە لای خۆی بە ووتەی مێژوونووسانی یۆنانی دەستی بە فێركردن و راهێنانی كرد.

هەندێك باوەڕیان وایە كە مەبەستی ئەسكەندەر لەوەی كە كوڕەكەی داریووشی سێهەمی هێناوەتە لای خۆی، ئەوە بووە كە ئەو كوڕە لە سەر بنەمای یۆنانییەكان رابێت و رەگەز و بنەماڵەی خۆی لە بیر بباتەوە.

رۆژێك كە تەرمی داریووشی سێهەمیان دەناشت، ئەسکەندەر لە گەڵ دایکی داریووش و کوڕەکەی ئەو، لە پێشەوە سەرانی خێڵەکان و ساتراپەکانی ئێران لە دواوە دەهاتن و کەوتبوونە شوێنی تەرمەکەی داریووشی سێهەم.

تەرمەکە لە سەر کالیسکەیەك دانرابوو کە چوار ئەسپی ڕەش دەیانکێشا و تاقمێك لە سازژەنەکانی ئێرانی بە پێی ڕێ و ڕەسمی ئێرانییەکان، ئاهەنگی ئازایەتیان لێدەدا.

دووکەس کە جلی ڕەشیان لە بەردا بوو، لەم لاو و لەولای ئەسپەکانەوە لەغاوەکانیان گرتبوو تا گەیشتنە سەر گۆڕستان" دایکی داریووشی سێهەم، تەرمەکەی لە تەنیشتی گۆڕەکەی کوورش ناشت. ئەمڕۆ لە شوێنی گۆڕی ناوبراو، ئاسەوارێك نەماوە و دوایی ئەسکەندەر بە هۆی وەرگێڕێکەوە بە کوڕەکەی داریووشی ووت : لێرەدا سوێند دەخۆم بە خواکان کە باوکی تۆمان نەکوشتووە و باوکی ئێوە بەدەستی ساتراپێکی ئێرانی کوژراوە.

کوڕ لە وەڵامدا ووتی : ئەم بابەتە دەزانم.

ئەسکەندەر وەڵامی دایەوە : لەم بارەیەوە ڕقێکتان لە من نەبێت.

کوڕ ووتی : نا.

ئەو کاتە ئەسکەندەر گەڕایەوە و لە کۆشکی ئێرانشاردا ماوەی سی و شەش کاتژمێر کاتی خۆی بۆ خواردنەوەی شەراب و خەوتن تەرخان کرد. نە لە بەر ئەوەی کە لە ڕووداوی ناشتنی داریووشی سێهەم خۆشحاڵ بووە" بەڵکو چونکە لەم بارەیەوە خەمبار بووە و بە سەقامگیر نەبوونی ڕۆژگار خەفەتی خواردوە و بە هاوڕێیانی ووتوە : ئەم پیاوە وا لە تەنیشتی گۆڕەکەی کوورش نێژراوە، باپیرانێکی هەبووە کە لە چەند

سەدەی لەمەو پێشەوە لەم وڵاتەدا حکومیان کردووە و ئێستا ببینن کە ئێمە چیمان بەسەردا دێ و ئێمە لە کوێ دەنێژن.

دەتووت لەو رۆژەدا بە ئەسکەندەر راگەیەنرابوو کە ئەو دوای مردن، چارەنووسێکی سەرسوڕهێنەری دەبێت. چونکە دوای ئەوەی کە ئەسکەندەر ژیانی خۆی لە بابلدا تەواو کرد، ماوەیەك لە بارەی ناشتنیەوە، لە ناو جێگرەکانیدا ناکۆکی هاتە ئاراوە. هەندێك وتیان کە دەبوایە لە بابل بنێژرێت و هەندێك ووتیان کە دەبێ لە ئێرانشار بنێژرێت، بەڵام هیچ کام لەم دوو رایەیان قبوڵ نەکرد.

دوایی ووتیان کە لە مەقدوونیە بینێژن، بەڵام ئەم رایەش قبوڵ نەبوو و لە دواییدا، ئەسکەندەریان لە ئەسکەندەرییە ناشت کە شارێك بوو بە ئامرازی خودی خۆی لە میسردا دروست کرابوو.

گۆڕانی رەوشتی ئەسکەندەر کە دواییەکانی گەیشتە ئاستی درەندەیی، هەر لەم کاتەوە دەست پێدەکات.

ئەسکەندەر پێش ئەوەی کە بەرەو زەمینەکانی رۆژهەڵات و هیندستان بڕوات، بە هۆیئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە ژنە جوانەکان لە یۆنان و بابلەوە بۆ ئێران هاتبوون، کاتی خۆیانیان بە ڕابواردن و سەرخۆشی بە سەر دەبرد.

وە زۆر جار رووی داوە کە ماوەی چەند شەو و رۆژ، لە حاڵەتی مەستیدا دەمایەوە و کەسێك نەیدەتوانی لەم ماوەیەدا نزیکی ببێتەوە و لە گەڵیا قسە بکات. تەنانەت نزیکترین مەحرەمەکانی ئەو زاتیان نەدەکرد لەم جۆرە کاتانەدا، لە بارەی کاروباری وڵاتەوە قسە بکەن.

لە رۆحیەی ئەم پیاوەدا دژایەتیەکی سەرسوڕهێنەر بینراوە، هەندێك جار، ئەسکەندەر ئەوەندە دڵ ناسك و دادوەر دەبوو کە وات بیر دەکردەوە

كە بە سۆزترین و دادوەرترین پیاوە و هەندێ جاریش وەها توڕەیی و ڕەفتاری خراپ بە سەریدا زاڵ دەبوو كە كەسێك زاتی نەدەكرد تەنانەت ووشەیەك لە گەڵیدا قسە بكات. سەرچاوەی ئەم دژ و دژایەتی ڕەوشتییەیان لە لاوێتی ئەسكەندەر و بێ ئەزموونی ئەو زانیوە و لەوانەیە بەم جۆرە بێت.

چونكە پیاوێكی گەنج كە هێشتا نەگەیشتۆتە بیست و سێ ساڵی، كاتێ خۆی بە خاوەنی دنیای دێرین ببینێت و مامۆستایانی گەورەی خۆی لێوە دوور بن، لەوانەیە كە خۆی لەبیر بچێتەوە.

ڕەوشتی یۆنانییەكانی دێرینیش لە هەندێ لایەنەوە و بەتایبەت لە مەسەلەكانی پەیوەست بە دەروون و ڕەوشت زۆر باش نەبووە و هەركات خودی ئەسكەندەر تێدەكۆشا كە لە شتی خراپ دوورەپەرێزی بكات، ئەفسەرەكانی، ئامرازی ئەم كارەیان بۆ ئەو دابین دەكرد هەتاوەكو خۆیان ئازادی سەرخۆشی و خواردنەوەیان هەبێت. ئەسكەندەر هەندێ جار دەهاتەوە سەرخۆ و ڕاهێنانی ئەرستۆی بیر دەهاتەوە و هەوڵی دەدا كە پیاوێكی جیدی و بەئیرادە بێت" بەڵام ئەم حاڵەتە زیاتر لە یەك دوو حەوتەی نەدەخایاند، دەبووە هۆی ئەوە كە ئەسكەندەر خۆی دەسپاردەوە سەرخۆشی و خواردنەوە.

***

# کردارە نامرۆییەکانی ئەسکەندەر

لە ناوچەیەکی دوای دەربازبوون لە دەروازەی خەزەر، کاروانەڕێیەك هەبوو کە بەرەو باکوور دەڕۆیشت. ئەسکەندەر و سەربازەکانی بیستبوویان کە لە لای باکوورەوە ناوچەیەك هەیە کە زۆر درەختی تێدایە" لەوێدا مانگای گەورە و پڵنگ و شێر دەبینرێت (هێشتا ئەسکەندەر بۆ راوی شێر نەچووبوو بۆ باکووری ئێران)" ئەسکەندەر و سەربازانی ئەم کاروانەڕێیەیان گرتە بەر تا گەیشتنە شارێك کە یۆنانییەکان ناوی "زادراکارتا" یان ئەستەرئاوای ئێستایان لێ نابوو. دانیشتوانی ئەو شارە تا ئەو رۆژە نەتەنیا سوپای یۆنانی، بەڵکو قەت سوپایان نەبینیبوو و دەیانوت کە لێرەدا هەرگیز شەڕ رووی نەداوە و لە بینینی یۆنانییەکان زۆر سەریان سوڕما.

سەوزەڵانی زەوی ناوبراو، سەرنجی یۆنانییەکانی زۆر راکێشا، چونکە سەیریان کرد کە هاوشێوەی زەوییەکانی ئەورووپایە" بەڵام ئەوانەی وا لە گەڵ ئەسکەندەردا بوون، ووتیان کە ئەم خاکە بۆ کشت وکاڵ و پەروەردەی درەختی تری زۆر بەپیتە.

ئەسکەندەر و هاوڕێیەکانی، ماوەیەك لە"زادکارتا" مانەوە و بەرەو رۆژئاوا و باشوور رۆیشتن وزەمینەکانی مازەندەرانی ئێستایان پێوا.

دانیشتوانی ئەم ناوچەیە ئەوەندە سادە بوون کە هەر یەکەم رۆژ وا ئەسکەندەر گەیشتە "زادکارتا"، ئەسپە رەشەکەی کە بە "بۆسفال"

دەناسرا، گرتیان و بردیان. ئەسکەندەر بیستی کە ئەسپەکەی لە لایەن دانیشتوانی ناوچەکەوە بردراوە، پەیامی نارد کە ئەسپەکەم بدەنەوە. دانیشتوانی ناوچەکە زۆر ئاسایی وتیان : ئەسپەکەتان هاتووەتە لە وەرگەی ئێمە و هەر لەم رووەوە هی ئێمەیە و هەر چەند ناردراوەکانی ئەسکەندەر بە دانیشتوانی ناوچەکەی ووت: کە ئەسکەندەر پاشای مەقدوونییەیە و ئاوەها وئاوایە، گوێیان نەدایە و دەیانوت: ئەسپێك کە بەپێی خۆی هاتووەتە ناو لەوەرگەی ئێمە، چۆن بیدەینەوە.

ئەسکەندەر هەڕەشەی کرد کە ئەگەر ئەسپەکەم نەدەنەوە، خانووەکانتان ئاگر دەدەم، بەوە هەڕەشەکاری خۆی کرد و ئەوانیش "بوسفالّ" یان دایەوە. لەوێدا ئەسکەندەر چاوی بە دیوارێکی بەرز و درێژ کەوت کە لە دەشتەوە دیار بوو و پرسیاری کرد ئەم دیوارە بۆ دروست بووە" وەلامیان دایەوە کە ئەم دیوارە کوورش و داریووشی شاهەنشای ئێران پێکەوە دروستیان کردووە، تا ئەو خێڵانە وا لەوبەری دیوارەکەن و لە دەشت دەژین، ئازاری دانیشتوانی ئەم ناوچەیە نەدەن.

ئەمانە خێڵی ناسراو بە تورکەمەنن کە ئاشکرا نییە ناویان لە کاتی ئەسکەندەردا چ بووە، بەلام دوایی زۆر بوونە مایەی ئازاری ئێرانییەکان و جارجار هێرشیان دەکردە سەر خاکی ئێران و دەبوونە هۆی ئازاردانی ئێرانییەکان و تەنیا کاتێك کە خاوەنی شای بە توانا بوو، ئەمانە زاتیان نەدەکرد هێرش بکەنە سەر خاکی ئێران و ئازاردانەکانیان تا ئەم دواییانەش درێژەی هەبوو، ماوەی سی سالّ کە هێزی حکومەتی ناوەندی ئێران سەقامگیر بوو و خاوەنی سوپایەکی رێك و پێکبوو، ئەوانە لە دەستێوەردان لە خاکی ئێران دەستیان هەلّگرت.

ئەسکەندەر لە ئێرانییەکان پرسیاری کرد کە ئەوبەری دیوارەکە چییە؟ بەڵام کەسێك نەیتوانی وەڵام بداتەوە. چونکە هیچ کەس نەیدەزانی کە بارودۆخی جوغرافی ئەو بەری دیوارەکە چۆنە، چونکە کەسێك نەچووبووە ئەوبەری دیوارەکەوە.

ئەسکەندەر هەندێك لە جوغرافی ناسان و ئەندامی کۆلێجی ئەو کاتەی یۆنانی هێنا بۆ ئێران تا نەخشەکانی جوغرافیایی راست بکەنەوە. چونکە هەرکات سەرخۆشی و خواردنەوە ئیزنی بدایە، ئەسکەندەر دەکەوتە بیری ئەوانەو چونکە خۆی لاوێکی زانا بوو، بۆ زانست، رێزی دادەنا.

زانایانێ کە لە یۆنانەوە هاتبوونە ئێران، نە تەنیا نەخشەکانی جوغرافیاییان راست کردەوە، بەڵکو بەشێك لەو درەخت و گیایانی کە لە یۆناندا نەبوون، لە ئێران ناسیان و هەندێك لەوانەیان برد بۆ یۆنان.

یەکێ لەو گیاگەلە "تربانتینێ" بوو کە لە یۆناندا نەبوو، بەڵام لە ئێراندا هەبوو و یۆنانییەکان بینیان کە لەم گیایە جەوهەرێکی بۆنخۆش دروست دەبێت.

گیایەکی تر وا لە ئێرانەوە بردیان، ناوی "کەتیرا" بوو" وە هەروەها گیایەکی تریان لە ئێران پەیدا کرد کە ناوی "ئازافوتیدا" یان لە سەری دانا و لە زمانی فارسیدا ئەو گیایە، بە "ئەنقووزە" ناو دەبرێ و لە قەد، یان ریشەی ئەو گیایە، مادەیەك بەدەست دێ کە دەڵێن فایدەی پزیشکی هەیە.

یەکێکی تر لەو گیایانە لە کە لە ئێران کەوتە دەستی یۆنانیەکان و ئەویان بردە وڵاتی خۆیان، "گەز"بوو" گەز جۆرە گیایەکە، کە لەو مادەیەکی شیرین و بۆنخۆشیان دەگرت وەکو شیرینی هەنگوین.

کاهووەکـانی ئێـران یـەکێکی تـر لـەو گیایانـەبوو کـە زۆر سـەرنجی یۆنانییەکانی راکێشا، لەوانە "کاهوو" ە پێچە جۆراوجۆرەکانی ئێستا لە ئەوروپا دەبینرێت، بە هۆی یۆنانییەکانەوە لە ئێرانەوە بردرابوو.

ئەسـکەندەر رۆژێـك لـە"ئەسـتەرئاوا" بـینی کـە یـەکێ لـە دانیـشتوانی ناوچـەکە، دوو بـاڵی سـپی داناوەتـە سـەر کڵاوەکـەی خـۆی و ئـەم بابەتـە ئـەوەی خـستەوە بـیر کـە دووبـاڵ لـە مەلـە سـپییەکانی دەریـایی لـە سـەر کڵاوەکەی خۆی دابنێ و ئـەم دوو بـاڵی مەلـە لـە داهـاتوودا بـووە دروشمـی تایبـەتی ئەسکەندەر و هەنـدێك لـە وێنـە کێشەکان، ئـەویان بـەم کـڵاوەوە نەخشاندبوو. لەوێوە ئەسکەندەر بڕیاری دا کە بەرەو رۆژهـەڵات بڕوات و لـە درێـژایی ئـەو زنجـیرە کێوانـە کـە بـەرەو رۆژهـەڵات دەڕۆیـشت، رێـی خوراسانی ئێستای گرتە بەر. بەڵام لەم رووەوە کە کاتی رۆیشتن درەنگ و کاتی پاییز بوو، لە زستانی ساڵی ٣٣٠- ٣٢٩ ی پێش زایین گەیشتنە ناوچەیەك کە کەوتبووە بەرزاییەکانی چیاوە و ماوەی دوو حەوتە ناچار مان کە لە لووتکەی کێوکەدا بمێننەوە.

لـەم دوو حـەوتەیـەدا لـەوێ، خواردنێـك جگـە لـە پـەنیری مـەڕ و گۆشـتی هێستر، کە خودی سەربازەکانی ئەسـکەندەر سـەریان دەبڕی، خـواردنێکی تریان نەبوو.

هەنـدێك لـە بـیرەوەری نووسـەکان نووسـیویانە لـەو ناوچـەیەی کـە ئەسـکەندەر دوو حەوتـە ماوەتـەوە و بـارینی بـەفر بووەتـە کۆسـپی دەربـازبوونی، "دەماوەنـد"[1]ە. لـە کاتێکـدا وا نییـە" چونکە دەماوەنـد لـە رۆژئـاوای ئەسـتەر ئاوایـە نزیکـەی بـاکووری رۆژهـەڵاتی تـارانی ئێـستا و

(1) "دەماوەند" کێوێکی بەرزە لەباکووری رۆژهەڵاتی شاری تاران لەئێران کە تەنانەت هاوینانیش بەفر سەری داپۆشیوە و خەڵك بەیانیانی رۆژی هەینی دەچن بۆ سەیران و شاخەوانی. وەرگێڕی کوردی.

خەتی گەڕانی ئەسکەندەر کە دەوراندەور بە درێژایی رۆژهەڵات گرتوویەتە پێش، نیشان دەدات کە ئەو لە خاکی خوراسان کە کەوتووەتە دۆڵی کێوەکانی باکووری خوراسان، رێگای پێواوە.

من (واتە هارولد لەمپی ئەمریکایی نووسەری ئەم پەرتووکە – وەرگێڕ) وای بۆ دەچم کە ئەم کێوە کە ئەسکەندەر و سەربازەکانی ماوەی دوو حەوتە لە یەکێ لە لووتکەکانیدا تووشی بەفر بوون و نەیانتوانی بچنە پێشەوە و لە گۆشتی هێستر و پەنیری مەڕی مەڕداران کە لە چیا دەژیان، کەڵکیان وەرگرت، لە رۆژهەڵاتی خوراسانی ئێستا و لەوانەیە لە سنووری ئەفغانستانی ئەمڕۆدا بووبێ.

چەند کۆشکێك کە لە سەر ئەم کێوە بوو، بۆ نیشتەجێ بوونی سەربازەکانی ئەسکەندەر بەس بوو. بەڵام ئەوانە چادریان هەبووە و دەیانتوانی لە ناو چادرەکەدا بژین.

شوانەکان و ماڵتدارەکان پێیان وتن کە لە ژێر بەفرەکە، گیا و چێوی وشك زۆر دەست دەکەوێت و جۆرە چێوێك بە ناوی درەختی بادامی کێوی لەم ناوچەیەدا هەیە کە چێوەکەی گڕێکی زۆری هەیە و کاتێ دەبێتە خەڵوز، خەڵوزەکەشی زۆر دەمێنێتەوە. وە سەربازانی ئەسکەندەر، بە رێنمایی شوانەکان، بەفرەکانیان لادا، و لەو چێوەیان بەدەست دەهێنا و ئاگریان دەدا و خۆیانیان لە سەرما دەپاراست.

لە شەودا، کاتێ کە مانگ لە پشت لووتکەکانەوە سەری دەردێنا، سەربازەکانی ئەسکەندەر کە گوماناوی و خەیاڵ پەرست بوون، دەیانوت کە خواوەندی ئێمە هاتووە تا ئێمە لێرەدا تەنیا نەهێڵێت و بە ئێمە بڵێت کە چاوی لێمانە و ئامادەیە شەوەکانمان روون بکاتەوە.

هەندێك لەوانە لە شوانەكان پرسیاریان دەكرد كە ئایا ئێرە كۆتایی دنیایە؟

شوانەكان دەیانووت نا و بە پەنجە بەرەو رۆژهەڵات و باكوور ئاماژەیان دەكرد و دەیانووت : لەوێدا... و لەوێدا... شارگەلی گەورە و ئەسپ گەلی زۆر و رانە مەڕی فراوان و مەزرای بەربڵاو لە وەرزی بەهار و هاویندا هەیە.

یەكێ لەو شتانە كە سەربازەكانی ئەسكەندەری واق بردوو كرد، ئەو سەگە بە هێزان بوون كە شوانەكان هەیانبوو و ئەو سەگانە نەیاندەتوانی لە گەڵ بۆنی سەربازانی یۆنانی رابێن و بە هیچ فێڵێك فێری دەستی سەربازانی ئەسكەندەر نەدەبوون، لەم رووەوە خاوەن سەگەكان، رۆژ و شەو ئەوانەیان دەبەستەوە تا پەلاماری سەربازەكانی ئەسكەندەر نەدەن.

بەفر توایەوە و ئەسكەندەر و هاوڕێكانی توانیان بكەونە ڕێ و لە ناوچەیەكی كوێستانییەوە، بەرەو رۆژهەڵات رۆشتن. بەڵام هەر كە رێپێوانی ئەوان دەست پێكرا، تووشی پەلامارێكی توند بوون، بەبێ ئەوەی كە بتوانن و بزانن چ كەسانێك پەلاماریانی داوە.

یۆنانییە خورافە پەرستەكان كە دەیانبینی دوژمنێك هەیە، وا بیریان دەكردەوە، شەوە، یان گیانی نیوە خواكان كە باوەڕیان پێ هەبوو، پەلاماریان دەدەن.

كاتێ پاسەوانەكانیان لە ناو رێیەكاندا دادەنا كە هاتووچۆیان بپارێزێت، لە پڕدا پاسەوانەكان لە ناو دەچوون و كاتێ دەیانویست بزانن چ كەسانێك ئەوانەیان كوشتووە، سەیریان دەكرد كە هیچ كەس لە چەپ و راست و دواوە و پێشەوەی كاروانەڕێیەكانی كوێستانی دیار نییە. ئەو هێرشانە، یۆنانییەكانی زۆر پەرێشان كردبوو. چونكە تا ئەو كاتە

واراهاتبوون لەو ناوچانە و لە دەربازبووندا مەترسییەك رووبەڕوویان نەبێتەوە.

دوو کەس لە بیرەوەری نووسان کە لە گەڵ سوپای ئەسکەندەردا بوون، یەکێك بە ناوی"بالئێتۆن"و ئەوی تر بە ناوی "هوك نێستن"، باسی ئەم شەڕ و ڕاکردنانەیان بە تەواوی نووسیوە.

یۆنانییەکان هەر چۆنێك بوو زانیان، ئەو هێرشانە کە دەکرێتە سەریان، لە لایەن خێڵە شاخاوییەکانەوەیە. چونکە ئەو خێڵانە لەوانەیە قەت ژێردەستەی کەسی نەبووبن، نەیانتوانیوە کە زاڵ بوونی یۆنانییەکان بە سەریاندا قبوڵ بکەن.

"بالئێتۆن"، یەکێك لە مێژوونوسانی ئەسکەندەر دەڵێت : ئەو کێوانە کە ئێمە لەوێوە دەرباز دەبووین تا شاری "رەی"، دوایین شاری گەورەی ئێران کە ئێمە لەویّ تێپەڕ بووین، هەزار میل ماوەی بوو. لە هەندێك لە ناوچەکاندا، زمانی خێڵە ناوچەییەکان ئەوەندە دژوار بوو کە تەنانەت بە هۆی وەرگێڕیشەوە نەماندەتوانی زمانی ئەوانە تێبگەین و ئەوانە پیاو گەلێك بوون بالا بەرز و چوارشانە لە رەگەزی ئاریایی و هەر کە کە دەیانزانی کە ئێمە نزیك بووینەتەوە، بنەماڵە و هەر شتێکیان ببوایا، هەڵیان دەگرت و کۆچیان دەکرد و ئەو کاتە لە رێی شەڕی پارتیزانی و چالاکی خێراو ئێمەیان تەنگاو دەکرد

ئەسکەندەر چەند جار ویستی لەو خێڵانە ناوبراو داوا بکات کە لە رێی ئاشتییەوە بێنە پێشەوە، بەڵام لەوەدا سەر نەکەوتن کە لە گەڵیاندا دانیشتنیان هەبێت. بۆیە هەرگیز روی نەدا کە بتوانێت هەندێك لە کاربەدەستانی ئەو خێڵانە لە شوێنێکدا کۆ بکاتەوە.

جگە لەوە ژمارەی لێپرسراوانی خێڵەکان، یەکێك و دووان نەبوو تا ئەسکەندەر بتوانێت لە گەڵیاندا دابنیشێت. دەتووت هەر کێوێك خێڵێکی لێیە و هەر خێڵێکیش لە گەڵ خێڵەکانی دەوروبەریدا جیاوازە و لە خوویەکی تایبەت پەیڕەوی ناکەن. بیروڕایان جیاواز بوو" هەندێك خۆر و مانگ و ئەستێرەکان و بڕێك لە زیندەوەرانی دەشت و هەندێکیش، ڕێزیان لە بەردەکانی چیا دەگرت.

بەڵام هەموویان لە لایەکەوە هاوشێوە بوون و ئەوەش ئەوە بوو کە نەچنە ژێر دەسەڵاتی بێگانە. هەر لەم کێوانە بوو کە ئەسکەندەر یەکێك لە ساتراپەکان واتە یەکێك لەو دوو فەرمانڕەوایەی کوشت وا لە کوشتنی داریووشی سێهەم دا بەشدار بوون.

بەڵام دوایی وای بیر کردەوە کە بکوژی داریووشی سێهەم، یەك کەسە" دوای ئەوەی کە لێکۆڵینەوەی لە سەر کرد، ئاشکرا بوو کە داریووشی سێهەم، بەدەست دوو ساتراپ کوژراوە، بەڵام یەکێك لەوانە ون بووە.

ئەسکەندەر لە ساتراپی ناوبراو پرسیاری کرد کە بۆچی داریووشی سێهەمت کوشتووە؟ ئەویش لە وەڵامدا ووتی :یەکەم من لەم تاوانە بەتەنیا بووم دووەم من لەم کارەدا ویستوومە کە خزمەتێك بە تۆ بگەیەنم و تۆش دەبێ لەمە قایل بیت ئەسکەندەریش پێی ووت چۆن چاوەڕێ دەکەی کە من لە خزمەتی کەسێك رازی بم کە خیانەتی لە پاشای خۆی کردوە ئەنجا ڕایگەیاند : چونکە هاوبەشی تاوانەکەت دیار نییە من تۆ ناکوژم بەڵام ناتوانم لەسزادانی تۆ چاوپۆشی بکەم و ئەو کاتە فەرمانی دا کە لە سەر شانەکانی ساتراپی ناوبراو، نیرە گا دابنێن، ماوەیەك نیرەکە لە سەر شانی بوو، بەڵام نەمرد تا کاتێك کە هاوبەشی تاوانەکەی کرا دەستگیر بوو. ئەو کاتە هێزەکانی ئەسکەندەر گەیشتنە رووبارێك کە ڕێنماکان

ووتیان، ناوی ئەو رووبارە "پەرەندەگان"ە واتە "مەلەکان" و ووتیان ئەم رووبارە بەرەو (ام البلاد) "دایکی وڵاتەکان دەڕوا" واتە دەڕژایە شاری "مەروو"

ئەسکەندەر ماوەیەك لە دۆڵەکانی رووباری ناوبراو رێپێوانی کرد، بەڵام گەیشتە ناوچەیەك کە کێوەکان بەرزتر و هەوا ساردتر دەبوو و جارێك بەفر دەبووە کۆسپی چونە پێشی سەربازان. لەو کێوانەی وا رووباری "پەرەندەگان" دەڕژایە خوار، نە خواردن دەست دەکەوت- نە ئالف بۆ ئەسپەکان" لەم رووەوە ئەسکەندەر خۆی بەناچار زانی کە لەدرێژایی باکوورەوە بگەڕێتەوە و رێگای باشوور بگرێتە بەر کە رەنگە بتوانێت لە لای باشوورەوە بۆ سەربازەکانی خواردن و بۆ ئاژەڵی، تفاق بە دەست بێنێت.

بەڵام تەنانەت رۆیشتن بەرەو باکووریش کارێکی ئاسایی نەدەهاتە بەرچاو ئەویش ناچار بوو ناوچە بەناوچە پێش بڕوا و لە هەر ناوچەیەك، خێڵەکان لە دەشتەکان بەرەو کێوە بەرزەکان بداتە بەر تاکو ئەیاڵەتەکان داگیر بکات و شارەکان بکاتە ناوەندی بڕیارگا و بە ووتەی مێژوونووسانی یۆنانی کە لە گەڵیدا بوونە، لەوانەدا کۆچەرەکان نیشتەجێ بکات.

کۆچەرەکان لە سەر ووتەی مێژوونووسانی یۆنانی، بریتی بوون لە سەربازە نەخۆشەکان کە نەیاندەتوانی پێ بە پێی سوپا بجوڵێن، هەروەها ئەو بازرگانانە کە لە دواوەی سوپاوە دەهاتن تا ئەوەی کە بتوانن کاڵاکانیان بفرۆشن.

کاتێ لە خەڵك پرسیاریان دەکرد ئایا ئەو ناوچە هەرگیز خاوەنی ئاسایش و مەرکەزییەت بووە. یۆنانییەکان وەڵامیان دەدانەوە کە تەنیا لە زەمانی کوورشی گەورە بنیاتنەری هەخامەنشیەکان، ئەو ناوچەیە

خاوەنی مەرکەزییەت بووە و تەنانەت خودی کورش -یش لەو شەڕانە کە لــە گــەڵ خێڵــە کوێــستانیەکانی رۆژهــەڵات و بــاکووری رووبــاری "پەرەندەگان" کردی، کوژرا، "ئەشکە نازیەکان"، یان "سیت"ەکان ئەویان کوشت، وەکو باسی لێوە دەکرێت "ئەشکە نازییەکان" هەر ئەوانە بوون کە لە دواییەکاندا بە ناوی "ئەشکانیان" دەناسرێن.

ئەمە دەبێ بزانرێت کە ئەسکەندەر هەر ئەو جۆرە کە هەوڵی دا لە شێوازی کــوورش بــۆ دروســت کردنــی وڵاتــانی یــەکگرتووی ئاســیا چاولێکەری بکات، هەوڵی دا وەکو کوورش، خۆی بگەیەنێتە سنووری رۆژهــەڵات و بــاکووری ئێرانــی دێرین. بەڵام دیسان دەڵێن کە هێمنی و بیرکردنەوەی چاك کە کوورش خاوەنی بوو، لە ئەسکەندەردا نەبوو.

مێژوونوسانێك کە لە گەڵیدا بوونە، دەڵێن کە ئەو لە سەرجەم ئاسیادا هەفتا شاری دروست کرد کە بەشێك لەوانە هەر لەم ناوچانەی کە وا لە شاری رەی هەزار میل دوور بوون، دروستی کردووە.

ئەو ئەم شارانەی بە چاولێکەری لە شارەکانی "ئاسینا" و "ئیسپارت" دروســت کــردووە و تەنانــەت نــاوی "ئاســینا" و "ئیــسپارت" ی لەســەر هەندێکیان داناوە" بەڵام دوای ئەو، ئاسەواری بە شێوەیەك لە ناوچوو کە ئێمە ئیتر لە رۆژهەڵاتی ئێران، رووبەڕووی وڵاتانێك بە ناوی "ئاسینا" و "ئیسپارت"نابینەوە و رەنگە هەندێك لەو شارانە کە ئەسکەندەر دروستی کرد و لەوانەدا کۆچەری دانا، لە سەدەکانی تردا ناوی گۆڕدرا" لێوە ئەمڕۆ ئێمە ناتوانین بزانین کام یەك لەو شارانە کە ئێستا لە رۆژهەڵاتی ئێرانە، لە دێرین، بە ناوی "ئاسینا" و "ئیسپارت" دەناسران.

ئەسکەندەر کاتێ کە بەرەو باشوور دەڕۆیشت، گەیشتە ناوچەیەك کە شارێك بەناوی هەراتی "هەرات" لەوێدا بوو و یەکێك لە شارەکانی ناسراو

بە "ئەسکەندەرییە" ی لەم شوێنە کردەوە و سەربازەکانی بێ توانا و فرۆشیارانی لەوێ دانا و دیوارێکی کێشا بە دەوری شاردا تا، ببێتە ئامرازی بەرگری شار. ئەو کاتە بۆ دابین کردنی تفاق بەرەو باشوور رۆیشت. چونکە بیستبووی کە لە باشوور زرێوارێك هەیە ناسراو بە "هیل مەند"، کە لە دەوروبەریدا، لە وەرگەی سرووشتی گەورە بوونی هەیە و هەندێك خێڵی کۆچەر لەو مەزرایە لە خەریکی لەوەڕاندنن، بە جۆرێك کە ئەگەر ئاژەڵەکانی سوپا لەم لە وەرگانەدا بەرەڵڵا بکەیت، قەڵەو دەبنەوە.

ئەسکەندەر کاتێ کە گەیشتە لەوەرگەکانی دەوروبەری زرێواری "هیل مەند"، لە لەوەرگە گەورەکان و خۆراکی فراوان خۆشحاڵ بوو، لەو کاتە بەدواوە تا ماوەی دوو ساڵ کاری ئەوە بوو کە لەم ناوچەیەوە بۆ ناوچە کوێستانییەکانی باکوور دەرۆیشت تا خێڵەکان بخاتە ژێر دەستی خۆی. کاتێ وا لە باری خواردن و تفاقەوە خۆی لە تەنگانەدا دەبینی، دەگەڕایەوە ئەم ناوچەیە.

ئەم شوێنە نابێت لە گەڵ هیندستان کە دوایی ئەسکەندەر بۆ ئەوەێ سەفەری کرد، تێکەڵ بکرێت چونکە ناوچەی ناوبراو بە بەشێك لە خاکی ئێران دەژمێردرا" ئەمڕۆش دەوروبەری زرێواری هیل مەند، یان هیرمەند، بەشێك لە خاکی ئێرانە، بەڵام کە سەفەرم کردووە بۆ ئەوێ، شوێنی مێرگوزارە گەورە کۆنەکانم نەبینی (ئەمە نووسەری پەرتووکەکە، هارولد لەمب، دەڵێت).

هۆکاری ئەمەیە کە زرێواری ناوبراو وا لە ئاوی رووباری هیل مەند، یان هیرمەند هاتووەتە ئاراوە، بە نتێپەڕ بوونی کات، زۆر بچووك بووەتەوە و لە رابردوودا، ئاوی رووباری هیرمەندیش، زیاتر لە ئەمڕۆ بووە.

ئەرستۆ مامۆستای ئەسکەندەر بە جۆرێك کە لە یەکێك لە لاپەڕەکانی پێشوو ئاماژەمان پێکرد، برازاکەی خۆی ناسراو بە "کالیس تنێس" ی لە گەڵ نامەیەکدا نارد بۆ ئەسکەندەر لە ئێران.

کالیس تنێس، لە گەڵ یەکێك لە دۆستانی فەیلەسوفی خۆی، بە ناوی "ئاناخارکوس"، هاتە ئێران.

ئەو نامە کە ئەرستۆ بۆ ئەسکەندەری نووسی، نامەیەکی زانستی بوو کە تێیدا باسی ئەودیوی سرووشت دەکرا و یۆنانییەکان ئەودیوی سرووشتیان بەناوی "میتا فیزیك" ناو دەبرد و لەوانەیە خوێنەران بیستبێتیان کە ئەرستۆ لەدوو زانست شارەزا بوو، یەکێك لە "فیزیك" واتە زانستەکانی سرووشت و ئەوی تر لە "میتا فیزیك" واتە زانستەکانی ئەودیوی سرووشت.

مەبەست لە زانستە سرووشتییەکان کە ئەرستۆ لەوەدا مامۆستا بوو، بریتی لەزانستی فیزیك (واتە زانستی کەرەستە) و زانستی کیمیا واتە تایبەتمەندی دەروونی کەرەستە و زیندەوەرناسی و گیاناسی و زەوی ناسی و ... هتد. مەبەست لەزانستەکانی ئەودیوی سرووشت، بریتیە لەناساندن و دۆزینەوەی رۆح کە زانستێکە و بە پێودانگەکان و زانیارییەکانی زانستی ئاسایی ناتوانرێت لێی تێبگەین.

کاتێ کە کالیس تنێس، برازاکەی ئەرستۆ لەگەڵ دۆستەکەیدا ئاناخارکوس، گەیشتە ئێران، ماوەی پێنج ساڵ بوو کە ئەسکەندەر دوور لەیۆنان دەژیا.

لەماوەی ئەم پێنج ساڵەدا، لەرۆحیەتی ئەسکەندەردا، جیاوازی زۆر دروست بوو. ئەو رۆژە کە ئەسکەندەر دەیویست لەیۆنان بێتە دەرەوە، لەئەرستۆ مامۆستای خۆی، ماڵئاوایی کردبوو وەك ئەوەی کە

لەمامۆستاکەی خواحافیزی کردبێ. بەڵام دوای پێنج ساڵ کە نامەی ئەرستۆ گەیشتە ئەسکەندەر، ئەسکەندەر بەشالیارێکی گەورە دەژمێردرا کە بەشێکی گەورە لەدنیای ئەو کاتە لەژێر دەستی دا بوو.

رۆژێك کە ئەسکەندەر لەیۆنان کەوتە رێ، هەرچی مامۆستاکەی، ئەرستۆ دەیوت ئەو، لەوەڵامدا دەیوت دروستە، یان دەیوت هەروایە کە جەنابت دەڵێیت، و پەیرەوی دەکەم.

بەڵام پێنج ساڵی دوانز کاتێ کە نامەی زانستیی ئەرستۆ گەیشتە ئەسکەندەر، ئەسکەندەر ئیتر قوتابییەکی ئاسایی نەبوو، بەڵکو پاشایەك بوو. جگە لەوە، پێنج ساڵ لەمەوبەر کە ئەسکەندەر لەیۆنان کەوتبووە رێ، زانیاری و زانستەکانی، لەسنووری زانست و زانیارییەکانی قوتابیانی تر کە لە پۆلی ئەرستۆ نەیاندەخوێند، زیاتر نەبوو. بەڵام دوای پێنج ساڵ، ئەسکەندەر ئەوەندەی بینیوە و بیستووە کە ئەرستۆ لەوانە ئاگاداری نەبووە.

ئەسکەندەر رووبارەکانی فورات و دجلە و چیای دەماوەند و کۆشکی ئێرانشار و کەرەکێوی و میزۆپۆتامیا و ئێرانی تێپەڕاندبوو. لەکاتێکدا ئەرستۆ نەیدەزانی چیای دەماوەند لەکوێوەیە و کەرەکێوی چ جۆرە حەیوانێکە و کەتیرا و ئانقووزە چییە.

پێنج ساڵ لەمەوبەر کە ئەسکەندەر لەیۆناندا بوو، گەورەترین کۆمەڵە لەلای ئەوەوە "کیسە" — زانکۆی ئەو کاتە— بوو و گرنگترین هەواڵەکان لەلای ئەوەوە، هەواڵەکانی کیسە بوو و هەموو رۆژێ دەیویست کە بزانێ لەکیسە باسی چ بووە و لەبارەی فلان بابەتەوە چییان وتووە. پێنج ساڵ دوایی، ئەسکەندەر ئەوەندە بابەتی سەرنج راکێشی لەزانایانی رۆژهەڵات بیستبوو کە باسی "کیسە" لەلایەوە شتێکی دواکەوتوو دەهاتە بەرچاو.

پێنج ساڵ لەمەوبەر کاتێ کە لەگەڵ کچە ئازەبێکی جوان لەپۆلی ئەرستۆدا گەیشتنە یەك، ئەسکەندەر، ئەوی هاوشێوەی مانگ، یانٙ خۆری دەکرد و بە بەژن و باڵا و جوانیدا، هەڵبەست و وتاری ئەدەبی دەووت. بەڵام دوای پێنج ساڵ ئەوەندە روومەت جوانی رۆژهەڵاتی بینی کە زوڵفەکانیان وەکو هەتاو و چاوگەلێکی رەش و سیحراویان هەبوو" ئیتر کچێکی زانکۆی یۆنانی کە لەپۆلی مامۆستا دەگەیشتنە یەك، لەلایەوە وەکو کەنیزێکی خزمەتکار بوو.

تەنانەت باوەڕی بەجوانی دایکی خۆی "ئۆڵۆمپیا" نەما دوای بینینی جوانەکانی رۆژهەڵات. بەر لەسەفەر کردنی بۆ رۆژهەڵات، هەرکات باس لەجوانی بوایە، دەیوت: ئۆڵۆمپیا دایکی من، جوانترین ژنی یۆنانە.

بەشێك لەم باوەڕەش لەتێکەڵاوی و ئارەزووی دەورانی منداڵییەوە سەرچاوەی دەگرت. چونکە هەر منداڵێك تاکاتێ کە گەورە نەبووە، وا بیر دەکاتەوە کە جوانتر لەدایکی پەیدا نابێت و بەسەمبۆلی چاکترینی هەموو خوڵقێنراوەکانی دەزانێت.

بەڵام ئەسکەندەر دوای ئەوەی کە دەچێتە ناو "لیدی" – ئاسیای بچوك، یان تورکیای ئێستا) و ئەو کاتە میزۆپۆتامیا و دوایی ئێران و خاتوونەکانی روخسار جوانی رۆژهەڵاتیان دەبینێ، بیری کردەوە کە ئۆڵۆمپیا بەوجۆرە کە ئەو بیری لێ دەکردەوە، جوان نەبووە.

لەئاوەها کاتێکدا، نامەیەکی زانستی تەواو لەئەرستۆ بۆ ئەسکەندەر، لەرێگای برازاکەی ئەرستۆوە گەیشت و لەو نامەیەدا ئەرستۆ، باسێکی درێژ لەبارەی (خۆ خستنە جوڵە بەردەوام کە جوڵەی نییە)، یان (بزوێنەری بەردەوامی بێ جووڵە) کردبوو.

لەبیرت نەچێت کە دوای بیست و دوو سەدە لەم بابەتە، هێشتا لەناو زانایاندا باسی ئەمەیە کە ئایا دەکرێت بزوێنەری هەبێت کە خۆی بێ جوڵە بێت.

واتە ئایا دەکرێت، شتێك، شتگەلێکی تر بێنێتە جوڵە، بەبێ ئەوەی خۆی بجوڵێت؟

لەبارەی ئەم باسە فەلسەفییەوە کە بیست و دوو سەدەیە لەبارەیەوە باس کراوە ئێمە ناتوانین وتووێژ بکەین، چونکە لەبابەتەکە لادەدات و باسی ئێمە لەبارەی سەفەرکردنی ئەسکەندەر لەئێرانە، نەك فەلسەفەی ئەرستۆ.

ئەسکەندەر کە ماوەی پێنج ساڵ لەفەلسەفەوە دوور بوو و لەئەنجوومەنەکانی "کیسە" – زانکۆی یۆنان – بەشداری نەبوو، جگە لەوە سەیر بیر و زەوقی گۆڕدرابوو، ئەم نامەیەی چاوێك پێدا خشاند و شتێکی لێ دەست نەکەوت" نەیتوانی بەهەندێك لەخاڵە باشەکانی ئەرستۆ کە لەنامەکەدا باسی کردبوو، تێبگات.

لە بەر ئەمە بوو کە لەوەڵامدا وەهای نووسی:

"لەئەسکەندەرەوە بۆ ئەرستۆ... نامەیەك کە ئێوە نووسیتان، وەکو ئەوەیە کە تەنیا بۆ تێگەیشتنی تایبەتمەندییەکانە و دوای ئەمە، نامەکان و نامیلکەکانی خۆتان جۆرێك بنووسن کە هەمووی خەڵك بتوانن لەوە کەڵك وەربگرن"

لەرابردوودا کاتێ کە ئەسکەندەر دەیویست نامەیەك بۆ ئەرستۆ بنوسێت، لەسەرەوە دەینوسی "لەلایەن قوتابی موخلیسی ئێوە بۆ مامۆستای گەورە"

بەڵام بەپێی ئەو گۆڕانی ڕۆحیەی کە ئاماژەی پێکرا، ڕێزی مامۆستای لەبیر چوو بۆوە. بەڵام ئەسکەندەر لەبەرامبەردا لەو زانیارییانەی کە کالیس تنێس لەگەڵ خۆی لەیۆنانەوە هێنای، کەڵکی وەرگرت و لەوە وەبیستی بە هۆی ئەو خەزێنانەی لەئێرانەوە گەیشتووەتە مەقدوونیە و لەوێدا پارە زۆر بووە. نرخی کاڵاکان بەجۆرێکی سەرسوڕهێنەر چووەتە سەرەوە و حەقدەستی کرێکاران زیادی کردووە و نەك کە هەموو دانیشتوانی مەقدوونیە، بەڵکو گشت یۆنانییەکان کە تێگەیشتوونە ڕۆژهەڵاتی زەوی چەندە دەوڵەمەندە، بڕیاریان داوە کە ڕوو بکەنە ڕۆژهەڵات.

لەئەسکەندەرییە لەمیسردا، کە تازە لەلایەن ئەسکەندەرەوە دروست بووە، قەرەباڵخی گەشتیارانی سەفەری ڕۆژهەڵات ئەوەندە زۆرە کە کەشتییەکان ناتوانن هەڵیانگرن.

یەکێکی تر لەو هەواڵانە کە کالیس تنێس هێنای بۆ ئەسکەندەر، ئەوە بوو کە خانەی شانۆ بەپێی دەستووری ئەسکەندەر لەشاری بابل نزیکی دەروازەی "ئیشتار" دروست کرا، گەیشتووەتە کۆتایی و ئەم خانەیە بەپێی شێوازی شانۆگەری یۆنان دروستیان کردووە و بڕیارە لەوێ، نمایشنامەکانی یۆنانی، نمایش بکەن. تاقمێك شانۆکار، پیاو و ژن لەیۆنانەوە هاتوون و لەبابل دەژین تاکو بەرنامەکانی شانۆی هۆڵی ناوبراو پێشکەش بکەن.

کالیس تنێس برازاکەی ئەرستۆ، لەو فەیلەسوفانە بوو کە پێیان دەوترا "سوفیست" واتە "سوفسەتایی". ئەم وشەیە بەتێپەڕبوونی کات، واتاکەی گۆڕدرا و ئەمڕۆ خەڵکی سوفسەتایی بە کەسایەتییەکی نەرێنی و بێ باوەڕ و تاڕادەیەك زۆربلێ دەناسرێن. لەکاتێکدا واتای ڕاستی

سوفسەتایی جیاوازە لەمە و ئەوانە کەسانێك بوون کە باوەڕیان وابوو کە لەژیاندا دەبێت هاوسەنگی ڕەچاو بکرێت وە لەهیچ کار و هیچ ڕەوشێکدا، هاوسەنگی سرووشتی کە زامنی دروستی بوون و بەختەوەرییە، لەدەست نەدەن.

لەم ڕووەوە یەکەم شەو، کاتێ کە کالیس تنێس لەسەرسفرەی ئەسکەندەردانیشت لەزۆر خواردن و مەشروباتی ئەو شەوە، سەری سوڕما و بەچاوێکی سەیر تەماشای دەکرد، کاتێ کە بینی ئەسکەندەر مەست بووە و دەستی کرد بەو قسانە کە لایەنی لاوازی نەبوو، نەیتوانی لەگەواهی کردنیان خۆی بپارێزێت.

ئەو تازە لەیۆنانەوە هاتووە و هێشتا نەیدەزانی ئەسکەندەر کێیە و چ هێزێکی پەیدا کردووە و وای بیر دەکردەوە کە هەر ئەسکەندەرەکەی پێشووە کە لەهەر بارەیەکەوە دەتوانێت قسەی لە گەڵ بکەیت و ڕەخنەی لێ بگریت و قسەکانی ڕەد بکەیتەوە. و ئیتر نەیدەزانی بەهۆی بەدەستهێنانی هێز و گۆڕانی ڕۆحیەتی، لەوانەیە ڕەخنەیەك ببێتە هۆی لەدەست دانی گیانی ئەو کەسە کە ڕەخنەی لەئەسکەندەر گرتووە.

ئەسکەندەر لەڕقی کالیس تنێس تێگەیشتبوو" بەڵام بەپێی ئەوەی کە، ئەو تازە هاتبوو، یان بەپێی ئەوە کە برازای مامۆستاکەی بوو، ناڕازی بوونی دەرنەبڕی. لەبەر ئەوەی بێ دەنگییەکی قوڵ و مەترسیدار لەسەر کۆڕەکە زاڵ ببوو، ئەسکەندەر بۆ ئەوەی بێ دەنگییەکە بشکێنێت، وتی: کالیس تنێس! زستانەکانی ئێرە سەختە، یان مەقدوونیە؟

کالیس تنێس پێکەنی و وتی: هەڵبەتە زستانەکانی ئێرە ساردترە. چونکە کاتێ کە ئێوە لەمەقدوونیە بوون، لەوەرزی زستاندا تەنیا کراسێکتان لەبەر دەکرد، لەکاتێکدا لێرە سێ دەست جلتان لەسەریەك

لەبەر کردووە، کە یەکێك لەوانە لەپێستە و منیش لێرەدا بەپێی سەرمای سەخت ناچار بوومە، چەند کراس لەبەر بکەم کەیەکێك لەوانە ناوەکەی لەپێستی مەڕە.

لەم ماوەی دوو ساڵەدا ئەسکەندەر هەر جارێك دەچووە قەراخی زریواری هیرمەند، زۆر هەوڵیدە دا کە خێڵەکانی ئاریایی رەگەز کە ئێستا لەچیای ئەفغانستاندا دەژین و دریژەی ئەوانە تا نزیکی هیمالایا رۆشتوە، رایانکێشێتە ژێر دەستی خۆیەوە. بەڵام سەر کەوتوو نەبوو و تەنیا توانی کە ئەوانە لەجولگەکان دوور بخاتەوە و پەناگیری کێوەکانیان بکات.

هەر لەم کاتەدا، رۆژێك کە لەدۆڵێکی کوێستانییەوە، هەندێك لەسەربازەکانی سوپای ئەسکەندەر، بەو مەشکانەی کە فویان تێکردبوو ، لەسەر رووبارێکی خوڕێن دەپەڕینەوە تا خۆیان بگەیەننە ئەو بەر لەگەڵ سەربازانی ئەویٚ دەست بە دروست کردنی، پردێك بکەن، تیرێك بەر پێی ئەسکەندەر کەوت.

ئەو تیرە سەرەکەی وەك قولاپ خوار بوو و بۆ ئەوەی دەری بێننەوە، ناچار بوون کە بەشێك لەماسوولکەی پێی ئەسکەندەر هەڵدڕن و دوایی برینەکەیان بەست و ئەو نەیتوانی سواری ئەسپ بێت و تا ماوەیەك لەسەر تەختی سەفەری جێگیریان کرد و ئەمە یەکەمین برینی سەخت بوو کە لەئاسیادا ئەسکەندەر پێی گرفتار بوو.

لەم ناوچەیەدا کە ئەمڕۆ ئەفغانستانە، جگە لەئەسکەندەرییە کە لەنزیکی هەرات دروست کرا، ئەسکەندەر دەستی بەدروست کردنی بینایەکی تری ئەسکەندەرییە کرد. یەکێك لەنزیکی "قەندەهاری ئێستا" و ئەوی تر نزیکی "کابولٚ"، پایتەختی ئەمڕۆی ئەفغانستان. بەڵام ئەم

شارانە هەر بەم خێراییەوە کە دروست دەبوو، دوای ڕۆیشتنی یۆنانییەکان، زوو بەرەو وێرانی دەچوو.

ئەسکەندەر بەهۆی غورور و زێدەڕۆیی لەخواردنەوەی شەراب و شەهوەت، ڕەوشتێکی توندی پەیدا کردبوو و ئیدی ئەو لاوە خۆش قسە و لێو بەپێکەنینە، کە هەموو لەقسەکانی چێژیان دەبرد و ئەویان لەگیانی خۆیان خۆشتر دەویست، نەدەهاتە بەرچاو.

زێدەڕۆیی لەخواردنەوەی مەی و شەهوەت، سیمای جوان و دڵڕفێنی ئەسکەندەری گۆڕاببوو و سیمایەکی تووڕەی پێدا بوو و ئەفسەرەکان و مەحرەمەکانی، تا ئەو جێیە کە دەیانتوانی پێیان باش بوو کە دوورەپەرێزی لێ بکەن.

ئەو دەستوورگەلێکی دەدا کە نە لەسەر بنەمای بەرژەوەندی سیاسی بوو، نە لەگەڵ بنەماکانی جوامێریدا دەگونجا. کاتێ کە لەئەفغانستان چوونە دەرەوە و بەرەو باکوور ڕۆیشتن، گەیشتنە ڕووبارێك کە یۆنانییەکان لەو کاتەدا بە "ئوخوس" دەیانناسی و ئەمڕۆ ناوی "جەیحون"ە. لەقەراخی ئەم ڕووبارە قامیشەڵانێکی گەورە هەبوو کە هەندێك یۆنانی لە بەدیل گیراوانی شەڕە کۆنەکان دێرین لەوێدا دەژیان.

ئەو یۆنانیانە لەشەڕی بەناوبانگی "سالامیس"، کە یەك سەدە و نیو بەرلە هاتنی ئەسکەندەر بۆ ئێران بەدەست "خەشایارشا" پاشای ئێران بەدیل گیرابوون و خەشایار شا، بەدیل گیراوانی ناوبراوی لەیۆنانەوە بۆ ئێران هێنا و ئەوانەی لەقەراخی ڕووباری جەیحون، لەناوچەیەك دانا کە ئاو و خواردن لەوێ زۆر بوو.

بەدیل گیراوانی یۆنانی لەو ناوچەیەدا لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکە زەماوەندیان کرد و ڕەگەزی نوێ لەوانە هاتە ئاراوە. هێشتا تایبەتمەندییەکانی یۆنانی، واتە چاوی شین و قژی کاڵ و پێستی سپی،

تێیاندا بوو و بەزمانێکی تێکەڵ، لەزمانی یۆنانی و ناوچەییەوە، قسەیان دەکرد.

ئەم خەڵکە بەپێی دوورکەوتوویی لەناوەندەکانی شارستانییەتەوە، هیچ نەیاندەزانی چ لەجیهانــدا روو دەدات و ئاگادارییـان نـەبوو کـە پیاوێـك بـەناوی ئەسـکەندەر پاشـای مەقدوونیـە، ئاسـیای خسـتۆتە بـن دەسـتی خۆیـەوە و ئێـستاش نزیکیـان بووەتـەوە. کـاتێ بینیـان کـە سـوپای ئەسکەندەر هاتووەتە ناوچەکەیانەوە، لەچاوپێکەوتنی سەربازانی یۆنانی کە قژی کاڵ و پێستی سپی و چاوی کاڵیان هەبوو، زۆر خۆشحاڵ بوون و بەڕەسمی یۆنانییەکان چڵێ سـەوز و گوڵـە کێوییـان بەدەستەوە گـرت و هـاتنی ئـەوانیان بـەگوڵ و چـڵێ سـەوزەوە پیرۆزبـایی کـرد و لەبەرامبـەر سەربازانی یۆنانیدا هەڵپەڕین و وتیان کـە ئێمـە "برانـچیدا" واتـە کۆپـەرین و لەبنەڕەتـدا یۆنـانین و خەشایارشـا لەکۆنـەوە ئێمـەی لێـرە نیـشتەجێ کردووە.

ئەسکەندەر هەڵبەتە دەبوایە لەبینینی هاوڵاتییەکانی خۆی شاد بوایە و دیاری و پاداشتی بدابە، بەڵام لەناکاو دەستووری دا کە تا ئاخر کەسیان بکوژن" سـەربازەکانی یۆنـانی بـەتیر و شـمشێر ئـەو چارەڕەشـانەیان، یـەك یەك دەخست.

دەسـتووری رەشـەکوژی ئـەو چارەڕەشـانە کـە بەشـادمانی، لەسـوپای ئەسـکەندەر داپێـشوازیان کـرد، بـەوەی کـە هـاووڵاتی و هاوڕەگـەزی ئـەو بـوون، یـەکێك لـەکارە دڕنـدەکانی ئەسـکەندەرە کـە تـا ئێـستا، هـیچ مێژوونوسێك نەیتوانیوە هۆکارێکی بۆ بدۆزێتەوە.

"روفـوس" یـەکێك لـەو بیـست و یـەك کەسـە مێژوونوسـەیە کـە لەگـەڵ ئەسـکەندەردا بـوون و باسـی شـەڕەکانی ئـەویان کـردووە، دەڵێـت: ئەسکەندەر لـەم رووەوە دەسـتووری رەشـەکوژی ئـەم یۆنانییانـەی داوە کـە

ئەوانە خۆیان بەدوژمنەوە هەڵواسیبوو. لەكاتێكدا ئەوانە بەدیل گیراوی شەڕ بوون و بەگوشار ئەوانەیان لەیۆنانەوە هێناوە بۆ ئێران و لەناوچەیەكی دوور لەشوێنەكانی رۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ئێران، نیشتەجێیانیان كرد تا هیچ هاتووچۆیەكیان لەگەڵ یۆناندا نەبووبێت.

ئەم رەشەكوژییە ئەوەندە دڕندانە و بێ هۆ ودڵتەزێن بووە كە هەندێك لەمێژوونوسانی یۆنانی كە لەگەڵ ئەسكەندەردا بوون، زاتیان نەدەكرد لەپەرتووكەكانی خۆیاندا باسی لێ بكەن، چونكە بۆ ئەسكەندەری مەقدوونی، شەرمەزارییەكی گەورە بوو.

ئەسكەندەر لێرە بەدواوە دەستی كرد بەشەڕەكانی ناوچەكانی رۆژئاوا (بەوتەی یۆنانییەكان، ناوچەی باكتریا) و ناوچەی "سەعدیانی" و لەیەكێك لەشەڕەكانی ئەم ناوچەیەدا لەشاری كوورش (ئەم شارە لەو ئەیاڵەتانە بوو كە كوورش بنیاتنەری هەخامەنشییەكان بنیاتی نا)، بەردێك درا بەناو تەوقی سەری ئەسكەندەردا كە ئەگەر كڵاوخودی ئاسنی لە سەر نەبوایە، دەكوژرا. بەڵام بوونی كڵاوخودەكە، بووە هۆی ئەوەی كە نەكوژرێت، بەم بۆنەیەوە تا ماوەیەك چاوەكانی ئەسكەندەر لەبەر كاری ئەم زەربەیە، باش نەیدەبینی.

پیاوێك كە دەیوت: مەبەستی ئەوەیە وەكو كوورش ئیمپراتۆرییەتێك پێكبێنێت كە تێیدا هەموو گەلان ئازاد و سەربەخۆ بن، لەرۆژئاوا و سەعدیاندا، هەر شارێك كە بەدەستی دەهێنا، رەشەكوژی دەكرد و دەستووری دەدا كە هەموو دانیشتوانی شارەكە لەناوبەرن و ئەم دڕندایەتییە وای كرد، نە تەنیا ئەسكەندەر، بەڵكو هەموو گەلی یۆنان لەلایەن ئەم ناوچەیەوە ببێزرێن. چونكە لە نێوان مەقدوونییەكان و نا مەقدوونییەكاندا جیاوازییان دانەدەنا و هەموویان بەیۆنانی دەزانی.

***

# له ( بەڵخ )ه وه تا نەیشابوور

## هارۆڵد لەمب

### پێشەکی وەرگێڕ:

لەپێشەکی پەرتووکی سەفەر کردنی ئەسکەندەر بۆ ئێران، وتمان کە "هارۆڵد لەمب" ی ئامریکایی دوو پەرتووکی لەبارەی "تەیمووری لەنگ" و "چەنگیز"ەوە نووسیوە کە پەرتووکی تەیمووری لەنگی لەم دواییانەدا وەرگێڕاوەتەوە بۆ فارسی.

هەروەها وتمان کە لەم دوو پەرتووکە بەپێچەوانەی پەرتووکی ئەسکەندەر، شتێك وا بۆ ئێمە ئێرانییەکان سەرنج راکێشە، کەمتر دێتە بەرچاو، هۆکاری ئەوەیە کە "هارۆڵد لەمب"، هەموو بەڵگە مێژووییەکانی خۆی بۆ نووسینی دوو پەرتووکی "تەیمووری لەنگ"، لەمێژوونوسانی ئێرانی گرتوویە و ئێمە خۆمان لەئێراندا لەبارەی چەنگیز و تەیمووری لەنگەوە، لەڕووی نوسراوەکانی مێژوونوسانی رۆژهەڵاتەوە، زیاتر لەهارۆڵد لەمب ئاگاداریمان هەیە.

بەڵام هەندێك لەو خاڵانە هەیە کە یەك بیرەوەری نوسی رۆژئاوایی بەپێی رۆحیەی خۆی باشتر دەتوانێت ئەوە ببینێت و بەهۆیەوە ئێمە، بەشێك لەپەرتووکی چەنگیزی "هارۆڵد لەمب" مان وا هێشتا بەزمانی فارسی بڵاو نەبووەتەوە، بەناوی "لەبەڵخ تا نەیشابوور لەماوەی شەش رۆژ" دا وەردەگێڕینەوە و دەیخەینە بەر دەستی خوێنەران.

# پێشەکی "هارۆڵد لەمب"
# لەسەرەتای پەرتووکی چەنگیز

نزیکەی حەوت سەد ساڵ پێش ئێستا، پیاوێك نیوەی جیهانی داگیر کرد و وەها ترسێکی خستە ناو دڵی خەڵك، کە لەسەدەکانی دوای ئەویش، ئەو ترسە هەر مابوو.

ئەو پیاوە لەدەورەکانی جیای تەمەنیدا، ناوی جۆراوجۆر و نازناوگەلێکی جیاوازی هەبوو، بەڵام ئێمە بەناوی چەنگیزەوە دەیناسین.

چەنگیز نابێت لەگەڵ جیهان داگیرکەرانێك وەکو ئەسکەندەر وناپلیۆن و... هتد بەراورد بکرێت. چونکە پیاوێك جیا لەوانە بوو، کاتێ ئەو پیاوە لەگەڵ خێڵەکانی خۆی دەکەوتە جوڵە، لەباتی ئەوەی کە پێشکەوتنی ئەو بەپێودانگی (مایل و فەرسەخ) بپێودرێت، بەحیسابی وڵاتەکان دەپێورا. کاتێ دەرباز دەبوو، بەگشتی جگە لەگورگ و زیندەوەرانی دڕندەی تر، گیانلەبەرێکی تر لەو نیشتمانەدا نەدەما.

شەڕی جیهانی دووەم، "ئێفووس" و کوشتنە دڵتەزێنەکانی ئەو، ئەگەرچی تۆزێك لەگەورەیی رەشەکوژییەکانی چەنگیزی کەم کردۆتەوە، لەم رووەوە تا ئینسان نەگەڕێتەوە بۆ رۆحیەی خەڵکی حەوت سەد ساڵ لەمەوبەر، ناتوانێت تێبگا کە هەستانی چەنگیز و هێرش و رەشەکوژییەکانی چ ترسێکی خستە ناودڵی خەڵکەوە.

چەندە سەرسوڕهێنەرە کە پیاوێکی دڕندە، بەجارێك وڵاتانی خاوەن شارستانیەتی یەك بەدوای یەك وێران کرد و، مێژوونوسێکی ئیسلامی لەم

بارەیەوە دەڵێت کە هێرشی چەنگیز جگەلە (قەهری) خواوەند لەسەر ئەو گەلانە کە باوەڕیان بەدیانەت لاواز ببوو، شتێکی تر نەبوو.

ئەم پیاوە بەبێ هیچ موبالەغەیەك، خاوەنی رەوشتی سەربازی بوو، بەڵام جگە لەرەوشتی سەربازی، شتێکی تری هەبوو کە ئەفسەرانێك وەکو ناپلیۆن و ئەسکەندەر نەیانبوو و ئەوەش ئەوەیە کە توانی بۆ پەنجا نەتەوە، یاسا بنووسێت و ئیمپراتۆریەتێکی بەربڵاوی وای بەدەست هێنابوو، کە بۆ پاشماوەکانی خۆی بەجێ بهێڵێت.

ناپلیۆن، توانای سەربازی هەبوو، بەڵام سوپایەکی لەمیسر و سوپایەکی تری لەرووسیا لەدەست دا و هەروەها کە لەگۆڕەپانی "واترلو" شکستی خوارد" ئیمپراتۆریەتی ئەو لەناو چوو. ئەسکەندەر بەرەو رۆژهەڵات کەوتە رێ و تا هیندستان چووە پێش، بەڵام هەر کە مرد، ئەفسەرەکانی بۆ بەدەست هێنانی پارچە ئیمپراتۆریەتەکانی، کەوتنە گیانی یەکتر. بەڵام کاتێ کە چەنگیز مرد، ئیمپراتۆریەتی گەورەی خۆی کە سەرێکی لەئەرمەنستان، لەڕۆژئاواو سەرێکی تری لەوڵاتی کۆریا لەرۆژهەڵات بوو، بۆ پاشماوەکانی خۆی بەجێهێشت.

چەنگیز و ئەو مەغولانە کە لەگەڵیدا بوون، خوێندەواریان نەبوو و مێژوویەکیان لەخۆیان بەجێ نەهێشتووە و مێژووی ئەوانە، گەلانی تر، واتە دوژمنەکانیان نووسیویانە.

بەم پێناسە کردنەوە لەم مێژوودا کە بەقەڵەمی دوژمنانی چەنگیز نوسراوە، شتانێك دەبینرێت کە سەرسوڕهێنەرە.

یەکێك لەو هۆکارانەی کە تا ئەم دواییانە، مێژووی چەنگیز راست و دروست بەئێمە لەرۆژئاوا نەگەیشتووە، هەر ئەوەیە کە مێژووی ئەو لەو پەرتووکە جیاوازانەدا کە دوژمنەکانی نووسیویانە، لەبەردەستدا بوون.

ئەمانە بریتی بوو لەپەرتووکەکانی "ئوویقوری" (واتە بەخەت و زمانی ئوویقوری) و پەرتووکەکانی "چینی" کە لەم دواییانەدا بەزمانەکانی ئوروپایی نوسرابوو.

ئێمە لەمێژووی چەنگیز تەنیا ئەو رادەیە کە لەپەرتووکەکانی مێژوونوسانی ئێرانی وعەرەب نوسراون، ئاگاداریمان هەبوو و هیچی تر.

بەلاّم ئەمڕۆ کە پەرتووکەکانی "ئوویقوری" و "چینی" بەزمانەکانی ئوروپایی وەرگێڕدراوەتەوە، هەڵبەتە دەتوانین لەبارەی شەڕەکانی چەنگیز و کارەساتەکانی مێژووی ئەو، زانیاری بەدەست بێنین.

***هارۆڵد لەمب***

❊❊❊

# شەڕ و تێکچوون

سوڵتان محەمەد پاشای ئێران کاتێ تێگەیشت کە مەغولەکانی چەنگیز لەتورکستان بەهێزن، بڕیاری دا کە بەرەو باشوور بڕۆن.

ماوەی دوو ڕۆژ دوو دڵ بوو لەوەی کە ئایا بڕوات بۆ ئەفغانستان، یان خوراسان، وە لەکۆتاییدا جێگرەکانی وتیان: واباشە بەرەو خوراسان بڕۆین و سوڵتان محەمەد ڕێگای خوراسانی گرتە بەر، خۆی گەیاندە نەیشابوور. واتە خۆی، چوارسەد و هەشتا مایل لەمەغولەکانی چەنگیز دوور خستەوە.

دووکەس لەکوڕەکانی چەنگیز، یەکێ بەناوی "چپە نویون" و ئەوی تر ناسراو بە "سووبووتائی" تا بەلخ، خێرا بۆ دۆزینەوەی سوڵتان محەمەد ڕۆیشتن و لەوێدا تێگەیشتن کە ئەو بەرەو ئێران ڕۆیشتووە.

"چپە نویون" بۆ باوکی خۆی چەنگیز، پەیامی نارد کە سوڵتان محەمەد بەرەو ئێران ڕۆیشتووە و چەنگیز لەوەڵامیدا ووتی: تۆ و براکەت "سووبووتائی" دەبوایە بەدوای سوڵتان محەمەددا بڕۆیشتبان تا ئەو ڕۆژەی کە بتوانن دەستگیری بکەن، یان بیکوژن. هەوڵبدەن کە لەدەستتان ڕانەکات. هێزێک کە ئەو دوو برایە هەیانبوو، (دوو توومان، بوو) کە بەزمانی مەغولی، دە هەزار کەس دەبێت و لەم ڕووەوە ئەم دوو برایە خاوەنی بیست هەزار سەرباز بوون.

ئەمڕۆ سەرەڕای ئەوەی کە نوێ کان بەهێزی ئامێر دەجوڵێنن ڕەوشتن، لەبەلخەوە تا نەیشابوور کە چوارسەد و هەشتا مایل ڕێ بوو ، هەڵبەت بەو

ئەزموونانەی کە لەشەڕی جیهانی دواییدا بوو، زیاتر لەیەك حەوتە و لەوانەیە ماوەی دە ڕۆژ کاتی سوپایەك بگرێت. بەلام ئەم دوو برایە بڕیاریان دا کە خۆیان لەکاتی دیاری کراودا بگەیەنن بەسوڵتان محەمەد و لەئەنجامدا کارێکیان کرد کە لەمێژووی شەڕەکانی دنیادا، بە یەکێك لەشتە سەرسوڕهێنەرەکان لەقەڵەم دەدرێت.

ئەوانە نەیاندەزانی کە سوڵتان محەمەد چووەتە نەیشابوور ولەو کاتەدا وەکو ئەمڕۆ، کەرەستەی پەیوەندی و تەلەگراف نەبوو کە ئەوان لەم بابەتە ئاگادار بکرێن.

خودی سوڵتان محەمەدیش بۆ ئەم دوو برایە نامەبەری نارد تا ئەوەی کە ئەوانە لەمەبەستی خۆی ئاگادار بکات و بڵێت چ مەبەستێکی گرتۆتە پێش.

بەلام "چپە نویون" و براکەی تری "سووبووتائی" پێشبینیان کرد کە سوڵتان محەمەد زۆر بەخێرایی دەجوڵێت و بۆ ئەوەی کە پێی بگەن، هەر یەك لەسوارکارەکانیان ناچار کرد کە چوار ئەسپ لەگەڵ خۆیاندا ببەن، واتە بەئەسپی خۆیانەوە دەبوو بەپێنج ئەسپ. و دەبوایە کە هەر سوارێك خۆی لەسەر ئەسپەکەوە گرێ بدات و کاتێ ئەو ئەسپەی کە لەژێریدایە، ماندوو بووایە، بەری بدا و سواری یەکێکی تر لەو ئەسپانە ببێت.

ئەم جۆرە ڕێپێوانە بۆ مەغولەکان، ڕووداوێکی نوێ نەبوو، چونکە مەغولەکان تا ئەو کاتە کە ئەسپەکەیان هێزی جوڵەی هەبوو، دەچوونە پێشەوە و خۆیان لەسەر ئەسپەکەوە گرێ دەدا و هەر لەوێش دەخەوتن و خواردنیان دەخوارد.

دەگەیشتنە هەر شوێنێك، "چپە نویون" و براکەی "سووبووتائی" لێکۆڵینەوەیان دەکرد، ترسیان نەبوو، چونکە دەیانزانی گروپێك لەدواوە

بەشوێنیاندا دێن و ئەسپە ماندووەکان لەدرێژایی کاروانەڕێدا کۆ دەکەنەوە.

دانیشتوانی گوندەکان و ناوچە کە سوارەکانی مەغول لەلایانەوە، یان بە ناوەڕاستیاندا تێدەپەڕین، خۆشحاڵ بوون لەوەی کە ئافەتی ناوبراو دەرباز دەبێت و کاری بەسەر ئەوانەوە نییە. چونکە باسی تاوانی مەغولەکان لەتورکستان بەرەو خوراسان گەیشتبوو و خەڵك ئاگادار بوون ئەو سوارە بالاکورت و ئەسمەرەانە، کە نە خەویان هەیە و نە خواردن، ئەگەر شەڕیان بۆ هەڵکەوێ زۆر خوێن ڕێژ دەبن.

بۆ ئێمە دەرفەت نییە کە بتوانین وردەکارییەکانی سەفەری (دووتوومان)، واتە بیست هەزار سواری مەغول، لەبەلخەوە تا نەیشابوور بۆ خوێنەران شی بکەینەوە. چونکە خودی مەغولەکان شتێکیان لەم بارەیەوە بەجێ نەهێشتووە و مێژوونوسانی تریش باسی ئەم سەفەرە سەرسوڕهێنەرە سەربازییەیان، بەوردی نەکردووە.

"ئیدوارد دوولووریە" ی فەرەنسایی لێکۆڵینەوەیەکی لەبارەی ئەم سەفەرەوە لە (گۆڤاری ئاسیایی) چاپی پاریس – لاپەڕەی ٢٥٥، نووسیوە و هەروەها (ابن بگوگە)، زانای بەناوبانگی ئیسلامی دەڵێت: لەم سەفەرەدا "چپە نویون" کوڕەکەی چەنگیز، کە دەیبینی سەربازێك هێزی سەفەری نەماوە، بەبێ بەزەییەکی سەرسوڕهێنەرەوە، کە تەنیا لەمەغولەکاندا دەتوانرێت نموونەی ئەو هەبێت، دەمارەکانی ملی دەبڕی و دەیکوشت و لاشەکەی دەخستە قەراخی جادەکەوە.

ئێمەی ئورووپایی کە ئەمڕۆ کارەساتەکان لەسەرچاوەی بنەماکانی ڕەوشتی و کۆمەڵایەتییەوە دەخەینە بەردەستی دادوەری، سەرمان سوڕ

دەمێنێت کە چۆن سەربازانی تر ئەو کارەیان دەبینی و قبوڵیان دەکرد و دژی "چیپە نویون" هەڵنەدەستان و خۆیان نەیاندەکوشتەوە.

"ئێدوارد دوولووریە"ی فەرەنسی دەڵێت: بەڵام، دەبێت ئەم کارە لەڕوانگەی چاوی مەغولەکان لەو سەدەیەدا، بخەینە بەردەستی دادوەری تا ئەوەی کە تێبگەین کاتێ کە "چیپە نویون"، سەربازێکی بێ هێزی دەکوشت، لەم بارەیەوە دوو چاکەی دەکرد:

یەکەم: ئەوەی کە نەیدەهێشت کە ئەو بکەوێتە دەستی دوژمن و بیکوژن، چونکە مەغولەکان ئەوەندە دڕندایەتیان نواند بوو کە نەیاندەتوانی کاتێ کە بکەونە چنگی دوژمن، چاوەڕوانی چاوپۆشی و بەزەیی بن.

دووەم: ئەوەی کە ئەویان لەسووکایەتی رزگار دەکرد. چونکە دواکەوتنی سەربازێکی مەغول لەرێپێوانێکی شەڕدا، شەرمەزارییەکی گەورە و هۆی تووڕەیی ئەو بوو. هەروەها ئەو نەیدەتوانی کە لەناو هەمووباندا سەری بەرز رابگرێت و پێی خۆش بوو کە بکوژرێت تا ئەوەی کە لەداهاتوودا بکەوێتە بەر هێرشی سووکایەتی.

"پارکێر" مێژوونوسی ئەمریکایی لەپەرتووکی "هەزار ساڵ ژیانی تاتارەکان" چاپی نیۆیۆرك دەڵێت: سەفەری چیپە نویون لەبەلخ تا نەیشابوور ئەگەر چی لەبواری درێژی سەفەر و ماوەیەکی کەم کە بۆ ئەم سەفەرکەرانە بەکاری بردووە، سەرسوڕهێنەرە، بەڵام دەبێ سەرنج بدەیت کە ئەسپەکانی مەغول عادەتیان وابوو کە دوو یان سێ شەو و رۆژ بەبێ ئەوەی کە پشوو بدەن، رێ ببڕن.

ئەم ئەسپانە کە لەڕەگەزی "تانوو" بوون و قەد کورت و یاڵ درێژ بوون لەبەهێزترین ئەسپەکانی جیهانی بوون.

ئەوانە نەیاندەتوانی لەگۆڕەپانەکانی سوارێك، بکەونە پێش ئەسپە رەسەنەکانەوە و خێرایییان لەغاردا کەم بوو، بەڵام لەبەرامبەردا، لەرێپێوان خاوەنی سەبر و هێزێکی سەرسوڕهێنەر بوون. دوای چەند شەو و رۆژ هەر ئەوەی کە چەند کاتژمێر پشوویان دا، دیسان دەیانتوانی درێژە بەڕێگا بدەن.

جگە لەمە، چپە نویون لەم سەفەرەدا تەنیا لەئەسپەکانی تاتووی مەغولەکان کەڵکی وەرنەدەگرت، بەڵکو لەهەر کاتێکدا کە دەیتوانی ئەسپ گەلێك بەدەست بێنێت، داگیری دەکرد و لە لەوەڕگەکانی نێوان بەلخ و نەیشابووردا، هەزاران ئەسپ لەئەسپەکانی دەوڵەتی دەسوڕانەوە.

ئەو کاتە "پارکێر" دەڵێت: ئێمە باوەڕمان هەیە کە هەرکات ئەم سەفەرە، وەك موبالەغانە نەبێت کە لەپەرتووکەکانی هەندێك لەمێژوونوسانی رۆژهەڵاتدا دەبینرێت، ئەوا زۆر ڕێی تێدەچوو کە زوو بە زوو ئەسپەکانی خۆی لەناوەڕاستی رێگادا گۆڕیوە و ئەسپە ماندوەکانی لەناو ڕێدا بەرداوە و سوارەکانی ناچار کردوە کە، سواری ئەسپە تازەکان بن.

"پتی – دوو – لاکروا"، زانای فەرەنسی لەپەرتووکی (ناوەڕۆکێك لەمێژووی تورکەکان)، چاپی پاریس، دەڵێت: ئێمە کاتێ حیساب دەکەین کە لەم سەفەرەدا لەهەر بیست و چوار کاتژمێر، هەشتا مایل ڕێ براوە، کە نزیکەی هەر بیست و چوار، بیست و شەش فەرسەخ دەبێت.

ئەمە رێپێوانێکی نائاساییەو ئێمە لەدەورانی نوێش دا، وەکو ئەم رێپێوانەمان زۆر نەبیستووە.

ئەسپەکانی نامەبەری "لوویی چواردەهەم پاشای فەرەنسەوی" لەهەر کاتژمێردا، دوو فەرسەخ تا دوو فەرسەخ و نیو، واتە شەش مایل، یان

حەوت مایل و نیو ڕێگایان بڕیوە و دەیانتوانی لەشەو و ڕۆژێکدا، پەنجا تا پەنجا و پێنج فەرسەخ ڕێگا ببڕن.

تەنانەت ئەگەر ئێمە حیسابی جوڵەی سوارەکانی چپە نویون کوڕەکەی چەنگیز لەگەڵ حیسابی جوڵەی نامەبەرەکانی لوویی چواردەهەم بەراورد بکەین، دەبینین کە سوارەکانی چپە نویون لەهەر بیست و چوار کاتژمێردا دەیانتوانی" لانی کەم دە کاتژمێر پشوو بدەن.

تەنیا شتێك کە هۆی سەرسوڕمانە، ئەوەیە کە لوویی چواردەهەم لەکاروانەڕێیەکاندا خاوەنی ئەسپەکانی نامەبەر بوو کە سوارەکانی ئەو لەگەڵ گەیشتن بەنامەبەرخانە، لەئەسپێك دادەبەزین و سواری ئەسپێك دەبوون کە زین و جلی نوێ و بەپشوو بوو" وە درێژەیان بەڕێگا دەدا و لەڕێگای بەلخ و نەیشابوور نامەبەرخانە نەبوو، بەڵام لەکوێوە دیارە کە چپە نویون لەو ڕێیەدا لەئەسپەکانی "ئیلخی" و جووتیارەکان، کەڵکی وەرنەگرتووە.

لەوانەیە ئەو پێش وەستان زانیبێتی کە ئیلخییەکان لەچ ناوچەیەکدا دەتوانێت بدۆزێتەوە و لەگەڵ گەیشتن پێیان ، ئەسپەکانی گۆڕیوە و درێژەی بەرێگە داوە.

"گاتر متر"ی فەرەنسەوی لەپەرتووکی "مێژووی مەغولەکان لەئێراندا، بە سود وەرگرتن لە سەر چاوەکانی ڕەشید الدین" دەڵێت: بەپێی ئەوەی ماوەیەکی زۆرە کە ئێمە لەگەڵ ئەسپدا سەروکارمان نییە و لەجۆری کەڵك وەرگرتن لەئەسپەکان بێ ئاگاین.

بەڵام لەکۆندا، ئەفسەرەکانی سوپا و بەتایبەت خێڵەکانی وەك مەغول وا هەموو تەمەنیان لەگەڵ ئەسپدا، بە سەر بردوە و دەیانزانی چ فێڵێکی جوان بەکار بەرن تا ئەوەی کە بتوانن زۆر لەئەسپەکان کەڵك وەرگرن" تا پڕ

تاقەت بن و ڕێگا دژوارەکان بەبێ ماندوویی ببڕن و یەکێك لەو فێڵانە ئەوەیە کە لەباتی ئاو، شەراب بدەنە ئەسپەکان" لەم ڕووەوە ئەگەر بیست و چوار کاتژمێر بەبێ ڕاوەستان، بجوڵێن، هەستیان بەماندوی نەدەکرد و هەرکات ماندو دەبوو، دیسان لەوانەبوو کە بەخواردنەوەی شەراب ماندوی ئەسپەکە دەرچێت.

هەروەها هەندێك لەگەڵای ئەو دارانەی کە بە سود بوون، دەیانکردە ناو ئاڵف ئەسپەکان" وە خۆڕاگری ئەسپەکانی بۆ ڕێپێوان زیاد دەکرد.

ئەمڕۆش ئەوانەی کە لەناسینی جۆرەکانی ئەسپدا، شارەزاییان هەیە، کاتێ دەبیسن کوڕەکەی چەنگیز نزیکەی حەوتەیەك، هەر ڕۆژ هەشتا مایل ڕێگای بڕیوە، سەریان سوڕنامێنێت.

بەکورتی، چپە نویون و براکەی و سوارەکانی ئاسایی گەیشتنە نەیشابوور" بەڵام لەوێدا بینیان کە دەروازەکان داخراون و شار بۆ بەرگری ئامادە بووە.

چپە نویون دوای هاتن بۆ نەیشابوور ماوەی ڕۆژێك بۆ لابردنی ماندویەتی سوارەکانی خۆی سەبری کرد و دوایی هێرشێکی توندی لەسەر ئەم شارە دەست پێکرد" بەڵام زوو تێگەیشت کە هێرشەکەی لەچوارچێوەی نەیشابووردا کاریگەر نییە، وە بەرگرییەکانی شاری بەهێزتر بینی لەوەی کە لەبەرامبەر (دووتوومان) بیست هەزار نەفەر لەهێزەکانی مەغول کۆڵ بدەن. بەڵام لەگەڵ هێرش بۆ نەیشابوور تێگەیشت کە سوڵتان محەمەد پاشای ئێران لەو شارەدا نییە.

چپە نویون بینی هەرکات درەنگ بکەوێت، لە بەدەست هێنانی نەیشابووردا، سوڵتان محەمەد دوور دەکەوێتەوە و باوکی دووپاتی کردبۆوە کە بەهەر شێوەیەك بێت، دەبێ سوڵتان محەمەد، زیندوو یان

مردوو بەدەست بێنێت، ئەمە وای کرد کە لەشەڕ لەگەڵ نەیشابووردا واز بێنێ و لەدرێژایی جادەیەکدا کە لەنەیشابوورەوە بەرەو رۆژئاوا دەڕۆیشت، کەوتە ڕێ.

خێرایی مەغولەکان ئەوەندە بوو کە لەهیچ شوێنێکدا نەیاندەتوانی راوەستن. بەڵام ئەمە نەبووە رێگر لەڕەشەکوژی قەومی ناوبراو و دەگەیشتنە هەر شوێنێك، بەپێچەوانەی شێوازی خۆیان لەڕێگای بەلخ و نەیشابووردا بەبێ ئەوەی کە لەڕەشەکوژی سوودێکیان پێ بگات، هەر کەسیان کە دەبینی دەیانکوشت (تا ئەورادەیەی کە لەگەڕانەوەدا، کەسێك لەبەرامبەریاندا بەرگری نەدەکرد). شێتی مرۆڤ کوژی ئەو قەومە، ناتوانی بە هیچ شتێك بەراوەردی بکەیت، جگە لەڕەوشتی دڕندەی جانوەران.

جانەوەرانی دڕندە، بەبێ ئەوەی لەکوشتنی زیندەوەرانی بێ ئازار سوود وەرگرن، ئەوانە دەکوژن.

کاتێ کە گورگ دەکەوێتە ناو گاگەلێکەوە، دەزانێت ناتوانێت زیاتر لەمەڕێك بخوات، بەڵام دەیان مەڕ دەدڕێت و مەغولەکانیش کاتێ کە دەگەیشتنە شار و گوندێك، بریتی لەوەی کە لەبەرامبەریاندا بەرخۆدانیان بووە یان نەبووە، تادوایین کەسیان دەدۆزییەوە و دەیانکوشت.

لەناوچەیەکدا کە ئەمڕۆ بە "ئیوان کی" ناسراوە، چپە نویون کوڕی چەنگیز لەگەڵ سوپایەك لەسەربازەکانی سوڵتان محەمەد رووبەڕوو بۆوە. لەم رووبەڕوو بوونەوەیەدا، مەغولەکان تاکتیکی خۆیان کە بریتی بوو لەشەڕ و هەڵاتن، بەکار دەهێنا، بەم جۆرە نیشانیان ئەدا کە راکردنیان هەڵبژاردووە و کاتێ کە دوژمنیان خستە گەمارۆی خۆیان، بە تیرهاوێشتن بەڕەسمی قیقاج (تیرهاوێشتن و نیشان گرتن لەدواوە)، ژمارەیەکی زۆریان لێیان دەکوشت و دواییش بەشمشێر هێرشیان دەکردە سەر هێزەکانی

ناوبراو و ئەوانیان لەناودەبرد و لەهێزی ناوبراودا کە سێ هەزار کەس بوو، شتێك نەمایەوە.

لەتەواوی ئەو شەڕانەدا کە مەغول لەگەڵ هێزەکانی گەلانی دیکە کردیان، ئەم رووداوە دووپات دەبۆوە و دوای ماوەیەك شەڕی ئەوانە کۆتایی دەهات.

هەندێك لەمێژوونوسان لەخۆیان پرسیاریان کردووە کە ئەم پیاوە کورتە و روومەت زەردانە، مەگەر بوونەوەرانێکی نائاسایی بووبن و لەگەڵ ئەوەی دەگەیشتنە سوپای دوژمن، وا ئەوانەیان تێکدەدا و لەناویان دەبردن.

لەوەڵامی ئەم مێژوونوسانەدا دەبێ بڵێی کە مەغولەکان هیچ لایەنێکی نائاساییان نەبوو، بەڵکو هێزی جەستەیی هەر یەك لەوانە بەتەنیا لەهێزی جەستەیی هەر سەربازێکی گەلانی ترکەمتر نەبوو. بەڵام ئەوانە سەربازگەلێکی راهاتوو و شەڕدیتوو دەناسران، لەکاتێکدا سەربازانی گەلانی تر تازەکار بوون. لەسوپای مەغولدا، ئەو سەربازانە دەساڵ و پانزە ساڵ خزمەتی سەربازییان هەبوو. وە سەربازانی لاوی ئەوان (لاو لەبواری هاتن بۆ گۆڕەپانی شەڕ) خاوەنی ئەزموونی پێنج یان شەش ساڵە بوون. وە کاتێ سەرباز ماوەی دە ساڵ، یان پێنج شەش ساڵ، بەردەوام لەگۆڕەپانی شەڕدا دەبوو و لەتەواوی وەرزەکاندا لەگەڵ بارودۆخی شەڕ ئاشنا و نزیك بوو" لەبواری دلێرییەوە دەبێت بەبوونەوەرێکی ئەوپەڕی سەربازایی نائاسایی سوپا.

گەلانی تر، سوپای بەردەوامیان نەدەهێشتەوە و تەنیا لەکاتی شەڕدا بەخێرایی کەسانێکیان لەدەوروبەری وڵات بانگهێشت دەکرد و ئەوانەیان

دەکردە بەشێك لەسوپای گەورە و بچووك و دەیانیان ناردە گۆڕەپانی شەڕەوە.

ئەمانە دلێرییان هەبوو، بەڵام مەشقی شەڕیان نەبوو. وە لەئەزموونەکانی شەڕدا کە تەنیا لەگۆڕەپان دەکەوێتە دەست ، ئاگاداریيان نەبوو.

"سەعدی" شاعیری بەناوبانگی ئێران لەیەکێك لەپارچەکانی خۆی لەبارەی تەکنیکی شەڕ، ئەم بابەتەشی دەکاتەوە و نیشان دەدا کە سەربازی تازەکار هەر ئەوەندە دلێر و بەجەسارەتە، کە ناگات بەپێی سەربازێك کە ساڵانێك لەگۆڕەپانی شەڕدا بووە. مەغولەکان چونکە راهاتووی شەڕ بوون، لەشمشێر لێداندا، زۆر چالاك بوون و تا ئەو سەربازانە دەڕۆیشتن خۆیان کۆ بکەنەوە، ئەوان لەچەپ و راستەوە هێرشیان دەکردنە سەر و کاریان تەواو دەکرد.

هەروەها لەرم وەشاندن و فڕێدانی زۆبین و تیرهاوێشتن بە هۆی مەشق کردنی بەردەوام بەو سەربازانە و لەماوەیەکی کورتدا ئامادە دەبوون و بەبێ راهاتنی تێر و تەسەل دەچوونە گۆڕەپانی شەڕ و شارەزاییان هەبوو.

بەتایبەت لەشەڕ و ڕاکردندا، سەربازەکانی مەغول زۆر وەستا بوون و هەر کە لەڕێوە دەگەیشتن بە جارێ هەموو شتێکیان تێکدەدا و دەیانکوشت و بریندار یان دەکرد و تا دوژمن وەخۆ دەهاتەوە، هیچیان نەدەما.

وە گەورەترین هەڵەی ئەو گەلانە کە لەمەغول شکستیان دەخوارد ئەوە بوو کە سوپای بەردەوامیان نەدەهێشتەوە، تا ئەوانیش وەکو مەغولەکان، سەربازگەلێکیان هەبێت کە بتوانن بەئاسانی و چالاکییەوە لەگۆڕەپانی شەڕدا، دەست بکەنە پەلاماردان.

ئـەمڕۆ وڵاتـانی جیهـان لەشکـستە تاڵـەکانی رابـردوو، ئـەزموونیان وەرگرتـووە و دەزانـن کـە دەبێـت سـوپای بـەردەوام بهێڵنـەوە سـەربازەکان پەروەردە و مەشقی درێژیان پێ بدەن. وە لەو دەورەدا تەنیا مەغولەکانی بیابانی دەیانتوانی کە سوپایەکی بەردەوام، رێك و پێك رابگرن" چونکە بۆ دابینی خەرجی ئەوە تووشی زەحمەت نەدەبوون. وە سیستەمی ژیانی خێڵەکەی مەغول و درێژەدان بە ژیان لەو بیابانەدا کە لەوەڕگەی بەربڵاوی هەبوو، ژیانی سەربازەکانی مەغولی دابین دەکرد و هەرچەند جارێکیش، دەستیان بە پەلامار و تاڵان دەکرد وهەر چی دەست کەوتی شەڕیان جنگ دەکەوت، دەبوو بەهی خۆیان.

ئەمەیە کە لەبارەی دلێری و بوێریِ مەغولەکان ناکریِ رێزی بێ سودیان بۆ دانێی و ئەوانە بە بوونەوەرانێکی نائاسایی دابنێیت.

ئەگەر ئەو وڵاتانە کە کەوتنە بەر هێرشی مەغول، خاوەنی سوپایەکی بەردەوامی لێهاتوو بوونایە، پێش مەغولەکانیان دەگرت.

بـەم هۆیـەوە لەچیاکانی "قەفقازیـە" کـە خێڵـەکانی ئـەویِ بـەردەوام لـەحاڵی شـەڕدا بوون و سوپایەکی بـەردەوامیان هـەبوو، مەغولـەکان وەها شکستیان خوارد کە چپە نویـون هـەموو برینـدارەکانی بـەجێ هێشت تـا خۆی بتـوانیِ، قوتـار ببێت. مەغولـەکان تـەنیا لەبەرامبـەر دانیشتوانی بێ بـەرگری و سـوپایەکی نـوێ کـار و بـێ مەشـق، دلێـر بـوون، وە لەهـەر شـوێنێکدا کـە لەگـەڵ سـوپایەکی رێـك و پێـك و بـەردەوام رووبـەڕوو دەبوونەوە، شکستیان دەخوارد.

سـوڵتان محەمـەد پاشـای ئێـران، بنەماڵـە و هـەروەها خـەرجی خـۆی لەپێـشترەوە نـاردبوو و مەبەسـتی ئـەوە بـوو کـە بـچێتە بەغـدا. ئەگەرچـی پێشتر پێشینییەکانی پەیوەندیی ئەو و خەلیفەی بەغدا (ئەو کاتـە بەغـدا

خەلیفەی هەبوو) باش نەبووە، بەڵام سوڵتان محەمەد وا بیری دەکردەوە کە پەیوەندیی ئەو لەگەڵ خەلیفە ئەوەندە رەش نییە کە لەقبوڵ کردنی خۆی بپارێزێت.

کاتێ چپە نویون لەنزیکی تاران، سوپای سێ هەزار کەسی سوڵتان محەمەدی شکست دا، هەڵسا کە بیدۆزێتەوە. بەڵام سوڵتان محەمەد بەتەواوی ون ببوو، چپە نویون بۆ پەیدا کردنی ئەو بەرەو باشوور رۆیشت و سۆبۆتایش، رێگای باکووری گرتە بەر، بەڵام هیچ کامیان نەیانتوانی سوڵتان محەمەد بدۆزنەوە و بگەڕێنەوە. بەڵام سەرەڕای ئەوەی کە دەرباز بوونی تاقمێك سەفەرکەر، ئەویش سەفەر کردنێك بێ وەکو ئەوەی سوڵتان محەمەد نەدەشاردرایەوە، مەغۆلەکان تێگەیشتن کە ئەم بەرەو هەمەدان رۆیشتووە.

بەجۆرێك هێزەکانی مەغول خێرا دەجوڵان کە سوڵتان محەمەد سەری لێشێوابوو، لەکام لاوە بڕوات کە لەسەر رێیاندا، رێ بۆ دەرچوونیان هەبێت. ئەو بیری کردەوە کە هەرکات بەرەو باکوور بڕوا، لەناوچە کوێستانییەکانی باکووری ئێران، درەنگ دەکەوێ و مەغولەکان لەدواوە بەخێرایی دەگەنە سەریان.

ئەمە بوو کە بڕیاری دا لەلایەکەوە بڕوا کە لەوێ رێ هەبێت و بتوانێت رابکات و رێگای ناوبراویش باشووری ئێران بوو دەهات. لەم رووەوە راستەوخۆ رێگای باکووری گرتە بەر و بەبێ وەستان، رۆژ و شەو چیای پێوا.

بەڵام، هەر وەك وتمان، خاویی سەربازەکانی سوڵتان محەمەد لەچاو مەغولەکان، کاری خۆی کرد و بەو جۆرە کە سەربازانی مەغول بەخێرایی دەجوڵان، سەربازانی سوڵتان محەمەد نەیاندەتوانی رێ بپێون.

مەغولەکان بەو جۆرە پێویستیان بەخەوتن نەبوو و بەبێ ئەوە کە پشوو بدەن، درێژەیان بەڕۆیشتن دەدا. ئەوانە خوویان گرتبوو کە لەسەر ئەسپەکەوە بخەون و لەنەخەوتن ئازاریان نەدەبینی، لەکاتێکدا سەربازانی سوڵتان محەمەد و خودی ئەو دەبوایە لەشەو و ڕۆژدا، لانی کەم چەند کاتژمێر پشو بدەن، ئەگینا نەیاندەتوانی درێژە بەرێگا بدەن.

هەر سەربازێکی مەغولی لەسەر زینی ئەسپەکەیدا، مەشکەیەکی هەبوو کە لەناویدا بڕێ کەشکیان تێکردبوو و لەمەشکەیەکی تریشدا تۆزێ قاورمەی گۆشتی رادەگرت و هەرکات برسی دەبوو، تۆزێ قاورمەی گۆشت و تۆزێك کەشکیان دەخوارد. لەکاتێکدا خێڵەکانی مەغول لەولاتی خۆیاندا، گۆشت خۆر نەبوون.

بەڵام لەسەفەرەکاندا ناچار دەبوون کە گۆشتی پێشتر کوڵاو بخۆن" چونکە کەمتر دەرفەتیان بۆ دروست کردنی خواردن هەبوو. دوای ئەوەی کە مەغولەکان تێگەیشتن کە سوڵتان محەمەد رێگای باکووری گرتۆتە بەر، بەخێرایی کەوتنە شوێنی. پەلەی چپە نویون بۆ گەیشتن بە سوڵتان محەمەد ئەوەندە زۆر بوو کە دەبووە هۆی سەرسوڕمانی کاربەدەستانی ئەو دەیانوت: ئێوە بۆ لەدوژمنێکی هەڵاتوو ئەوەندە ترستان هەیە و، ئەو وەڵامی ئەدانەوە ئەگەر بەم دوژمنانە دەرفەت بدرێت کە خۆی کۆ بکاتەوە و هێزی پێویست بەدەست بێنێت، ئێمە لەناو دەبات.

ئەو شتە بووە هۆی ئەوە کە ئەسکەندەر، داریووشی سێهەم بدۆزێتەوە (شیکردنەوەی ئەوە لەپەرتووکی ئەسکەندەر دا هەیە) و بووە هۆی ئەوەی کە چپە نویون هەڵسێت بۆ دۆزینەوەی سوڵتان محەمەد. دوای ئەوەی کە شەوێك تا نزیکی بەیانی سوارەکانی سوڵتان محەمەد رێیان پێوا بوو،

مانــدوو لــەنزیکی رووبارێکــدا پــشوودانیان کــرد و ســولّتان محەمــەد، لەچادری خۆیدا خەوتبوو.

لەپڕدا هاواری پاسەوانەکانی ئەو بەرز بووەوە، تیریـان بەسـەردا باری و سولّتان محەمەد پەرێشان لەخەو راپەڕی و هاواری کرد چیی ؟

پاسەوانەکانی هاواریان کرد کە مەغولـەکان هـاتوون و سـولّتان محەمەد وتی: پەنا بۆ خـوا، ئایـا لەسـەر زەوی شـوێنێك نییە کە من بتـوانم لەوێـدا لەمەترسی مەغولەکان لەئەمانـدا بم؟ دوای ئـەوە بەبێ ئـەوەی کـە دەرفـەتی بێت، جلی پێویست لەبەر بکا، سواری ئەسپ بوو و لەگـەڵ سـەربازەکانیدا کەوتە ڕێ.

دیار نییە کە لەم کاتەدا سولّتان محەمەد بۆ کوێ چوو و چۆن گەڕایەوە. لەڕاستیدا ئەو نەیدەتوانی لەو رێیەوە کە رۆیـشتبوو، بگەڕێتـەوە. چـونکە مەغولەکان دەیانبینی و سەر رێگاکەیان لیّ دەگرت.

لەلایەکی ترەوە ئاشکرایە کە سولّتان محەمەد دوای ئەوەی کـە لەچـنگی مەغولەکان هەلاّت، رێگای ئەیاڵەتەکانی باکووری ئێرانی گرتە بـەر و لەبـەر ئەوەی گومانێك نەبوو کە سولّتان محەمەد دوایـی بەرەو ولاّتـانی بـاکووری ئێران رۆیشت، دیارە کە نیو بازنەیەکی بڕیوە و لەوانەیـە دوای ئـەوەی کە دەورووبـەری ئەیاڵەتـەکانی رۆژئـاوای ئێـران گەڕایـەوە بـەرەو بـاکوور بـەڕێ کەوتووە.

دوو شـت بـووە هـۆی ئـەوە کـە سـولّتان محەمـەد رای خـۆی بگۆڕێـت و بەرەو ئەیاڵەتەکانی باکووری ئێران بڕوا.

یەکـەم: بـوونی دارسـتانە گـەورە و چڕەکان لـەباکووری ئێـران کـە کـرا پەناگایـەکی بـاش بوایـە. چـونکە دەوتـرا، دارسـتانەکانی نـاوبراو ئەوەنـدە

چڕە کە ئەگەر سوپایەکی گەورەش بێتە ناو دارستانەکە، شوێنەواری ون دەبێت و کەسێك ناتوانێت ئەوە بدۆزێتەوە.

دووەم: بـوونی دوورگـە گـەلێك لـەدەریای خـەزەر کـە مەغولـەکان نەیاندەتوانی، دەستیان پێی رابگات و سوڵتان محەمەد وای بیر دەکردەوە کـە هـەرکات نـەتوانێت لەدارسـتانەکانی ئەیاڵەتـەکانی بـاکووردا خـۆی بشارێتەوە، دەتوانێـت بـچێتە یـەکێك لەدوورگـەکانی دەریـای خـەزەر تـا ئەوەی کە کوڕەکانی و ئەتابەکان بتوانن سوپایەکی گرنگ کۆ بکەنەوە و پێش لە مەغولەکان بگرن.

سوڵتان محەمەد لەسەفەری ئەیاڵەتەکانی باکوور، هەڵەیەکی کرد کە بۆ بەرژەوەندیِ خۆی و وڵاتەکەی باش نەبوو.

لـەو کاتـەدا ژمارەیـەکی زۆر لەفـەرمانڕەوایانی ئێـران، هـەروەها لەگـەڵ هەنـدێك سـوارکار لەجادەکانـدا خـەریکی هاتووچـۆ بـوون و کەسـێك هەڵنەدەستا کە بزانێت ئەوانە کێن و لەکوێوە دێن و بۆ کویێ دەڕۆن.

سـوڵتان محەمـەدیش دەیتـوانی بـەبێ ئـەوەی کـە کەسـایەتی خـۆی بناسێنێت، لەئەیاڵەتـەکانی بـاکووری ئێـران خـەریکی جموجـۆڵ ببێـت و خـۆی بگەیەنێتـە دارسـتانە چـڕەکانی بـاکوور. (ئـەم دارسـتانانە ئـەمڕۆ خـاوەنی چـڕی و پڕییەکـەی جـاران یـان نیـە و لەسـەفەرێکدا کـە لـەم دواییانەدا من چوومە ئێران، بیستم کە ڕۆژنامەکانی ئێران دەنووسن کە درەختـەکانی ئـەم دارسـتانانە دەبێـت بخرێتـە ژێـر پاراسـتنێکی تایبەتییەوە). لەئەمریکا و ئەورووپاش، ئەو دارستانانە کە ئەمڕۆ دەبینین، چڕ و پـڕی دارسـتانەکانی کـۆنی نـەماوە، چونکە زۆربـوونی جـەماوەر بووەتە هۆی ئەوە کە لەوڵاتانی ئەورووپایی و ئەمریکایی هەندێك لەناوچە دارستانییەکان، بکاتە مەزرا و لەوانەدا کشتوکاڵ بکەن.

بەلام سولتان محەمەد سەرەڕای ئەوەی کە مەبەستی خۆشاردنەوە بوو لەدارستانەکانی باکووری ئێران، دەگەیشتە هەر شارێك، حەزی دەکرد بیناسن و ناوی ببێتە سەردێڕی هەموو شتێك و هاتنی ئەو بۆ ناوچەکەیان پیرۆزبایی بکەن و فەرمانڕەوا و گەورەکانی ناوچە بەرەوپیری بێن.

بێگومان لەم رووەوە ئیتر هێلی سەفەری سولتان محەمەد شاراوە نەدەمایەوە و هەرکەس لەو جادەیە کە شوێنی دەربازبوونی ئەو بوو، تێپەڕ دەبوو، دەیتوانی تێبگات کە سولتان محەمەد لەکام گوند و قەزا و شارەوە دەرباز بووە.

مەغولەکان کە بەمەبەستی دۆزینەوەی سولتان محەمەد هەلسابوون، تامەزرۆی پەیدا کردنیان زۆر بوو و بۆ ئەوەی کە بیدۆزنەوە، بەشێوازی خۆیان بەخێرایی رێیان دەپێوا.

***

# کوڕەکەی جەنگیز ڕێگای" قەفقاز"ی گرتە بەر

سوڵتان محەمەد لەرەوشی ژیانی ئەیاڵەتەکانی باکووری ئێران کە لەو سەدەیەدا، زرێوارەکان و زەلکاوەکان زۆر بوون، بێ ئاگا بوو و تووشی نەخۆشییەکی سەخت بوو کە بێگومان نەخۆشی مالاریایە. ئەم نەخۆشییە هەم لەخێرایی جوڵەی سوڵتان محەمەدی کەم کردەوە و هەم رۆحیەتیشی لاواز کرد، سەرەڕای ئەوەی بەو سور بونەی کە ئەمڕۆ لەڕوانگەی ئێمەوە سەرسوڕهێنەرە، کە دەیوت دەچمە هەر شوێنێك دەبێ بەدەورم دا بێن و کاربەدەستانی ناوچەکە بێنە پێشوازیم.

لەوانەیە نهێنی سوڵتان محەمەد، بۆ ناساندنی خۆی بەخەڵك، بۆ بەهێز کردنی وورەی خەڵکەکە بووبێ بۆ ئەوەی دانیشتوانی ناوچەکە بزانن کە وڵاتی ئێران کەم تاکورتێك خاوەنی دەسەڵاتە و مەغولەکان نەیانتوانیوە کە هێزی ناوەندی لەناو بەرن. ئەم جۆرە کارانە لەسەدەیەکدا وەکو حەوت سەد ساڵ لەمەو پێش لەبواری بەهێز کردنی وورەی خەڵك، بێگومان کاریگەری بووە و دانیشتوانی بۆ بەرگری لەبەرامبەر بێگانەکاندا دلێر کردووە.

مەغولەکان بەدۆزینەوەی سوڵتان محەمەد ئەوەندە خێرا هاتن، کاتێ کە گەیشتنە دەریا، سوڵتان محەمەد سواری یەکێك لەبەلەمەکانی راوەماسی ببوو و دەیویست لەوشکایی دوور کەوێتەوە. سەوڵ لێدەرەکانی بەلەمەکە بەهێزەوە سەوڵیان لێدەدا و بەلەمیان لەوشکایی دوور خستەوە. بەشێوەیەك کە سوارکارەکانی مەغول بەسوڵتان محەمەد نەدەگەیشتن"

بەڵام چەند کەس لەسوارەکانی مەغول لەڕقی و تووڕەیی ئەوەی کە بۆچی سوڵتان محەمەد لەچنگیان رای کردووە، بەئەسپەوە خۆیانیان خستە دەریاوە و ماوەیەك لەدوای بەلەمی سوڵتان محەمەدەوە مەلەیان کرد تا کاتێ کە شەپۆلەکانی دەریان، خۆیان و ئەسپەکانیانی خنکاند و ئەو کاتە تەرمەکانیان کەوتە وشکاییەوە.

مەغولەکان نەیانتوانی کە سواری بەلەمەکە ببن و تا دوورگەیەك کە پەناگا بوو، بکەونە شوێنی سوڵتان محەمەد" ئەم رووداوە و ئەوەی کە مەغولەکان نەیانتوانی سوڵتان محەمەد لەدەریادا بدۆزنەوە، دوو هۆی هەبوو:

یەکەم: ئەوە بوو کە مەغولەکان مەلەوان نەبوون و زانیارییان لەبارەی مەلەوانی و دەرباز کردنی سوپایەك لەدەریاوە نەبوو.

دووەم: ئەوە بوو کە راست یان درۆ، دانیشتوانی ناوچەکە لەبارەی دوورگەیەکەوە کە سوڵتان محەمەد پەنای بردبوو بۆی، دەوترێت یەکێك لەو دوورگانە "ئاشوور ئادە" بووە، چیرۆکی ترسێنەریان دەگێڕایەوە و دەیانوت: کە لەم دوورگەیەدا، جانەوەر گەلێك هەنە کە دڕندانە دەژین و لەم رووەوە مەغولەکان پێ بنێنە ناو دوورگەی ناوبراو، لەت لەتیان دەکەن، یان دەیانخۆن. هەر چۆنێك بێت سوڵتان محەمەد لەو دوورگەیەدا لەهێرشی مەغولەکان دوور کەوتەوە.

بەڵام نەخۆشی زۆر ئازاری دا بەشێوەیەك کە بیرەوەری نوسان نووسیویانە، کاتێ کە ماڵئاوایی لەژیان کردووە، لەماڵی دنیا، جگە لەکراسێك ، شتێکی نەبوو، ئەوەش یەکێك لەهاوڕێیانی پێی بەخشیبوو و هەر بەو کراسەش ناشتیان.

کاتێ کە چپە نویون کوڕەکەی چەنگیز، ڕاپۆرتی بەباوکی دا کە سوڵتان محەمەد پەنای بردۆتە یەکێك لەدوورگەکانی دەریای خەزەر و ئەوانیش ڕێگای گەیشتن بەو دوورگەیە نازانن. چەنگیز وای بیر دەکردەوە کە مەبەستی سوڵتان محەمەد ئەوەیە خۆی بگەیەنێتە "ئوورگەنج"

"ئوورگەنج" لەو کاتەدا یەکێك لەشارە گەورەکانی (ماوراوالنهر) بوو و دەبوو لەدەریای خەزەرەوە خۆت بگەیەنیتە ئەوێ" بەمەرجێ کە ڕێگا کراوە بێت.

لەترسی ئەوەی کە، نەکا سوڵتان محەمەد ڕێگای ئەو ناوچەیە بگرێتە بەر" چەنگیز سوپایەکی لەهێزەکانی مەغولی بۆ ئوورگەنج نارد.

لەهەمان کاتدا، نامەبەرێك لەباکووری ئێرانەوە لەلایەن چپە نویونەوە گەیشتە چەنگیز، کە ئەگەر قبوڵ بکات خۆی لەرێگای باکورەوە بگەیەنێتە چەنگیز لە ماوراوالنهر.

بۆ ئەوەی کە بتوانێت لەڕێگای باکوورەوە خۆی بگەیەنێتە ماوراوالنهر، دەبوایە یەکێك لەو دوو ڕێگایە بگرێتە بەر.

ڕێیە کیان لەئەستەرئاواوە بۆ تورکستان و ماوراوالنهر دەڕوا و ئەوی تر ڕێگایە کە لەقەفقازەوە، دوای سوڕانەوە بە دەوری دەریای خەزەردا لە ماوراوالنهر کۆتایی پێدی، چپە نویون ئەم ڕێگایەی هەڵبژارد.

هۆی هەڵبژاردنی ڕێگای دووەم ئەوە بوو کە دەترسا هەر کات لەلای ڕۆژهەڵاتەوە بڕوات، ئێرانییەکان ڕێی لێ بگرن و زەحمەتی بۆ دروست بکەن. هەڵبژاردنی ڕێگای قەفقازیە لەلایەن چپە نویونەوە، هەڵە بوو و لەو سەفەرەدا دەرئەنجامی هەڵەی خۆی بینی، چونکە خێڵەکانی قرقیز و قبنچاق و "ئالدان" کە لەچیاکانی قەفقازیە دەژیان" لەڕووی

سرووشتییەوە، خەڵکێکی شەڕانی بوون" بەرگرییان کرد لەوەی کە مەغولەکان بیانخەنە بەر هێرش و تالان" ژمارەیەکی زۆریان لێیان کوشت.

دوای دەرباز بوون لەقەفقازیە، چپە نویون چووە ناو دەشتەکانی باشووری رووسیاوە و لەوێدا هەندێك لەسوارەکانی رووسیا (بەوتەیەك هەشتا هەزار کەس) کە لەدەوروبەرەوە هاتبوون ڕێگایان لەمەغولەکان گرت و مەغولەکان ماوەی دوو رۆژ لەگەڵیاندا شەڕیان کرد و چونکە فەرماندەی سوارەکانی رووسیا کوژرا، مەغولەکان توانیان کە خۆیان لەمەترسی گەمارۆ و رەشەکوژی رزگار بکەن.

دوای ئەو رووداوە هەرکەسێك بوایە، ڕێگای رۆژهەلات، واتە ماوراوالنهری دەگرتە بەر. بەلام رەوشتی تالان گەری مەغولەکان بووە هۆی ئەوەی کە ئەوان بەرەو (نیمچە دورگەی)ی "کەریمە" بڕۆن. چونکە بیستبوویان کە لەو شوێنە لەباشووری رووسیادا، شاری ئاوەدان هەیە و "کۆماری ژن" لەئیتالیای ئێستادا، لەوێ خانەی بازرگانی گەورەیان هێناوەتە ئاراوە.

مەغولەکان خانە بازرگانییەکانی دوورگەی کەریمەیان تالان کرد و لەوێ گەڕانەوە و دەیانویست کە لەڕووباری بەناوبانگی "دنی پر" تێپەڕ بن. بەلام چەنگیز کە بەردەوام و ڕێك و پێك لەڕێگەی نامەبەری سوار، لەگەڵ چپە نویوندا لەپەیوەندیدا بوو، پێی ووت: بگەڕێنەوە و لەشوێنێکدا کە کەوتووەتە دوو هەزار مایلی ئەو شوێنە کە مەغولەکان لێ بوون، بگەن بەوان. ئەم رێیانە بۆ ئێمە کە خوومان بەفڕۆکە و ئۆتۆمبیلەوە گرتووە، کورت دێتە بەرچاو. بەلام لەو سەدەیەدا، ماوەیەکی درێژ بوو کاتێ کە مێژوونوسانی ئێرانی لەبارەیەوە قسە دەکەن، سەریان سوڕدەمێنێ و بیرەوەری نووسێکی ئێرانی دەڵێت: هەرگیز نەبیستراوە کە گرووپێك لەو

شوێنەوە كە خۆر هەڵدێت، بكەونە ڕێ و دوای دەرباز بوون لەئێران و قەفقازیە و سوڕانەوە بە دەوری دەریای خەزەردا، بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان.

كاتی گەڕانەوەی مەغولەكان، دیسان دەستیان كردە تالآن و خێڵەكانی بولغار كە لەو كاتەدا لەباشووری ڕووباری "ڤۆڵگا" لەڕووسیا دەژیان، خستیە بەر تالآن و كاتی گەڕانەوە چپە نویون نەخۆش بوو، "سۆبۆتائی"، فەرماندەیی سوپای گرتە ئەستۆ.

لەم گەڕانەوەدابوو كە مەغولەكان تێگەیشتن لەباشووری ڕووسیا، دەشتی بەربلاو نییە كە خاكی ئەویٚ ڕەشە بەلآم، زۆر بەپیتە و لەوەڕگەی گەورەی بۆ لەوەڕینی مەڕ و چوارپێكان لیٚ دروست دەبیٚ.

"سۆبۆتائی"، وەها لای ئەم دەشتانە ڕاكێشرا كە ساڵی دوایش گەڕایەوە و دەیویست لەڕووباری "دنی پر" تێپەڕ ببێت، بەلآم دیسان چەنگیز بانگی لیٚ كردبێت بۆ لای.

***

# شرۆڤەیەك لەبارەی یاسای چەنگیزییەوە

بەو شێوەیە کە لەم مێژووەدا بینیمان، چیە نویون کوڕی چەنگیز، کاتێ لەبەلخ خۆی گەیاندە نەیشابوور" بەخێراییەك کە بۆ گەیشتن بەسوڵتان محەمەد هەیبوو، نەیتوانی کە نەیشابوور بگرێت.

بەڵام بەداخەوە کە ئەم بابەتە نەبووە بەرگری لەوەی کە شارەکانی خوراسان بەتایبەت نەیشابوور لەمەترسی مەغولەکان بە دوور بێت و کاتێ خودی چەنگیز، بەرەو ئێران و هیندستان رۆیشت، تەواوی وڵاتەکان کە لەبەردەمیدا بوو، وەها خاپوور کرا کە هێشتا دوای حەوت سەدە، ئاسەواری دڕندایەتی مەغول لەم وڵاتانەدا دەبینرێت. دڕندایەتییەك کە مەغولەکان لەماوەی هێرشەکانی خۆیاندا کردیان، ئەوەندە بەناوبانگە کە باس لەبارەی ئەوانەوە، شیکردنەوەی ئاشکرایە. ئەوانە دەگەیشتنە هەر شارێك، وا لەسەر دانیشتوانیان رەشەکوژی ئەنجام ئەدا و شاریان خاپوور دەکرد کە لەبۆنی پیسی تەرمەکان، خۆیان توانای نیشتەجێ بوون لەو شارەیان نەبوو و لەو وڵاتە زوو دوور دەکەوتنەوە. ئەو شتە لەم دواییانەدا تەیمووری لەنگ لەهێرشەکانی خۆی کردی، نموونەیەك لەدڕندایەتیەکانی مەغولەکانی چەنگیزی بوو. کاتێ مەغولەکان دەگەیشتنە شارێك، جگە لەژنانی گەنج بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆیاندا بیانبەن، بەهیچ کەس رەحمیان نەدەکرد. بەڵام ئەوانەشیان لەناو رێدا دەکوشت، بۆ ئەوەی کە خۆیان زیندوو بن و بتوانن خێراتر رێ بپێون.

ئەوانە مرۆڤیان بەبێ هیچ رق و کینەیەك دەکوشت، وەکو ئەوەی کە ئەرکێکی ئاسایی جێبەجێ دەکەن، وە هیچ جۆرە داواکاری و پاڕانەوە و تکا، کاریگەری لەسەریان نەبوو.

بەو رق و بێڕەحمییە، سەرسوڕهێنەرەوە، هێشتا نەبینرا کە چەنگیز یەکێك لەباڵوێزەکان، یان نوێنەرانی رامیاری کە دەچوونە کۆشکەکەی بکوژێت، "یاسای چەنگیز" واتە یاسای ئاسایی ئەو کە پێکهاتووە لەبیست و دوو تەوەرەو ئێستا هەیە، بەتەواوی لەگەڵ رق لێبوون و خوێن ڕشتنی ئەم هەنگاوە جیاوازە:

١- دەستووری تالان دەبێ لەلای خانەوە بدرێت و لەم رووەوە ئەگەر سەربازەکان بەبێ دەستووری خان دەست بەتالان و رەشەکوژی بکەن، خۆیان دەکەونە بەر دەستووری مەرگ.

٢- هەرکات کە خان مرد، سەرۆك خێڵەکان دەبێ کۆ بنەوە و خانی نوێ هەڵبژێرن و کەسێك هەقی نییە کە بێ رەزامەندی سەرۆکانی خێڵ، ببێتە خان.

٣- لەناو خێڵەکانی مەغولدا، هەندێك لەکەسان لەهەر جۆرە خزمەتێك بووراون، وەکو ئەوانەی کە ئەرکی ئایینی و ئایینزا لەسەر شانیانە، ئەوانەی کە پاراستنی شوێنەکانی ئایینزایان بەدەستەوەیە و ئەوانەی کە بەرپرسی ناشتنی تەرمەکانن و ئەوانەی کە تەرمەکان لەشوێنی مردن تا شوێنی ناشتن، دەبەن و جێ بەجێی دەکەن.

٤- بۆ ئەوەی کە رۆحیەی شەڕانگێزی خێڵەکانی مەغول بەردەوام بێت و لەناو نەچێت، هەر ساڵ لەوەرزی زستاندا بەدەستووری خان، راوێکی گەورەیان سازدەدا و لەم راوەدا هەموو پیاوانی مەغول بەشداریان دەکرد و لەوانەیە راوی ناوبراو لەیەك تا سێ مانگ درێژەی بێت. (بەپێی

جۆری راو و بەربلاوی راوگەکە). بەشداری لەم راوەدا بۆ هەموو پیاوانی مەغول ناچاری بوو، بەلام لەوەرزەکانی تردا بەتەواوی قەدەغەیە و کەسێك مافی ئەوەی نییە دەست بداتە راوی زیندەوەرانەوە.

٥- لەکەسانی ناوبراوی سەرەوە زیاتر کە جگە لەوەی بەپێی کارەکانیان، هیچ جۆرە خزمەتێکی تریان لەئەستۆ نەبوو، کەسانی تری مەغول دەبوایە لەماوەی تەمەندا بۆ جارێك خزمەت بەخان بکەن، خزمەتێك کە پێیان دەسپێردرا، خزمەتی شەڕ بوو. لەوانەیە لەڕووی پێویستییەوە خزمەتێکی تر پێیان بسپێردرێت (وەکو پیشە، یان بەڕێوەبەری).

٦- هیچ کەسێکی مەغولی حەقی نییە کە ئاژەڵێك لەناو سنووری دیاریکراوی مەغولەکاندا بۆ خواردنی گۆشت، سەر ببڕێ، بەلام لەڕەوشێکدا کە مەڕ و مالات بەهۆی نەخۆشییەوە لەمردندا بێت، سەربڕینی پێویستە.

٧- هەر پیاوێکی مەغولی دەتوانێت یەك ژن و هەر ئەوەندە کە بتوانێ (واتە توانایی مالی هەبوبێت) کەنیزەك دابین بکات و کەنیزکەکانیش دەبێت لەو ژنانە بن کە بەڕەگەز هی گەلانی دەرەوەن.

٨- جگە لەکاتی تالان و رەشەکوژی، هەرکات کەسێکی مەغولی، یەکێك لەهاولاتییانی بیانی بکوژێت، لەگەڵیدا وەکو بکوژی ئاسایی رەفتار دەکرێت و دەکوژرێت.

٩- پارەیەك کە لەلای خانەوە دەبێت، پارەی رەسمی ولاتە، لەناو مەغولەکان و گەلانی تردا و ئەگەر مەغولەکان، یان هاولاتیانی گەلانی تر لەپەسند کردنی خۆیان دوورخەن، دەکوژرێن.

١٠- لەکاتێکدا ئەگەر پیاوێك بیەوێت بە زۆری ژنێك ئازار بدات، کە ئەو ژنە هاوسەری رەسمی، یان کەنیزەکی پیاوێکی تر بێت، ئەوا تاوانی

ئەو پیاوە سێدارەیە و دەکوژرێت. جگە لەمە، هەڵسوکەوتی پیاو و ژن، گرێدراوی رازی بوونی دوو لایەنەیە (هەر کات ژنەکە بیانی بێت)" بەڵام ئەگەر منداڵێك بێتە ئاراوە، خان، منداڵی ناوبراو بەحەڵاڵ زادە ناناسێت و ئامادەش نابێت، مافێك کە تایبەتی منداڵانی حەڵاڵ زادەیە، بۆ ئەو منداڵە بەرەسمی بناسێت و لەحاڵەتێکدا ئەگەر ژنی ناوبراو مەغولی بێت، لەسەر پیاو فەرزە تا بەرازی بوونی بنەماڵەی ژن، هەرکات ژن کەمتر لەدوانزە ساڵی بێت، بیکاتە هاوسەری رەسمی خۆی.

١١- هەرکات کەسێکی مەغولی لەگۆڕەپانی شەڕ رابکات، ئەم بابەتە لەرێگەی جارچییەوە بەگوێی هەموو کەس و بنەماڵە مەغولییەکان دەگات و باسی راکردن، بەدەستووری بەرێوەبەر، لەسەر کەتیبەیەکدا دەنووسرێت و لەبەر "یۆرت" چادری پیاوی هەڵاتوو هەڵیدەواسن، تا ئەوەی کە بۆ هەمیشە مەغولەکان بزانن کە ئەو پیاوە لەگۆڕەپانی شەڕدا هەڵاتووە.

١٢- هەر کەس کە هەنگاو دەنێتە خاکی مەغولەکان، گیان و ماڵ و ناموسی دەپارێزرێت. لەکاتێکدا ئەگەر دەست درێژی بکرێتە سەر گیان و ماڵ و ناموسی ئەو پیاوە، تەواوی بنەماڵەکانی مەغول کە کارەساتی ناوبراو لەناوچەکەدا رووی داوە، دەبێت قەرەبووی مادی بدەن و رادەی ئەو قەرەبووە مادییەش، خان یان نوێنەرەکەی دیاری دەکات.

١٣- بەر لەشەڕ، هەر سەربازێك دەبێت چەکی خۆی لەکاربەدەستێك کە فەرماندەی راستەوخۆیەتی، بگرێتە ئەستۆ و لەپاراستنی ئەو چەکە تێبکۆشێت، ئەگەر چەکی خۆی لەرووی بێ خەمی ون بکات، دەکوژرێت. بەڵام ئەگەر لەگۆڕەپانی شەڕدا، چەکەکەی لەدەست بدات، لەلایەن کاربەدەستەکەیەوە، چەکێکی تری پێ دەدرێت.

١٤- لــەکاتی تالآنـدا، هــەر کــەس هەرچــی بەدەســتی بێنێـت، هــی خۆیــەتی و کەســێك ناتوانێــت شــتێکی لــێ بــستێنێت" مەگــەر لەســەر دەستووری خان بۆ بارودۆخ و بەرژەوەنـدی تایبـەت. بەڵام تەنانـەت لـەم جـۆرە کاتانــەدا لەلایــەن خانــەوە شــتێکی پــێ دەدرێــت تـابێ خــەڵات نەمێنێتەوە.

١٥- مەغول دەبێ بزانێت کە لەگۆڕەپانی شەڕدا، ئەسپ سواری بۆ ئەو بەقەد گیانی بایەخی هەیە و لەم رووەوە بۆ پاراستنی ئەسپ دەبێ زۆر تێبکۆشێت و بەبێ مەبەست، ئەسپەکەی نەخاتە مەترسییەوە.

لەوانەیە خوێنەران پرسیار بکەن کە ئێمە بۆچی باسی ئەو بنەمایانە دەکەین؟

لەوەڵامدا دەڵێین ئەم بنەمایانە دوای مردنی چەنگیز تا کاتێ کە نەوەی ئەو لەئاسیادا حکومەتیان دەکرد، یاسای بنەڕەتی مەغوڵەکان بوو و بەپێی ئەوە رەفتاریان دەکرد. تەنانەت کاتێ کە تەیمووری لەنگ دەستی بەهێرشەکان کرد، یاسای چەنگیزی قبوڵ کرد و بەپێی ئەوە کاری دەکرد" لەسەرەوەی ئەوە، کاتێ لەهیندستان ئیمپراتۆریەتێك هاتە ئاراوە کە بەناوی ئیمپراتۆریەتی مەغولی هیندستان ناو دەبرا، دیسان ئاسەواری ئەم پەیڕەونامە لەیاساکان و نیزامەکانیدا، هەبوو.

چونکە دەستووراتی ناوبراو بەپێی رۆحیەت و رەسمی ژیانی مەغولەکان دابین کرابوو و هەر لەم رووەوە دوای مردنی چەنگیز بەردەوام بوو. لەوانەیە ئەم یاساگەلە خودی چەنگیز کە پەنجاوشەش ساڵی تەمەنی بوو لەکاتی پەلاماری کوڕەکانی بۆ ئێران، دابینی نەکردووە" چونکە خۆی خوێندەواری نەبووە، کەسانێ تر یاسای چەنگیزیان نووسی و ناردیان بۆ ئەم لاو وئەولا.

ئەم یاسایە لەدواییدا بەزمانێك کە لەناو مەغولەکاندا باو بوو، واتە بەزمانی "ئوویقور" نووسرا بوو، ئەو کات بەزمانەکانی تر وەرگێڕایەوە" بەشێك لەیاساکانی چەنگیزی لەمافەکانی ئەواندا هەبوو. چونکە ئەو خانانەی کە لەمیسردا گەیشتنە حکومەت، ریشەی قەفقازییان هەبوو و باوباپیرانیان لەگەڵ مەغولەکاندا یەکێ بوون. ئەگەر چی لەبواری رەگەزییەوە، بەشێك لەمەغول نەدەبینران، مێژووناسەکان ئەوانیان بەئاریایی رەگەز دەناسی.

خانەکان، پیاوانێك بوون بالآبەرز و ئێسك گەورە، بەمووی زەرد یان ئاڵتونی و چاو کاڵ کە شوێنەواری بنەماڵەکانیان کاتی هاتنی ناپلیۆن بۆ میسر لەو ولآتەدا هەبوو، ئەگەر پرسیار بکەن کە بۆ چی گەلانی تر، یاسای چەنگیزییان قبوڵ کرد و بەپێی ئەوە کاریان کرد، چونکە تیایاندا مافەکانی، گیان و ماڵ و ئابڕووی کەسان دەپارێزرا و گەلانی تر دەیانبینی، بەرژەوەندیان لەوە دایە کە ئەم مافانە قبوڵ بکەن.

خاڵێکی تر ئەوەیە کە لەیاسای چەنگیزی بەجۆرێك کە بینرا؛ نزیکەی تەواوی تاوانەکانی سێدارە بوو و تەنیا لەتەوەرێکدا، تاوانی جەریمەی مادییان دیاری کردبوو (تەوەری کوشتنی گەشتیارە بیانییەکان لەخاکی مەغولەکان، یان تالآن کردنی ماڵەکانیان). ئەم بابەتە سەرچاوە لەدوو خاڵ دەگرێت.

یەکەم: رەسمی خودی مەغولەکان و دووەم: حاڵی جێ بەجێ کردنی یاساکانی ئەو کاتە، لەناو هەندێك لەگەلانی نائیسلامی" چونکە جگە لەرسەمی شەرعی ئیسلام لەناو گەلانی نا ئیسلامی، جیاوازییەك لەنێوان جۆرەکانی تاوانیان دا نەدەنا. ئەمەش یەکێك لەشانازییەکانی ئیسلامە کەلەچواردە سەدە بەر لەمە بۆ هەر جۆرێك، تاوانێکی تایبەتی داناوە،

واتە بۆ خەتاکانی بچوك، تاوانەکانی بچوك، وە بۆ خەتاکانی گەورە، تاوانەکانی گەورەی داناوە.

ئەم یاساگەلە سەرەڕای ئەوەی کە توند بوون، هەر کاریان پێدەکرا و "مارکۆپۆلۆ"، گەڕیدەی ئیتالیایی کە ماوەیەك دوای ئەوەی چووە ناو نیشتمانی مەغولەکان، سەرەڕای ئەوەی کە بازرگانێکی بیانی بوو، لەسەرانسەری خاکی مەغولەکانەوە تێپەڕ بوو، بەبێ ئەوەی کەسێك بتوانێت لەسەر گیان و ماڵی دەست درێژی بکات. لەکاتێکدا هەموو دەیانزانی کە بازرگانێکی دەوڵەمەندە و بەبڕێکی فراوان پارە و جەواهیرەوە سەفەر دەکات.

ئەگەرچی ئەو ناوچانە کە "مارکۆپۆلۆ" لێوەی تێپەڕ دەبوو، دەیانزانی کە هەر کات هەستن بەدزینی ماڵەکەی، یان بیکوژن، تووشی سزاگەلێکی توند دەبنەوە.

لەبەر ئەوەیە کە ئێمە ئەو شتەی لەپێشەکی ئەو بەسەرهاتە وتبوومان، دووپات دەکەینەوە و دەڵێین بەڕاستی سەرسوڕهێنەرە کە پیاوێکی نەخوێندەوار و بێ بەزەیی وەکو چەنگیز ، بتوانێت یاساگەلێك دابنێت کە تا ماوەیەکی درێژ زامنی پاراستنی ئیمپراتۆریەتی ئەو بێت ، لەکاتێکدا ئیمپراتۆریەتی ئەسکەندەر و ناپلیۆن سەرەڕای ئەوەی کە بەشارستانییەتە گەورەکانەوە پشتیان بەستبوو، لەماوەیەکی کورتدا لەناو چوون.

***

١

# نەخشەی گشتی هێرشەکانی چەنگیز

لەمێژووی بیرەوەری نووسانی رۆژهەلات ژمارەی سوپاییەکانی مەغول، زۆر پیشان دراوە و هەندێك لەوانە وتوویانە کە ژمارەی ئەوانە لەدەنکە خیزەکانی بیابان زیاتر بووە.

هەندێك لەبیرەوەری نوسانی رۆژئاواییش کە مێژووی خۆیان لەمێژووی رۆژهەلات وەرگرتووە، دەلێن کە ژمارەی سوپاییەکانی مەغول لەشەڕەکاندا، زۆر بووە و لەهەشت سەد هەزار کەس زیاتر بووە.

ئەم ژمارەیە لەبواری کێشەکانی لەشکەرکێشی و ئەوەی کە ناتوانی پێنج سەد تا هەشت سەد هەزار کەسی سوپا لەماوەیەکی کەمدا لەرۆژهەلات بەرەو رۆژئاوا، یان بەپێچەوانەوە ببەیت، لەبوارێکی تریشەوە دروست نییە و ئەوەی کە لەخودی ولاتی مەغولەکاندا ژمارەی جەماوەرییان لەو کاتەدا نزیکەی یەك ملیۆن و دووسەد هەزار تایەك ملیۆن و پێنج سەد هەزار بووە. لەم رووەوە مەغولەکان چۆن دەیانتوانی کە پێنج سەد تا هەشت سەد هەزار سوپا ئامادە بکەن.

لەم یەك ملیۆن و دووسەد هەزارە، یان یەك ملیۆن و پێنج سەد هەزار کەسە، بێ گومان هەندێك ژن و مندالْ بوون کە لەشەڕەکاندا کەلکیان لێ وەرنەدەگرت و لەم رووەوە مەغولەکان لانی زۆر دەیانتوانی دووسەد تا دووسەد و پەنجا هەزار سەرباز ئامادە بکەن، ئەوەش بەو مەرجەی کە لەخێلەکانی تر کەلك وەربگرن.

"سر هاندی هاورت"، مێژوو نوسی بەریتانیایی کە بەسەرنجەوە ژمارەی سوپاییەکانی چەنگیزی لەچەند شەڕدا تۆمار کردووە، دەڵێت: کە ژمارەی سوپاییەکانی ئەوەندە بووە:

گاردی تایبەت: هەزار کەس.

دڵی سوپا: سەد و یەك هەزار کەس.

لای راست: چل و هەشت هەزار کەس.

لای چەپ: پەنجا و دوو هەزار کەس.

ئەملا و ئەولاش: بیست و نۆ هەزار کەس.

کۆی گشتی: دووسەد و سی هەزار کەس.

ئەمە ژمارەی سوپای چەنگیزە لەشەڕە گەورەکاندا، واتە لەو شەڕانەدا کە لەئێران یان رۆژئاوا کردوویە.

"سر پرس سایکس"، نووسەری بەناوبانگی مێژووی ئێران، هەمان ڕای هەیە و دەڵێت ژمارەی سەربازانی مەغول لەشەڕەکاندا زۆر نەبووە.

هەندێك لەمێژوونوسانی تر دەڵێن کە لەشەڕەکاندا نزیکەی پەنجاهەزار سەربازی تورکمان و هەندێك لەسەربازانی (کۆریا) و "مەنچووری" لەریزەکانی چەنگیز شەڕیان دەکرد. چونکە کاتێ کە چەنگیز بووە خاوەنی هێز و ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەو پەرەی پێدرا، توانی لەسەربازانی ولاتانی رۆژهەلاتی و شوێنەکانی تر و تورکمان و قەفقازیە کەڵك وەربگرێت.

بەڵام دوای چەنگیز، جێگرەکانی ئەو، سوپاگەلێکی گەورەیان هەبوو و لەوانەیە لەم رووەوە هەندێك لەمێژوونوسانی سەبارەت بە سوپای چەنگیز لەگەڵ سوپای جێگرەکانی دا بەهەڵەدا چووبن.

بۆ نموونە کاتێ کە "ئووکتایی" کوڕەکەی چەنگیز هێزی کەوتە دەست، خاوەنی پێنج سەد هەزار سەرباز بوو" وە کاتێ "مەنگۆ" و "قووبلای"، نەوەکانی چەنگیز، بوونە دەسەڵاتدار، زیاتر لەمە سوپایان هەبوو و ژمارەی سوپاییەکانی ئەوان گەیشتە یەك ملیۆن.

ئەو بیرەوەری نووسانە کە خودی چەنگیز و سوپاکەیان نەبینیوە، ڕەنگە وای بۆچوون کە ژمارەی سوپاییەکانی ئەو بەقەد کوڕەکەی یان نەوەکانی بووە.

ئێمە هەر لەم مێژووەدا بینیمان کە چپە نویون، تەنیا بەبیست هەزار کەس لەبەلخەوە گەیشتە نەیشابوور و لەوێوە باکووری ئێرانی پێوا و لەقەفقازییەوە بەئێراندا تێپەڕی" ئەسکەندەر کاتێ هێرشی کردە ڕۆژهەڵات، لەقۆناغەکانی دواییدا تەنیا هەزار سەربازی بوو. ئەو شتە بووە هۆی ئەوەی کە مەغولەکان سەربکەون، هەر ئەو هۆکارەیە کە لەلاپەڕەکانی پێشوودا وتمان و ئەوەش ئەوەی کە ئەوان سوپایەکی بەردەوام و بەهێز بوون.

لەکاتێکدا لەو وڵاتانە کە دەکەوتنە بەر هێرش، سوپایەکی بەردەوام نەبوو، یان زۆر کەم بوو. دەبێ بزانرێ کە تەنانەت لەئەورووپاش تا سەدەی هەڤدەهەم و هەژدەهەمی زایینی، سوپایەکی بەردەوام بەواتای ڕاستی خۆی نەبوو و تەنیا کاتێ کە وڵاتێك دەیویست شەڕ بکات، دەستی بەکۆکردنەوەی شەڕڤان دەکرد و بەخێرایی ئەوانەی ئامادە دەکرد و دەیناردنە گۆڕەپانی شەڕەوە.

لەناو سوڵتانەکانی ئەورووپادا، یەکەمین کەسێك کە لە بیری داپین کردنی سوپایەکی بەردەوامدا بوو، "فریدریکی گەورە" پاشای "پرووس" بوو. دوای ئەو، ناپلیۆن ئمپراتۆریەتی فەرەنسا، سوپایەکی بەردەوام وەکو

ئەمڕۆ، واتە بەشێوازی نیزامی، خزمەتی سەربازی هێنایە ئاراوە. بەڵام مەغولەکان بەپێی ئەوەی بەردەوام لەحاڵی شەڕدا بوون، سوپایەکی بەردەوامیان هەبوو.

نەخشەی چەنگیز کە هەرکات دەیویست هێرش بکاتە سەر وڵاتێك، بریتی بوو لەم بڕیارە:

یەکەم: یەك "کورۆکتایی"، واتە ئەنجوومەنی گشتی شەڕ بەئامادە بوونی خانی خانەکان، واتە خودی چەنگیز پێکدەهات.

لەم ئەنجوومەنەدا بڕیاریان دەدا، لەچ ڕێگایەکەوە هێرش بکەنە سەر وڵاتی ناوبراو و چ سوپاگەلێك لەهەر ڕێگایەکەوە، بکەوێتە کار.

دووەم: کە بڕیاری پەلامار دەدرا، وە ڕێگای هێرش دیاری و سوپاکانیش دیاری دەکران، لەلایەن چەنگیزەوە سیخوڕانێك دەنێردران بۆ وڵاتی دەستنیشان کراو تا زانیارییە پێویستەکان لەهەر بوارێکدا بێنێتەوە.

سێهەم: لەکاتی هێرشدا هەر فەرماندەیەك کە گروپێکی کۆی نیزامی هەبوو، لەشوێنی ڕاسپێردراو بە خۆی، خاوەنی دەسەڵاتێکی تەواو بوو" بەهەر جۆرێك کە حەزی لێبوو، بەرگریی دوژمنی تێکدەشکاند و ئەوەندەش کە دەیتوانی بێڕەحمی و دڵڕەقی بەکار دەهێنا. چونکە مەغولەکان، بەدەستەواژەی ئەمڕۆیی، مێهرەبانتر بوون و کە باسی بێڕەحمییەکانیان، ڕۆحیەی دوژمنی تێکدەدا و هێزی بەرگرییان لاواز دەکرد.

ئەم فەرماندەیە تەنیا ئەرکێك کە لەسەر شانی بوو، ئەوە بوو کە لەکاتی دیاری کراودا بگاتە ئەو ئامانجە کە بۆی دیاری کراوە و بەرێگەی نامەبەری سوار لەگەڵ چەنگیزدا پەیوەندی هەبێت.

چوارەم: یەکێك لەگەورەترین مانۆڕەکانی سوپای مەغول کت و پڕی بوو و لەزۆربەی شەڕەکاندا بەهۆی بەکار هێنانی ئەم تاکتیکە، سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا.

بەو واتایە کاتێ ئاگادار دەبوون کە لەفلان ناوچەدا، سوپایەکی دوژمن هەیە، دوو یان سێ شەو و رۆژ، بەبێ وەستان رێیان دەپێوا و لەکاتی رێپێوانـدا ، لەوانەبوو هەر بوونەوەرێك هەواڵی پێشکەوتنی ئەوانەیان بەگوێی دوژمن بگەیاندبا، لەناویان دەبرد.

ئامانجی ئەوان ئەوە بوو کاتێ خۆیان بگەیەننە دوژمن کە ئەو چاوەڕێی هاتنی ئەوان نییە و لەئەنجامدا دوژمن ناچار بکەن بەبێ ئەوەی کە ئامادەی شەڕ بووبن، لەگەڵیاندا بجەنگن. لەکاتی رێپێوانە درێژەکادا ئەگەر رووبەڕووی شار، یان قەڵایەکی پتەو و بەهێز ببوایایەتەوە، خۆیانیان لەلای قەڵاکەدا نەدەخستە درەنگ و تەنیا یەکێك یان (دووتوومان) لەهێزەکانی خۆیان بۆ گەمارۆی ئەو ناوچەیە دەهێشتەوە و بەشی سەرەکی سوپا تێدەپەڕی.

بەردەوام رووی ئەدا کە لەسەر کاری ئەم رێپێوانە درێژانە و ناکاوگیر کردنی دوژمن، بەر لەوەی هەست بە خۆیان بکەن، گەمارۆیان دابوون.

ئاشکرایە کە ئەنجامدانی ئەم مانۆرە پێویستی بەوەیە کە چەنگیز سەربازگەلێکی هەبووبێت کە دوای دوو سێ رۆژ رێپێوان و ماندوویی، دوای گەیشتن بەگۆڕەپانی شەڕ، دیسان بتوانن لەبیست و چوار کاتژمێر هەتا چل و هەشت کاتژمێری تر بەخەبەر بن تاکو کاری شەڕ یەك لابکەنەوە و بوونی ئەم سەربازانە لەو کاتەدا دەگمەن بوو و، تەنیا خولێکی راهێنانی درێژ لەگەڵ بارودۆخی سەخت و دیسیپلینێکی رێك و

پێك دەیتوانی سەربازەکان بۆ تەحەمول کردنی ئەو ماندوویێتی یانە رابێنێت.

پێنجەم: یەکێکی تر لەهۆکارەکانی سەرکەوتنی چەنگیز، ئەو چەکە نوێیا نەبوو کە بەکاری دەهێنا، لەناو سوپای چەنگیزدا، هەندێك ئەندازیاری چینی بوون کە پسپۆڕی بەکار هێنانی تۆپ بوون و ژمارەیەکی زۆر لەمێژوونوسان بیروڕایان وایە، یەکەمین کەس کە لەشەڕەکاندا، تۆپی بەکار هێنابێ،چەنگیز بووە. هاتنی ئەم چەکە نوێیە لەگۆڕەپانی شەڕدا، لەبواری تێکدانی رۆحیەتی دوژمندا زۆر کاریگەر بوو و تەنانەت دەنگی تەقینەوەکەی بەس بوو بۆ ئەوەی کە ورەی دوژمن دابەزێنێ.

چەنگیز لەرێگای ئەندازیارە چینییەکانی خۆی، وەکو سوپاکانی ئەمڕۆ تۆپی بەکار دەهێنا.

لەم رووەوە کاتێ کە تەقاندنی تۆپەکان بەشی خۆی ریزەکانی دوژمنی تێکدەشکاند و رۆحیەتیانی لاواز دەکرد، لەپڕدا سوار و پیادەش دەکەوتنە جوڵە و یەکەمین جار کە چەنگیز لە بە کار هێنانی تۆپ راوەستا و شکستی خوارد لەشەڕ لەگەڵ مەمالیکەکانی میسردا بوو ئەوانە نە لەدەنگی تۆپەکان و نە لە گوللەتۆپەکان دەترسان.

چەنگیز لەشەڕەکاندا، فیلیشی بەکار دەهێنا و کالیسکەکانی شەڕی مەغولەکان لەگۆڕەپانی شەڕدا، چەکێکی کاریگەر بوو.

شەشەم: رەنگە بتوانی بڵێیت کە بێدەنگی مەغولەکان لەگۆڕەپانی شەڕیشدا لەو کارانە بوو کە یارمەتیدەری سەرکەوتنیان بوو. کاتی شەو لەکەمپی مەغولەکاندا، سازیان لێدەدا و گۆرانیان دەوت و سازێکی

تایبەتیان هەبوو کە ئاوازیان پێ لێ ئەدا. ئەوانە لەناوچەی خۆیاندا، ئەو گۆرانیانەیان دەوتەوە کە باوباپیرانیان لە ئۆردوگاکاندا دەیان ووت.

بەڵام کاتێك دەستیان بەشەڕ دەکرد، ئیتر چرپە لەکەسێکەوە نەدەهات" وە بێدەنگی ئەوانە دەبووە هۆی ئەوەی کە دوژمن نەزانێت، ژمارەی ئەوانەی کە هاتوون، چەندە و لەکام لاوە دێن. لەبەرامبەردا، دوای سەرکەوتن لەدەستپێکی ئێوارەوە تا نیوەشەو، ئۆردوگا مەغولەکان پڕ دەبوو لەدەنگ و هەرا و ئەگەریش شارێکیان بەدەست بهێنایە، ئۆردوی ناوبراو، دیمەنێکی مەترسیدار و ناشرینی بەخۆوە دەگرت.

چونکە لەهیچ جینایەتێك لایان نەدەدا و بەدیل گیراوەکانیان بەبێ بەزەیی و چاوپۆشی لێیان، بێ ئەوەی کە سوودێکی هەبێت بۆیان، دەیانکوشتن و هەرچەند لەناوچەی سەرەکی خۆیان دوور دەکەوتنەوە، زیاتر بەدیل گیراوەکانیان دەکوشت. چونکە هیوایان نەبوو کە بتوانن ئەوانە بگەیەننە نیشتمانی خۆیان و وەکو کۆیلە کەڵکی لێ وەرگرن.

مەغولەکان، ژنانیان هەر وەکو پیاوان دەکوشت و بەلای ئەوانەوە، جوامێری هیچ مانایەکی نەبوو و شەرم و حەیا دەبێتە رێگر لەوەی کە بووترێت، بەر لەوەی کە ژنەکان بکوژن، چییان لەگەڵ دەکردن و هۆی ئەوەی کە ژنەکانیان دەکوشت و ئەوانەیان بۆ کەنیزی نەدەبرد، ئەوە بوو کە بیریان دەکردەوە، ئەگەر ئەوانە بەدیلی ببەنەوە، دەبێ خەرجی خواردنیان بدەن.

لەبارەی جێی دانیشتنی سەرەکی چەنگیز، مێژوونوسان و جوگرافناسانی دێرین لەگەڵ یەکدا جیاوازی بیروڕایان هەبوو. چونکە لەکۆندا، وەکو ئەمڕۆ جوگرافیا بەربڵاو نەبوو و نەخشەکانی جوگرافیایی بەوردی و رێك و پێکی نەبوو.

لەلایەکەوە لەناوچەکانی رۆژهەڵاتی ئاسیا تا تورکستان، خێڵاتێك دەژیان کە لەبواری رووخسار و رەگەزەوە، کەم تاکورتێك، هاوشێوەی چەنگیز و مەغولەکانی ئەو بوون. لەم رووەوە لەبارەی ناوچەی سەرەکی چەنگیز، لەنێوان مێژوونوسان، جیاوازی بیروڕا هاتە ئاراوە. هەندێك وتیان: دانیشتوانی ئەوپەڕی ئاوەکانە و هەندێك ئەویان بەچینی دەناسی و مێژوونوسانی رۆژهەڵات باوەڕیان وابوو کە ئەو لەخێڵی "یاجوج و ماجوج"ە.

ئەمڕۆ بەسەرنج دان لەبابەتەکانی مێژووی چینی و ئەو پەرتووکانەی کە بەزمانی ئۆیگووری "ئۆیقووری" بۆ ئێمە ماوەتەوە، وە پیاچونەوەی پەرتووك جوگرافیاییەکان دەتوانیٚ بەئاسانی و بەجۆرێکی دروست ناوچەی سەرەکی چەنگیز دیاری بکرێت.

لەڕاستیدا ماوەیەك بەر لەمەغول، باوباپیرانیان لەبەشی باکووری بیابانی ناسراو بە"گووبی" دەژیان و چەنگیزیش هەر لەویٚ لەدایك بوو و گەشەی کرد.

مەغولەکان لەبەشی باکووری بیابانی گووبی، باشترین ناوچە کە ئاو و لەوەڕگەی بوو، داگیرکردبوو. باوکی چەنگیز بەناوی "تزووکمایی" دەناسرا و ناوی باپیریشی (باوکی باوکی باوکی)، "کامیل خان" بوو.

سەرۆکەکانی ناوچەیی لەسەر سپێتی پێستی ئەسپ پەیوەست بوون ئەگەر سپی بوایە، دادەنیشتن و یەکێك لەسوودەکانی سەرۆکی خێڵ، دانیشتن لەسەر پێستی سپی (چەرمی ئەسپ) بوو. "تزووکمایی" باوکی چەنگیز، شەوێك لەئۆردوگای ناوبراو مێوانییەکی سازدا.

مەغولەکان، بەکۆمەڵێك چادریاندەوت ئۆرد و بەیانی ئەو رۆژە، سوارێك بەپەلە خۆی گەیاندە لای چەنگیز و بەئەو و دایکی ئاگاداری دا کە باوکی

وا لەئۆردوی ناوبراودا میوان بوو، مردووە و لەوانەیە ژەهرخواردیان کردبێت. چەنگیز لەوکاتەدا سێنزدە ساڵی بوو و بەپەلە سواری ئەسپ بوو و خۆی گەیاندە ئۆردوی ناوبراو و بینی هەر بەوجۆرە کە دەڵێن، ئەو ژیانی لەدەست داوە.

مەرگی لەناکاوی تزووکمایی سەرەڕای ئەوەی کە کوڕەکەی سێنزدە ساڵی بوو، لە ناو خێڵێک کە تزووکمایی بەسەرۆکی ئەوان دەناسرا، جیاوازی دروست کرد و هەندێک لەکەسانی خێڵ وتیان کە ئێمە ناتوانین لەخێڵێکدا بژین کە سەرۆک و فەرمانڕەواکەی، کوڕێکی سێنزدە ساڵەیە و واباشترە لێرە بڕۆین.

"هۆلۆن" دایکی چەنگیز ژنێک بوو جیدی و خاوەنی ئیرادە و کاتێک بینی کە ژمارەیەکی زۆر لەکەسانی خێڵ، سواری ئەسپ بوونە و کەوتوونەتە رێ، ئالای مێردە مردووەکەی خۆی کە ۹ کلکی گای تەبەتی ناسراو بە "یاك"[1]ی پێوە بوو، گرتیە دەستەوە و لەدوای ئەوانەدا رۆشت و هانی دان کە بگەڕێنەوە. ئەوانە کاتێ گەڕانەوە، بینیان کە چەنگیز لەسەر پێستی سپی ئەسپ دانیشتووە و رەسمەن بۆتە خانی خێڵ. بەڵام لە بەر ئەوەی لەسەر داواکاری و وتەکانی هۆلۆن دایکی چەنگیز گەڕانەوە، بۆ داهاتوویان زۆر پەرۆش بوون.

ئەوان دەیانزانی کە تزووکمایی باوکی چەنگیز لەکاتی ژیانیدا، دوژمن گەلێکی لەخێڵەکانی دراوسێدا هەبوو و ئێستا کە ئەو لەناو چووە دوژمنەکان لەم دەرفەتە کەڵك وەردەگرن تا ئەوەی کە تۆڵەی باوك، لەکوڕە سێزدە ساڵەکەی بکەنەوە.

---

(1) "یاك" گایەکی تایبەتە کە کلکی ئەو وەکو ریسی هاوریشمە. وەرگێڕ.

مێژوونوسان دەنووسن کە چەنگیزی سێنزدەساڵە، کاتێك خۆی لەگەڵ کێشەکانی بەڕێوەبردنی خێڵەکەدا بینی، تەنیا لە "یۆرت"ی خۆیدا گریا. ئەو لەبەر ئەوە گریا کە دەیبینی، ناتوانێت زەوی و زاری خێڵەکەی لەتەماحی خێڵەکانی دەوروبەر بپارێزێت.

چونکە خێڵی تزووکمایی و چەنگیز لەناوچەیەك لەبیابانی "گووبی" نیشتەجێ بوون کە لەبواری لەوەڕگە و ئاو، بە باشترین شوێن دەناسرا و ئەوانەی کە لەماوەیەکی درێژەوە، چاویان لەم زەوی و زارانە بوو، تێگەیشتبوون کە دەرفەت گونجاوە بۆ بەدەست هێنانی ئەوانە.

تەنانەت دیارنەبوو خودی خێڵی چەنگیز باجی ساڵانە دەدەن، یان نا؟ ئەم باجانە لەچەند مەڕ و ماڵات پێکدەهات کە هەر بنەماڵەیەك بەپێی کەم و زۆری خۆیان، ئاراستەی خانی خێڵەکەیان دەکرد.

ئەوانەی کە بەهاندانی هۆلۆن دایکی چەنگیز گەڕانەوە، ئومێدیان بەخۆیان دەدا، ئێستا کە خانی خێڵ، تەنیا کوڕێکی سێنزدە ساڵەیە، ئەوانە دەتوانن لەدانی باج بەدەر بن.

یەکێك لەسەرۆکەکانی خێڵەکانی دراوسێ بەناوی "تارگۆتایی" کە لەرۆڵەکانی "بورشیخۆن" بوو و، "بورشیخۆن" بەپێی رەنگی چاوی، بەناوی "پیاوی چاو خۆڵەمێشی" دەیانناسی، رقێکی توندی لەتزووکمایی باوکی چەنگیز بوو. ئەمڕۆ سەرەڕای ئەوەی کە گەلان وەکو رابردوو پێکهاتەی خێڵایەتییان نییە و شارنەشین بوونە، ئەم جۆرە رقانە لەنەوەیەك بۆ نەوەیەکی تر دەمێنێتەوە، ئیتر تا بگات بەو دەورانە، ئەویش لەبیابانی گووبی بەرێ و رەسمی تایبەتی خێڵە ناوچەییەکان.

ئەوە بوو کە رۆژێك تارگۆتایی لەناکاو بەسوارەکانییەوە هێرشی کردە سەر خێڵی چەنگیز و لەدوورەوە تیربارانی "یۆرت" ەکاندی کرد. چەنگیز

و براکانی و خوشکەکانی و دایکی چونکە بینیان هێزی بەرگرییان نییە، ناچار سواری ئەسپ بوون و رایان کرد و چەنگیز و هۆلۆن، دایکی و براکان و خوشکەکانی لەناو دۆڵێکی کوێستانی دا خۆیان حەشار دا و ئەو رۆژە بۆ جاری دووەم، چەنگیز لە بێ دەسەڵاتیدا دەستی بەگریان کرد.

"کۆتایی بەشێك لەپەرتووك"

***

# شەڕەکانی ئێران

## هیرۆدۆت

### پێشەکی وەرگێڕ:

کارەساتێك کە لەم بەشەدا دەخرێتە بەردەستان، لەپەرتووکی "شەڕەکانی ئێران"، نووسینی "هیرۆدۆت" مێژوونوسی بەناوبانگی یۆنانی گیراوە.

ئەم پەرتووکە هێشتا بەزمانی فارسی بڵاو نەبۆتەوە و تەواوی رووداوەکانی بۆ ئێمە شتێکی نوێیە.

هەندێك لەگەورەکانی زانست و ئەدەبی ئێمەش کە لەڕابردوودا بەکەڵك وەرگرتن لەپەرتووکەکانی مێژوونوسانی یۆنانی، بەتایبەت "هیرۆدۆت"، مێژووی ئێرانیان نووسیوە" بەم پەرتووکانە کە هێشتا لەسی، چل ساڵ لەمەوبەر لەیۆنانییەوە بۆ ئینگلیزی وەرنەگێڕدراوە، دەستیان پێی نەدەگەیشت. خودی هیرۆدۆت مێژوونوسی بەناوبانگی یۆنانی لەپێشەکی ئەم پەرتووکەدا، کورتەمێژوویەکی نووسیوە کە لەبواری توانای مێشکی مێژوونوسێك، بۆ کۆکردنەوەی بەڵگەکان، زۆر شایستەی سەرنجدانە.

دەڵێن زۆر شایستەی سەرنجدانە، چونکە ئەم کورتە مێژوویە، بیست و پێنج سەدە لەمەوبەر نووسراوە، نەك ئەمڕۆ. وە ئێمە بیر دەکەینەوە کە ئەم مێژوویە هەرچەند بەکورتیش بگاتە دەستی خوێنەران کە بزانن تەنانەت لەدوو هەزار و پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر مێژوونوسانی راستەقینە هەبوونە. (بەو واتایە کە ئەمڕۆ بۆ ئەوان رێزیان هەیە).

<u>زەبیحوڵڵای مەنسووری</u>

***

# "کورتە مێژووی هیرۆدۆت"

من ئەم پەرتووکە لەڕووی ئەو شتانەوە دەنووسم کە کەسانێکی تر نووسیویانە. بڕێك لەبەشەکانی پەرتووکەکە لەو کەسانەم بیستوە کە خۆیان شاهیدی ڕووداوەکان بوون. ژمارەی ئەمانە زۆر نییە و لەبەرامبەردا بەڵگە نووسراوەکان زیاترە.

لەکاتی نووسینی ئەم مێژووەدا، من تا ئەو جێیە کە توانیومە، هەندێك لەو شوێنە مێژووییانەی کە پەیوەستن بەم پەرتووکەوە بینیوە تا بزانم ئایا ئەو شوێنانە هەروایە کە شاهید وتوویەتی، یان مێژوونوسانی پێشوو نووسیویانە یان نا؟

بۆ تێگەیشتنی ڕووداوەکان لەبارەی ئێرانەوە، من بەیەك یان دوو نووسراوخۆم سنووردار نەکردووە، بەڵکو هەندێ جار نووسراوەکانم هەڵدەسەنگاند تا بزانم ڕاستی کامەیە! لەهەندێ بابەت کە هەستی نەتەوەیی وای لێدەکردم، کە ڕووداوێك بەسوودی نیشتمان و گەلی خۆم بنووسم، لەم کارە خۆم پاراستوە، چونکە نووسەری مێژوو، دەبێ هەستەکانی خۆی، فیدای نووسینە ڕاستەقینەکان بکات.

من نەمویست لەڕێی ئەم پەرتووکەوە ئەو شتانە بخەمە بەردەستی ئێوە کە ببێتە هۆی سەرسوڕمانتان، یان ترسانتان" چونکە ئەو کاتە من دەبوومە ئەفسانە نووسێك نەك مێژوونوسێك.

ئەو پەرتووکانەی کە تەنیا خوێنەران دەخاتە دڵەڕاوکێ، یان دەبێتە هۆی سەرسوڕمانیان وە نووسەر مەبەستی ئەوەیە کە خوێنەران بخاتە ترس و لەرزەوە، مێژوو نییە.

کاتێ ڕووداوێک دەبێتە هۆی ترس و سەرسوڕمان، ئەگەر بەڕاستی ڕووی دابێت، من لەم پەرتووکەدا باس لەوە ناکەم کە ئەوانی تر لەباسی ڕووداوەکاندا، هەستەکانی خۆیان تێکەڵ نەکردوە.

بەڵکو من کاتێ ئەو ڕووداوانە دەگێڕمەوە، دەڵێم دۆست ئاوەهای وت و دوژمن وەها، تا ئەوەی کە خوێنەران بوارێکیان بۆ حوکم دان هەبێت.

لەو خاڵانەدا کە ڕووداوێکی مێژوویی وەرگیراو لەپەرتووکی کەسانێک کە لاواز دەهاتنە بەرچاوم، نووسیومە کە ئەم چیرۆکە لاوازە، یان ئەوەی کە لەگەڵ بنەماعەقڵانیەکاندا نایەتەوە. من نازانم شێوازی حوکمی داهاتووییەکان لەبارەی ئەم پەرتووکەوە چۆن دەبێت و ئایا دەستخۆشی لێ دەکەن، یان دەیخەنە بەر ڕەخنەی توند و تیژەوە" بەڵام لەلایەن خواکانەوە ڕوو سپیم کە درۆم نەوتووە و تەڵەکەبازیشم نەکردووە و ئەفسانەم دروست نەکردووە و مەبەستم ئەوە نەبووە کە کەسێك لەخۆمەوە هەڵکێشم و بەرزی کەمەوە یان ن بەکەمی دابنێم و سووکایەتی پێبکەم[1]

"هیرۆدۆت"

***

[1] دەبێ تێبگەی کە هیرۆدۆت وەکو یۆنانییەکانی ئەو سەردەمە باوەڕی بەچەند خوا بووە و لەم ڕووەوە دەڵێت لەلای خواکانەوە ڕووسپیم — وەرگێڕ-

# هاتنی کەمبوجیە شاهەنشای ئێران بۆ وڵاتی فیرعەونەکان

کاتێ کوورش پاشای ئێرانماڵئاوایی لەژیان کرد، کەمبوجیە کوڕەکەی بووبە پاشای ئێران.

ئەم کوڕە لە "کاسان دان" ی هاوسەری کوورش بووە و کوورش ژنەکەی خۆی زۆر خۆش دەویست.

خۆشەویستی کوورش بۆ "کاسان دان" ی هاوسەری ئەوەندە بوو کاتێ کە ئەو مرد (واتە هاوسەری کوورش)، ئیتر کوورش جل و بەرگی ماتەمینی دادەکەند و دەستووری دا کە تەواوی ئێرانییەکانیش ماتەمینی بگرن. بەڵام ماوەی ماتەمینەکەی کەم دانا و وتی: خەڵك جیاوازن لەمن" ئەوانە کارگەلێکیان هەیە و دەبێ بەکاری خۆیان رابگەن و ناتوانن بۆ ماوەیەکی نادیار لەماتەمینیدا بن.

لە لایەکی ترەوە دابین کردنی جل و بەرگی ماتەمینی بۆ هەموو کەس ئاسان نییە و من ناتوانم بەئێرانییەکان بڵێم کە ئێوەش وەکو من بەردەوام ماتەمبار بن.

کەمبوجیە رۆڵەی کوورش و کاسان دان دوای ئەوەی کە گەیشتە دەسەڵات، هەڵسا بەوەی کە بەرەو میسر سوپایەك بخاتە رێ. ئەگەر ئێوە میسرتان بینی بێت، دەزانن وڵاتێکی تەختە و لەوێدا چیا ناکەوێتە بەرچاو و، مەگەر لەلای باکووری رۆژهەڵاتی وڵاتەوە.

کاتێ پاشای ئێران ویستی سوپا بباتە ناو میسرەوە، میسرییەکان لەخۆبایی بوون و دەیانووت کە ئێمە دێرین ترین گەلی جیهانین و یەکەمین گەلین کە توانیمان ساڵی هەتاوی دابمەزرێنین و ساڵ بکەین بە دوانزە مانگ و میسرییەکان لەم بارەوە لەپێشەوەی هەندێك میللەت و ئێمەی یۆنانییش. چونکە ئەوان ساڵی خۆیان بەدوانزە مانگ و هەر مانگیش بەسی رۆژ دابەش کردووە و لەکۆتایی ساڵدا، پێنج رۆژ دەخەنە سەر ساڵەوەو لەم رووەوە وەرزەکانی ساڵی ئەوان بەردەوام رێك و پێکە. بەڵام ئێمە یۆنانیی، مانگەکانی خۆمان بەجۆرێك رێکخستووە کە هەندێك لەساڵەکان، سێنزدە مانگمان هەیە و وەرزەکانی ئێمە رێك و پێك نییە.

هەروەها میسرییەکان لەخۆبایی بوون بەوەی کە یەکەمین کەسن کە بۆ دوانزە خواکەی ئاسمان[1] ناویان دانابوو و ئێمەی یۆنانی ئەم بناغەیەمان لەوانە وەرگرتووە و دیسان لەخۆبایی بوون بەوەی کە مەعبەدیان بۆ پەرستن دروست کردووە و وێنەی ئینسان و زیندەوەرانیان لەسەر بەرد، یان شتێکی تر نەخش کردووە.

من باوەڕم هەیە کە میسرییەکان راستیان وتووە، چونکە کاتێ کە خۆشم رۆیشتمە میسر، بینیم کە لەوێدا بیناگەلێك هەیە کە کاتێك دروست کراوە کە سەرانسەری میسر ئاو دایگرتووە و ئەو وڵاتە بووەتە زلکلوێك و تەنیا بەشێکی کەم لەو وڵاتە، لەسەر ئاو بووە و خەڵك لەوێدا ژیاون و ئەو بینایانەی کە لە شێوەی هەرەمدان هەر لەهەمان ناوچەدا دروستیان کردون.

میسرییەکان دەیانوت کە یەکەمین کەس کە لەمیسردا حوکمی کرد بەناوی "مَن"، یان "مین" دەناسرا و ئەم وشە بەشێوەی "ملنس"

---

[1] مەبەست دوانزە مانگەکەیە – وەرگێڕ -

هاتووەتە ناو زمانی یۆنانییەوە، کە بەواتای ئینسانە و ئێرانییەکانیش وشەی "من"یان بەکار دەبرد و مەبەستی ئەوان لەم وشەیە ئینسانە و کاتێ کەسێك ئەیەوێ لەئێراندا قسە بکات، دەڵێت، من دەڵێم، یان من دەڕۆم – واتە ئینسان دەڵێت، یان ئینسان دەڕوات.

من وا بیر دەکەمەوە ئەو زەلکاوانەی کە لەمیسردا بوون و ئەمڕۆ بەشێك لەوانە لەو وڵاتەدایە، نزیکی دەریا، ئەو جێیەی کە رووباری نیل لێی دەڕژێتە دەریاوە، هەیە و لەئەنجامی رووباری نیلەوە هاتۆتە ئاراوە.

رووباری نیل لەڕابردوودا زۆر بەربڵاو و بەرینتر بووە لەمڕۆ و لەوانەیە نیوەی خاکی میسر، لە رووباری نیل پێك هاتبێ و بەڕای من، بەو ئەزموونانەی کە خۆم لەمیسردا کردم، وڵاتی میسر لەڕووباری نیل هاتۆتە ئاراوە و ئەگەر ئەو رووبارە نەبوایەو هەتاو زەلکاوەکانی وشك نەکردایە، خەڵك نەیاندەتوانی لەدوو لای رووباری نیلدا، کێڵگە دروست بکەن و کشتوکاڵ بکەن.

میسرییەکان باوەڕیان وابوو، چونکە ئەوانە دێرین ترین گەلی جیهانن (بەخەیاڵی خۆیان) و سەرەڕای ئەوەی کە بەشێك لەوزانیارییانە کە ئەوانی تر هەیانە لەوانەوە گرتوویانە، ئەو وڵاتە هەرگیز نابێتە گۆڕەپانی شەڕ.

من لەکاتی سەفەر کردندا لەگەڵ چەند کەس لە"کاهینەکانی میسر"[٢] لەبارەی ئەم بابەتەوە باسمان کرد و ئەوان وتیان: ئەگەر ئەم باوەڕە هەبوبێت، لە ناو چینەکا گشتییە کانیدا. چونکە دێرینەی گەلێك و کەسایەتییەك کە گەلی ناوبراو هەیبووە، لەگەڵ رووداوەکانی شەڕ و نیزامی جیهان یەك ناگرێتەوە.

***

---

[٢] رۆحانییەکانی میسر.

## دەپرسن بۆ کەمبوجیە شاهەنشای ئێران، سوپای کێشایە ناو میسرەوە؟

من لە بارەی لەشکەر کێشی چەند رووداوم بیستووە کە هەندێکیان لەمیسرییەکان و هەندێکیش لەئێرانییەکانم گوێ لێ بووە.

ئێرانییەکان دەڵێن: کەمبوجیە شاهەنشای ئێران، کچی "ئامازیس" فەرعەونی میسری بۆ هاوسەری داوا کرد. پزیشکێکی چاوی میسری کە لەڕابردوودا چاوی کچی ناوبراوی دەرمان کردبوو، باسی جوانی ئەوی بۆ کەمبوجیە کرد و کەمبوجیە لەفەرعەون، کچی داوا کرد.

"ئامازیس" فەرعەونی میسر لەباتی کچەکەی خۆی، کچێکی تر بەناوی "نی تەتیس" کە ئەویش جوان بوو، تەشریفاتێکی شکۆداری بۆ کەمبوجیە نارد.

ئەم کچەش لەخێڵەکانی شازادەکانی میسری بوو، بەڵام کچی فەرعەون بەحیساب نەدەهات و رۆژێك کەمبوجیە بەشێوەی ئێرانییەکان، کچەکەی بەناوی باوکیەوە بانگ کرد، بەڵام کچەکە کە تا ئەوکاتە هاوسەری کەمبوجیە بوو وتی:

شاهەنشا، ئێوە هەڵە دەکەن، چونکە من کچی "ئامازیس" نیم کە ئێوە من بەناوی کچی ئەوەوە بانگ دەکەن" لەم رووەوە کەمبوجیە تووڕە بوو و خوێن بەرچاوی گرت و بڕیاری دا کە سوپای خۆی بباتە ناو میسرەوە.

میسرییەکان هۆی بردنی سوپا بەجۆرێکی تر باس دەکەن و دەڵێن: "نی تە تیس" واتە کچێك کە باسی لێوە کرا. کچێکی میسری بوو کە کوورش ئەوی بەهاوسەری گرت و کەمبوجیە لەو کچە میسرییەوە هاتە دنیا.

کاتێك بووە دەساڵە، بەدایکی ووت: ئەی دایکە من دەزانم کە تۆ میسریت و نیشتمانی خۆتت خۆش دەوێ و من کاتێ گەورە بووم، میسر بۆ تۆ داگیر دەکەم تا ئەوەی کە بتوانی لەوڵاتی خۆتدا ژیان بکەیت، بەڵام من "هیرۆدۆت" بە قسەی ئەم میسری گەلە باوەڕ ناکەم، چونکە بەپێی بەڵگە باوەڕپێکراوەکانی دەسەڵات، گومانی تێیدا نییە کە کەمبوجیە لەسکی کاسان دان دروست بووە و کاسان دان کچێك بوو لەخێڵی هەخامەنشی و ئێرانی و، میسرییەکان تایبەت ئەم داستانەیان هێناوەتە ئاراوە تا بڵێن کەمبوجیە شاهەنشای ئێران لەسکی ئەم کچە میسریە بووە لەم رووەوە ویستوویانە کە خەیاڵاتێکی پووچ بۆ خۆیان دابین بکەن.

من داستانێکی ترم لەئێرانییەکان بیستووە و ئەوەش ئەمەیە کە کەمبوجیە پاشای ئێران لەهێزی فەرعەونی میسر عاجز بوو و دەترسا لەوەی کە فەرعەون بەداگیر کردنی تەواوی کەنارەکانی دەریای رۆم، ببێتە کۆسپ لە بەردەم ئەوەی کە بازرگانی ئێران کەنارەدا بەرو پەیداکات.

لە بەر ئەمە بوو کە هەڵسا تا خزمایەتی لەگەڵ میسردا بکات تا ببێتە کۆسپ لەبەر فەرعەونی میسردا، نەکا دەرگای بەندەرەکانی رۆژهەڵاتی دەریای رۆم لەسەر بازرگانی ئێراندا ببەستێت و دوای ئەوەی کە فەرعەون لەباتی کچەکەی خۆی، کچێکی تری بۆ پاشای ئێران نارد، بیری لەکەمبوجیە کردەوە کە ئەو نیەتی پاك نییە.

من لەسەرەتای ئەم مێژووەدا وتم: هەر داستانێك کە بەڕای من لاواز بێت، دەڵێم لاوازە و هەر شتێك کە ئەقڵی من قبوڵی نەکات، گومانی لێ دەکەم. داستانی خوازبێنی لەکچی فەرعەونی میسر لەوانەیە راست یان درۆ بێت و ناردنی کچێکی تر لەباتی کچی فەرعەون رەنگە دروست بێت، یان نا.

بەڵام لەوانەیە، ئەو شتە کە من لەبارەی هۆی ئەم شەڕە لەزانایانی ئێرانی بیستوومە راستە و ئەوەش ئەوەیی کە کەمبوجیە نەیدەویست کە فەرعەونی میسر کە هێزی هەبوو بەربە بازرگانی ئێران لەبەندەرەکانی رۆژهەڵاتی دەریای رۆم بگرێت.

هەر لەو کاتەدا کە پاشای ئێران بڕیاری دا و سوپای بۆ میسر برد، یەکێك لەنۆکەرەکانی ئامازیس فەرعەونی میسر، بەناوی "فانس"[1] کە پیاوێکی وشیار و دلێر و زێرەك بوو، بەهۆیەك کە بۆ من دیاری نەکرا لە فەرعەون توڕە بوو و سواری کەشتی بوو و بەرەو ئێران رۆیشت.

فەرعەون چونکە دەیزانی ئەو پیاوێکی زیرەکە و لەوانەیە لەبارەی بارودۆخی میسرەوە زانیاریی دروست بداتە پاشای ئێران، یەکێك لەژێر دەستانی ناو دەرباری بەشوێنیدا نارد و وتی: هەرچۆنێك بێت بیگەڕێننەوە.

نێردراو سواری کەشتی جەنگی بوو و بەدوای فانس دا رۆیشت و لەیەکێك لەکەنارەکانی دەریای رۆمدا پێی گەیشت، چونکە ئەوەی کەشتی خێراتر لەکەشتی فانس شەڕ بوو.

---

[1] وەرگێڕ تێدەگات کە دووپات کردنی ناوە تازەکان دەبێتە هۆی ناسینی مێژوو. بەڵام دەبێت تێبگەی کە ئەمە کارەساتی مێژووە، نە ئەفسانە. وەرگێڕ.

فانس، وادیارە، پێشنیاری پیاوی دەرباری بۆ گەڕانەوە بۆ میسر قبوڵ کرد، بەڵام شەو، شەڕابی دا بەکاپیتانی کەشتییە جەنگییەکەی پیاوی دەربار و هەمووی سەرخۆش کرد. فانس سواری کەشتییەکەی خۆی بوو و ڕای کرد، کاپیتان و سەرنشینەکانی نەیاندەتوانی بەدوای دا بچن.

دەرئەنجام فانس توانی کە خۆی بگەیەنێتە ئێران و بچێتە لای کەمبوجیە و لەبارەی میسرەوە زانیارییەکی دروستی خستە بەردەستی ئەو و بەپاشای ئێرانی وت: ئێوە ئەگەر بتانەوێ لەڕێگای دەریاوە هێرش بکەنە سەر میسر، ڕووبەڕووی سوپای جەنگی فەرعەون دەبنەوە و زاڵ بوون بە سەر ئەم کەشتیانەدا ئەگەر ئەستەم نەبێ ئەوا زۆر سەختە.

کەمبوجیە وتی: فەرعەونی میسر چەند جۆر کەشتی شەڕی هەیە؟

فانس وەڵامی دایەوە: هەندێك لەوانە ریزێك سەوڵ لێدەر و هەندێکی تریش دوو ریز سەوڵ لێدەریان هەیە. لەم ڕووەوە کە وەکو بینای خانوویەکی دوو قاتە، کە قاتێك لەسەر قاتی ترە، تاقمێك لەسەوڵ لێدەرەکان لەناو کەشتی شەڕدا لەسەرەوەی تاقمی ترەوە جێگیر بووە و ئەوانە کە لەقاتی سەرەوەن، سەوڵەکانیان درێژترە. بەڵام کاتی سەوڵ لێدان، لەگەڵ سەوڵ لێدەرەکانی قاتی خوارەوە، ئاوەکە دەبڕن و کەشتی جەنگی دەخەنە جوڵە.

جۆری سێهەم کەشتییەکانی شەڕە، کە شوێنی سەوڵ لێدەرەکانی هاوشێوەی بینایەکی سێ قاتە و، سێ ریزی سەوڵ لێدەر، هەرکام لەسەرەوەی ئەوی ترەوەیە و سەوڵەکانی سەوڵ لێدەرانی قاتی سەرەوە لەسەوڵی دوو قاتی خوارەوە درێژترە. بەڵام هەر سێ تاقمەکە چ لای ڕاست و چ لای چەپی کەشتییەکە، لەگەڵ یەکدا سەوڵەکانیان دەخەنە ناو ئاوی دەریا و کەشتییەکە دەخەنە جوڵە. و خێرایی دەربازبوونی ئەم

کەشتییانە کە بەسێ ریز سەوڵ لێدەر دەجوڵێ، ئەوەندە زۆرە کە ئێوە تا چاو لەسەر یەك دانێن و بیکەنەوە، کەشتییەکە لەبەرامبەرتان دەرباز بووە.

بۆیە هەوڵی ئێوە لەگەڵ ئەم ریزە بەهێزەی شەڕ، کارێکی دژوارە، ئێوەش ژمارەیەکی زۆر لەو ریزانە بۆ خۆتان دابین بکەن و سەوڵ لێدەری توند و تۆڵ لەناویدا دابنێن" بەڵام ئەوە پێویستی بە کات هەیە و بەم زووانە ناتوانن ریزی زۆری شەڕ دروست بکەن.

لە بەر ئەمە کە بە بیروڕای من باشتر وایە کە لەڕێگای سەحراوە هێرش بکەنە میسر" چونکە ئیتر فەرعەون ناتوانێت لەریزەکانی شەڕی خۆی بۆ سەر ئێوە کەڵك وەربگرێت.

بەڵام دەربازبوونی سوپای ئێران لەڕێگای سەحرا و گەیشتن بەمیسر، پێویستی بەوە هەیە بەوەی کە ئێوە پێشتر نوێنەرێك بنێرن بۆ لای پاشای عەرەبستان و داوای یارمەتی لێبکەن. چونکە ئەگەر عەرەبەکان بیانەوێت کە ریّ لە سوپای ئێوە بگرن، بەپێی بەربلاوی سەحرا و گەرمای هەوا و کەمی ئاو، تووشی زەحمەتی دەبنەوە.

کەمبوجیە وتی: جگە لەبابل لەسەر رێدا، چ وڵاتانێك هەیە؟

فانس وەڵامی دایەوە: ئەو وڵاتانەی کە لەسەر رێی ئێوەیە، بریتیە لەسوریا و فەلەستین و دوای ئەوەی کە دوو وڵاتی ناوبراوتان تێپەڕ کرد، دەگەنە وڵاتی "سینا" و دوای ئەوە دەچنە ناو خودی میسرەوە و بۆ ئەوەی بتوانن لەدەشتەکانی سوریا و فەلەستین تێپەڕ بن و بگەنە سینا و میسر، رەزامەندی پاشای عەرەبەکانی پێویستە.

پاشای ئێران نوێنەرێکی ناردە لای پاشای عەرەبەکان و داوای رێگای لێ کرد و پاشای عەرەبەکان بەڵێنی دا رێگا بداتە سوپای ئێران و خەیانەتیش نەکات. بۆ ئەوەی نوێنەری ئێران زیاتر دڵنیا بێت، مەراسیمی

خوێنی جێبەجێ کرد. بەجێ هێنانی مەراسیمی خوێن لەناو عەرەبەکاندا وەهایە کاتێ کە عەرەبێك بیەوێ لەگەڵ کەسێکی بیانیدا بەڵێنێك بدات، کەسێکی سێهەم لەناوەڕاستیاندا دەوەستێ و بەگوێزانێکی تیژ، ناوەڕاستی پەنجەی هەردووکیان دەبڕێ، کاتێ خوێن لەپەنجەی هەر دووکیان هات، حەوت وردە بەرد هەڵدەگرێت و لەخوێنی هەردووکیانی وەردەدا و وردە بەردەکان فڕێ دەدا و لەم رووەوە نێوان ئەو دوو کەسە سوێندی خوێن بەڕێوە دەچێت و ئیتر هیچکامیان خەیانەت لەوی تر ناکات، ئەگەر خەیانەت بکەن، لەلایەن خواکانەوە تووشی رووداوگەلێکی توند دەبنەوە.

پاشای عەرەبەکان و نوێنەری ئێران بەنوێنەرایەتی پاشای ئەو وڵاتە سوێندی خوێنی خوارد کە پاشای عەرەبەکان خەیانەت لەپاشای ئێران نەکات و ڕێگا بەسوپاکەی بدات و بۆ دابین کردنی ئاویش لەهەر یارمەتییەك بۆ سوپای ئێران قسوری نەکات.

کاتێ سوپای ئێران گەیشتە عەرەبستان، عەرەبەکان بۆ یارمەتیدانی سوپای ئێران زەحمەتیان کێشا و وشترێکی زۆریان دابین کرد و لەسەر پشتیان، مەشکەی پڕ لەئاویان بار کرد.

جگە لەو وشترانە کە ئاویان بۆ سەربازەکانی ئێران دەبرد، پاشای عەرەبستان بەر لەهاتنی سوپای ئێران، داهێنانێکی کردوە کە من گومانم لێی هەیە و وا دێ بە خەیاڵما کە کەسانێك ئەم باسەیان گێڕاوەتەوە کە تێنەگەیشتون چ کێشەیەك بۆ جێبەجێ کردنی ئەو شتەی کە دەڵێن، هەیە.

بێگومان بیستووتانە کە لەعەرەبستان رووبارێك هەیە ناسراو بە "کووریس" کە دەڕژێتە دەریای سوورەوە[1].

پاشای عەرەبستان دەستووری دا کە بەدرێژایی هێڵی رۆیشتنی سوپای ئێران مەخزەنی ئاو دابنێن و لەڕووباری کووریس لەڕێگەی لوولەی گڵی ئەو کات، ئاو بگەیەننە مەخزەنەکان. بۆ ئەوەی سوپای ئێران کە دەگاتە هەر ناوچەیەك، ئاوی هەبێت.

ئەو شتەی کە ئەو داستانە لەلای من بێڕەنگ دەکات، ئەوەیە کە لەبڕێ ناوچەدا، هێڵی رۆیشتنی سوپای ئێران لەو ناوچانەدا تێپەڕ دەبوو کە لەگەڵ رووباری ناوبراودا، ڕێی دوانزە رۆژە. لەلایەکەوە، ماوەی مێژوویەك کە پاشای ئێران لەپاشای عەرەبستان داوای ڕێی کرد و مێژوویەك کە سوپای ئێران چووە ناو عەرەبستانەوە، زۆر نەبوو، چونکە عەرەبەکان توانیان کە لەماوەیەکی کەمدا لەڕووباری کووریسەوە ئەو مەخزەنانە کە دروستیان کردبوو پڕ بکەن، بۆ ئەوەی کە سوپای ئێران بەبێ ئاو نەمێنێتەوە.

لەبەر ئەوەی دروست کردنی هەرکام لەو کاناڵانە بۆ گەیاندنی ئاو بەمەخزەنەکان، ماوەیەکی پێویست بوو. ئەوەیە کە من وابیر دەکەمەوە سوپای ئێران کاتی دەربازبوون لەعەرەبستان زۆرتر کەڵکیان لەو ئاوانەوە وەرگرت کە بەوشترەکان دەیانگواستنەوە.

بەڵام بەر لەوەی کە سوپای ئێران بگاتە سەرسنووری میسر، ئامازیس، فەرعەونی میسر کە ماوەی چل و چوار ساڵ لەمیسردا پاشایەتی کردبوو، ماڵئاوایی لەژیان کرد. لەم ماوەی چل و چوار ساڵەدا کە ئەم فەرعەونە لەمیسردا پاشایەتی کرد، هیچ ڕووداوێکی گرنگ بۆ میسر نەهاتە پێش و

[1] ئەم رووبارە ئەمڕۆ وشك بووە؛ بەڵام لەکاتی هیرۆدۆت هەبووە – وەرگێڕ -

ئەو وەکو فەرعەونەکانی تر لەکاتی ژیاندا، گۆڕی خۆی دروست کرد. چونکە میسرییەکان بەپێچەوانەی ئێمەی یۆنانی کە لەدەورەی ژیاندا لەبیری مردندا نین، لەتەواوی دەورەی تەمەنیاندا بیر لەمەرگ دەکەنەوە و ئامرازی کۆچ بۆ دنیای تر دابین دەکەن. ئەوانەی کە رەوشی مادییان باشە، بۆ خۆیان گۆڕی باشیان دروست دەکردو فەرعەونەکان، گۆڕی گەورە و زۆر باش دابین دەکەن و هەندێك لەوانە گۆڕی خۆیان بەشێوازی هەرەم دروست دەکەن. چونکە هەرەم بەپێی شێوازی خۆی زۆر لەبەرامبەر هەتاو و بادا بەرگری و زوو خراپ نابێت.

ئامازیس، بەر لەوەی کە ژیانی خۆی لەدەست بدات، دەستووری دابوو کە تەرمی هەندێك لەمردووە فەقیرەکان بەخەرجی خۆی مۆمیایی بکەن بۆ ئەوەي کە بزانێت باشترین مۆمیایی بۆ پاراستنی تەرمەکان کامەیە. چونکە شێوازی مۆمیایی کردنی تەرمەکان لەمیسردا بەپێی کات فەرق دەکات و لەهەر دەورەیەکدا زانایانێك پەیدا دەبن کە بۆ ئاگاداری تەرمەکان، لەڕێی مۆمیایی کردنی ئەوان، شێوازی نوێ دەگرنە بەر.

لە بەر ئەمەیە کە ئامازیس بۆ هەڵسەنگاندنی ئەوەی کە باشترین جۆری مۆمیایی کردنی بەدەن کامەیە، بۆ تاقیکردنەوە دەستووری مۆمیایی کردنی فەقیرەکانی دەدا و دوای ئەوەی کە ژیانی تەواو کرد، تەرمەکەی بەباشترین شێوە کە شیاو بوو، مۆمیاییان کرد و لەگۆڕدا ناشتیان و دوایی، کوڕەکەی بووە پاشای میسر.

کاتێ کە ئەم کوڕە جێی باوکی لەمیسردا گرتەوە، رووداوێکی سەرسوڕهێنەر لەو وڵاتەدا رووی دا و ئەوەش ئەوەیە کە لەشاری "تەبەس" کە دەکەوێتە بەشی گەورە و سەرەوەی میسردا باران باری.

هیچ میسرییەك نەیبینیبوو کە لەشاری تەبەس باران بباریٚ و هەروەها ئەمڕۆ هەرگیز لەو شارەدا باران ناباریٚت.

کاهینەکانی میسر لەبارەی دەرئەنجامی ئەم رووداوە، رای زۆریان دەربڕی، بەڵام هەموویان لەیەك بنەمادا لەسەر یەك قسەن و ئەوەش ئەوەیە کە لەمیسر رووداویٚکی نائاسایی دەرکەوت و ئەم رووداوە لەڕوانگەی میسرییەکانەوە، بەهۆی هیٚرشی کەمبوجیە شاهەنشای ئیٚران بوو.

بەتەواوی کاتیٚ سوپای کەمبوجیە شاهەنشای ئیٚران گەیشتە سەر سنووری میسر، فەرعەونی نویٚ لەیەکیٚك لەدۆڵەکانی رووباری نیل[٢]، چاوەڕیٚی سوپای ئیٚران بوو. رووباری نیل کاتیٚ دەڕوا بۆ دەریا، دەبیٚتە چەند بەش و هەر بەشیٚك لەو رووبارە، مەسەبیٚکی جیاواز دەهیٚنیٚتە ئاراوە.

نیٚوان مەسەبی ناوبراو کە فەرعەونی میسر لەویٚدا چاوەڕیٚی سوپای کەمبوجیە بوو، ریٚیەکی زۆر نەبوو، بەجۆریٚك کە خەڵەتاندنی یەکتریان دەبینی. لەم کاتەدا بەپیٚی دەستووری فەرعەونی میسر، کوڕەکانی (فانسیان) هیٚنا. چونکە فانس دوای ئەوەی کە لەمیسر ڕای کرد و رۆیشتە ئیٚران، کوڕەکانی خۆی لەمیسردا بەجیٚهیٚشت.

لەناوچەیەکدا، نیٚوان دوو سوپا، مەنجەڵیٚکی گەورەیان دانا و لەکاتیٚکدا فانس دەگریا، لەبەرچاوی ئەو، کوڕەکانیان یەك یەك سەر بڕی و خویٚنی ئەوانیان ڕژاندە ناو مەنجەڵەکەوە.

فەرعەونی میسر لەم رووەوە دەستی بەم کارە کرد، بۆ ئەوەی تۆڵەی ئەوە لەفانس بکاتەوە کە چووەتە ئیٚران و سوپای ئیٚرانی بەرەو میسر ریٚنمایی کردوە.

---

[٢] واتە مەسەبەکانی رووباری نیل – وەرگیٚڕ –

من ئەم کارەی فەرعەونی میسر بەهەڵە دەزانم، چونکە کوڕەکانی فانس بچوك بوون و ئاگایان لەوە نەبوو کە باوکیان مەبەستی ڕۆیشتنی هەیە بۆ ئێران تا سوپای ئێران بێنێتە میسر. ئەگەر ئاگاداریش بوونایە، بەپێی بچوکی تەمەنیان نەیاندەتوانی کە بەر لەکار و بڕیارەکانی باوکیان بگرن" کوشتنی ئەو کوڕانە لەبەرچاوی باوك، وەکو تۆڵە سەندنەوە لەفانس، بەڕای من کارێکی دژە بە دادوەری بووە.

دوای ئەوەی کە خوێنی کوڕەکانی فانس لەمەنجەڵی ناوبراودا ڕژا، فەرعەون دەستووری دا کە لەو مەنجەڵە گەورەدا ئەوەندە شەراب و ئاو بڕژێنن تا پڕ دەبێ و دوایی تۆزێکیان لەو خواردنەیە دا بە هەر سەربازێك و ئەنجا سەربازەکان دەستیان بە شەڕ کرد.

ئەم شەڕە زۆر مەترسیدار بوو و من بەپێی ئەوەی کە بەچاوی خۆم گۆڕەپانی ناوبراوم بینیوە، ئەم خاڵە دەڵێم کە. ئەگەر ئێوەش بچنە میسر و لەو ناوچەدا ئێسکە کوژراوەکان ببینن، بڕوا دەکەن کە شەڕی ناوبراو زۆر توند بووە.

هەر ئێستاش لەوێدا ئێسکەکانی ئەو میسرییانە کە لەشەڕدا کوژراون لەلایەکەوە و ئێسکەکانی ئەو ئێرانییانەی کە لەشەڕدا کوژراون لەلایەکی ترەوە کەوتوون و بینەر لەبینینی ئەو دیمەنە ترس سەرتاپای دادەگرێت.

کاتێ وا خەریکی بینینی ئەو ئێسکەکان ناوبراو بووم، چەند کەسی میسری لەلای منەوە راوەستابوون و دەیانووت لەو کاتەدا کە هێشتا ئەم لاشانە دانەڕزابوون، ئەگەر ئێوە سەیرتان بکردایە، دەتانبینی کە سەری هەندێك لەئێرانیەکان مووی نییە و کەچەڵن" لەکاتێکدا میسرییەکان هەموو قژیان هەبووە.

پرسیم بۆچی لەناو میسرییەکاندا کەسێك نابینرێت کە سەری بێ موو بێ ؟

میسرییەکان وتیان: بۆ چونکە میسرییەکان خوویان وایە لەمنداڵییەوە سەریان دەتاشن و بەسەری رووتەوە دەگەڕێن و هەتاو لەسەریان دەدا و لەم رووەوە مووی سەریان بەهێز دەکا" بەڵام ئێرانییەکان کڵاو لەسەر دەنێن و لەم رووەوە هەتاو لەسەریان نادات تا ئەوەی کە مووی سەریان بەهێز بکات و دوای ماوەیەك مووی سەریان دەوورێت و سەریان کەچەڵ دەبێت.

ئایا بەڕاستی هەتاو چۆن کە دەبێتە هۆی بەهێز کردنی گیاکان، ئاواشی سەریش بەهێز و بەردەوام دەکات؟

ئەمە بۆچوونێکە کە من ناتوانم لەبارەیەوە شتێك بڵێم، بەڵام میسرییەکان بیروڕایان وابوو.

لەو شەڕەدا سەربازەکانی ئێران زۆریان دلێری لەخۆیان نیشان دا و سەرەڕای ئەوەش میسرییەکان بەرگرییەکی زۆریان کرد" دەرئەنجام ئێرانییەکان سەرکەوتن و میسرییەکان پاشەکشەیان کرد و خۆیانیان گەیاندە شاری "مەمفیس" تا ئەوەی کە لەدیواری ئەو شارە کەڵك وەرگرن و لەپشتی دیوارەکەوە خۆیان لەمەترسی هێرش بپارێزن.

نەریتی ئێرانییەکان بەپێی شێوازێك کە کوورش بەجێی هێشتووە ئەوەیە کە هەرگیز لەکاتی شەڕ، دانیشتوانی وڵاتەکەیان نەدەکوشت و لەگەڵ ئەوەی کە دوژمن تەسلیم بوو، دەرفەتیان پێ دەدا و جگە لەوەش ماڵ و گیانی دەپارێزرا.

کەمبوجیە لەرەگەزی کوورش بوو و بەپێی شێوازی باپیری خۆی رەفتاری دەکرد و کەشتییەك کە نوێنەرێکی ئێرانی تیا بوو بەرەو شاری

مەمفیس نارد بۆ ئەوەی بەفەرعەونی میسر بڵێت کە هەرکات تەسلیم ببێت، ئێرانییەکان کارێکیان بەو و وڵاتەکەیەوە نییە و تەنیا شتێك کە لەفەرعەون دەیانەوێ، باجێکە کە ئەو بەپێی دەستوورەکانی هەر ساڵ دەبێ دەستی پاشای ئێران. بەباشی دیار نەبوو چ ڕووداوێك هاتە پێش کە کاتێك ئەم کەشتییە لەڕووباری نیل تێپەڕی و چووە ناو شاری مەمفیسەوە، هێرشی کردە کەشتی ناوبراو و تاڵانیان کرد و نوێنەری ئێران و هەموو سەرنشینەکانی کەشتییەکەیان پارچە پارچە کرد. من لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوەم کرد و تێگەیشتم کە ئەم کارە لەلایەن فەرعەونەوە نەکراوە و کاربەدەستان و سەربازانی میسریش دەستیان لەو کارەدا نییە" چونکە ئەوانە دەیانزانی کە ئێرانییەکان ڕاست دەڵێن و کاتێ بەکەسێك بەڵێن دەدەن، ئەو بەڵێنە بەجێ دێنن و درۆ وتن لەلای ئێرانییەکانەوە ئەوەندە ناشایستە کە هیچ کەس دووچاری ئەوە نابێت.

بەڵام خەڵك بەپێی نائاگایی لەرەوشی ژیان و ڕۆحیەتی ئێرانییەکان، یان بە هۆی ئەوەی کە بینیویانە هێزەکانی ئەوان شکستی خواردووە، دەستیان کردوە بەهێرش بۆ سەر کەشتییەکە و نوێنەر و سەرنشینەکانیان کوشتوە.

ئێرانییەکان هیچ چاوەڕوانی ئەم کردارەیان لەلایەن میسرییەکانەوە نەدەکرد. چونکە ئەوانە بەپێی نەریتی خۆیان وایان بیر دەکردەوە کە نوێنەرێك و هاوڕێیەکانی لەئۆردوگا، یان شاری دوژمن، پارێزراون و کەسێك زیانیان پێ ناگەیەنێ.

گەورەکان و زانایانی میسر پێمیان وت: لەو کاتەدا پاراستنی دیسپلین لەدەستی سەربازانی فەرعەون دەرچوو، ئەگینا بڕیار وانەبوو کە فەرعەون

و ئەفسەرەکان و سەربازەکانی میسر بهێڵن کە نوێنەرێك و هاوڕێیانی زیانیان پێ بکەوێ.

بەڵام کاتێك کە خەڵکی ئاسایی دەکەونە جوڵە، خۆیان تێناگەن چ دەکەن و بەجۆرێك دەست لەخۆیان بەردەدەن کە ڕەفتاری دوور لەعەقڵ لێیان دەردەکەوێت. ئەگەر دوای ئەو ڕووداوە فەرعەونی میسر خێرا نوێنەرێکی دەناردە لای کەمبوجیە و شی دەکردەوە و کەمبوجیە دەیزانی کە خودی فەرعەون و سەربازەکانی میسری دەستیان وەرنەداوەتە ناو ئەو کارە" کارەساتەکان بەو جێگایە نەگەیشت کە ئاوا زوو باسی لێ دەکەم. بەڵام فەرعەونی میسر کە تەنیا شەش مانگ بوو پاشایەتی دەکرد، ئەزموونی باوکی خۆی نەبوو و نەیدەزانی کە هێزی کەمبوجیە چەندە و وای بیر دەکردەوە کە دیوارە بەرزەکانی شاری مەمفیس دەپارێزێ.

کاتێ هەواڵی کوشتنی نوێنەر و هاوڕێکانی گەیشتە کەمبوجیە، زۆرکاری تێ کرد و وای بۆچوو کە فەرعەونی میسر مەبەستی شەڕی هەیە. هەستی نەتەوایەتیش کاری کردە سەر ئێرانییەکان.

ئەوانە لەگۆڕەپانی شەڕدا، هەندێك لەسەربازەکانی خۆیانیان لەدەست دا، بەڵام ئەوەندەی کوشتنی نوێنەری ناوبراو داخدار نەبوون. بەکورتی کەمبوجیە کەوتە ڕێ و گەمارۆی شاری مەمفیسیدا و ماوەیەکی پێ نەچوو کە شار نەیتوانی بەرگری بکات. لەکاتێکدا کە گەمارۆ درێژەی هەبوو، لیبی[1] نوێنەرێکی بۆ لای کەمبوجیە نارد و فەرمانبەری خۆی دەرخست و دیاری زۆریشی نارد.

کەمبوجیە دیارییەکانی ئەوی بەخۆشحاڵییەوە قبوڵ کرد و بەنوێنەری وت: بەپاشای خۆی بڵێت کە ئێمە ئەو بەپاشای وڵاتی لیبی دەزانین.

---

[1] لیبی وڵاتێکە، کەوتۆتە تەنیشتی میسرەوە.

**پاشای "سیرنائیك" کە ئەویش وڵاتێکی تر لەنزیکی میسرە، باڵوێزێکی لەگەڵ پێنج سەد دانە سکەی زیو وەکو دیاری بۆ کەمبوجیە نارد و ئەویش مل کەچی خۆی پیشان دا.**

**کەمبوجیە لەبارەی بێ بایەخ بوونی دیاری شتێکی نەوت" بەڵام من وا بیر دەکەمەوە کە ناڕازی بوو. چونکە سکەکانی لەناو سەربازەکانی خۆیدا دابەش کرد. بەوەشەوە متمانەی بەنوێنەری سیرنائیك دا کە دەسەڵاتی پاشایەتی ئەو وڵاتە بەفەرمی دەناسیێ.**

**دەبێ تێبگەی کە دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمەی "لیبی" و "سیرنائێك" ترسابوون و وایان بیر دەکردەوە کە دوای میسر، کەمبوجیە سوپا دەباتە ناو وڵاتەکانیانەوەو لەم ڕووەوە مل کەچی خۆیان پیشان دا.**

❋❋❋

# دوای ئەو رووداوە ناخۆشە، چ کارەساتێك رووی دا

"پسامیتۆس" فەرغەونی میسر و هەندێك لەئەفسەرەکانی دوای ئەوەی کە شاری "مەمفیس" کرایەوە، نێردران بۆ شوێنێك لەدەوروبەری شار و پاشای ئێران پەیامی بۆ فەرعەونی میسر نارد کە ئێمە لەبارەی ئەم رووداوە لێکۆڵینەوەمان کردوە بۆمان دەرکەوت کە لەلایەن ئێوەوە نیاز خراپی نەبووە و ئەم کارە بەدەست برێك لەخەڵکی نەفامەوە رووی داوە.

فەرعەون لەوەڵامی کەمبوجیەدا وتی: ئایا ئێوە رازی دەبن کە خودی من دەستووری سزادانی تاوانباران دەربکەم؟

کەمبوجیە وتی: دوای ئەوەی کە لەنێوان ئێمەدا ئاشتی ساز کرا، ئێوە دەتوانن هەر دەستوورێك کە بە پێویستی بزانن دەری بکەن و لەم رووەوە سزادانی تاوانبارانی ئەم رووداوە لەئەستۆی منداییە.

شوێنی سزادان لەناوچەیەکدا بوو کە تاوانباران بۆ ئەوەی بگەنە ئەوێ، دەبوایە لەبەرامبەر کۆشکەکەی فەرعەونەوە تێپەڕ بن و لەکاتێکدا ئەوانە دەرباز بوون، پیاوێکی بەساڵاچوو لەسەربازانی ئێرانی نزیك بۆوە و داوای یارمەتی لێیان کرد و شێوازی داوای یارمەتیەکی گەواهی دەدا کە ئەو لەرابردوودا سواڵکەر نەبووە. فەرعەون کە ئەوی بینی، بەناو بانگی لێ کردو ئەو پیاوە سەری بەرز کردەوە.

فەرعەون وتی: فلانی، چیت لێ قەوماوە و بۆچی کەوتوویتە سواڵکردن؟

پیاوی بەساڵاچوو دەستەکانی بەجۆرێك جوڵاند کە دەتوت دەیەوێت بڵێت (نەریتی دنیا وەهایە) یان ئەوەی کە لە(بەرامبەر چارەنووسدا ناتوانی بەرگری بکەیت).

فەرعەون لەبەر ئەم قسەیە کەوتە گریان.

کەمبوجیە هەواڵی گریانی ئەوی بیست و وتی: کاتێ تاوانبارەکانیان لەبەردەم ئێوەوە دەبرد، سەرەڕای ئەوەی دەتانزانی کە سزای تاوانباران چییە، نەگریان و چۆن بوو کە لەسەر کاری بینینی پیاوێکی بەساڵاچوو کە سواڵی دەکرد، کەوتنە گریان.

فەرعەون وتی: چونکە ئەو پیاوەم دەناسی و دەمزانی کە لەرابردوودا دەوڵەمەند بوو و زۆر ئازاراوییە کە ئینسان لەگەنجیدا توانا بێت و لەپیریدا بکەوێتە سواڵ کردن. لە بەر ئەمە کەوتمە گریان. یەکێك لەتاوانباران، کوڕەکەی فەرعەون بوو و کەمبوجیە خێرا دەستووری دا کە لەسزادانی کوڕی ناوبراو و تاوانبارانی دیکە واز بێنێت و ئەم ڕووداوە بووە هۆی شادمانی دانیشتوانی شاری مەمفیس.

کاتێ مەمفیس کرایەوە، بیروڕای هەندێك وا بوو کە دانیشتوانی شار چونکە نوێنەری ئێران و هاوڕێکانی ئەویان کوشتووە، دەبێت هەموویان بکوژرێن. کەمبوجیە وتی: ئەمە لەبیر خۆتان بەرنەوە، چونکە لەم جۆرە کاتانەدا، تاوانبارەکان کەمن و کەسانی دیکە کە لەتاواندا بەشدار نەبوون و لەدادوەری بەدوورە کە هەموو دانیشتوان بکوژرێن و تەنیا تاوانباران وکەسانێك کە لەکاتی خەتا کردندا بینراون و لەخەتای ئەوانەدا گومانێك نییە، دەبێت سزا بدرێن.

ئەو کات دانیشتوانی مەمفیس زانیان کە کەمبوجیە دوژمنایەتی لەگەڵ ئەواندا نییە و لەنێوان ئەو و هەندێك لەسەردارە سەرکەوتووەکاندا،

جیاوازییەكی زۆر هەبوو. چونكە ئەنجامی شەڕدا، بەجێ هێنانی ئەركە ئایینیەكانی میسرییەكان، راوەستێنرابوو. كەمبوجیە وتی: پەرستگای خۆتان بكەنەوە و خەریكی ئەنجامدانی ئەركە ئایینیەكانی خۆتان بن، چونكە هەر بەوجۆرە كە گیان و مالّی ئێوە دەپارێزێت، كەسێك لەئێمە كاری بەئایینی ئێوە نییە.

لە بەر ئەوەی لەم كاتەداهەوالّ گەیشت كە لەوانەیە لەلایەن ئەفسەر و سەربازەكانی كەشتییە جەنگییەكانی فەرعەون شۆڕشێك لەسەر كەمبوجییە دەست پێبكات. پاشای ئێران پەیامی نارد بۆ فەرعەون كە بەهێزەكانی جەنگی خۆی دەستوور بدات كە لەهەر جۆرە هەستانێكی جەنگی خۆ بپارێزێت. چونكە ئەگەر ئەوانە دەست بەسەرهەلّدان و نارازی بوون بكەن، ئێمە ناچارین كە دیسان دەست بەشەڕ بكەینەوە و لەم رووداوە ولاّتی ئێوەش زەرەر دەبینیّ" فەرعەون خێرا كاپیتانی كەشتی ئەركدار كرد كە بڕوات و بەكاپیتانەكانی جەنگی بلّێت: ئەگەر شەڕ دەست پیّ بكەن، كاری ئەوانە وەكو سەرهەلّدان لەدژی خودی فەرعەونە و تاوانباران سزا دەدرێن.

كاپیتانەكان كە هێزەكانی خۆیان بۆ شەڕ ئامادە كردبوو، لەم كارە دوورەپەرێزییان كرد و سەربازەكانیان بەردا و هەندێك لەهێزەكانی ناوبراو ئەوەندە گەورە بووە كە نەیاندەتوانی بچنە ناو رووباری نیلەوە و هەوالّنێری فەرعەون بۆ ئەوەی كە دەستووری ئەو بەوانە رابگەیەنێت، ناچار بوو كە هەموو درێژایی رووباری نیل بپێون و خۆیان بگەیەننە دەریا و ئەم دەستوورە بلاّو بكاتەوە بۆ كاپیتانەكانی ئەو كەشتییانە كە لەكەناری دەریا بوون. كەمبوجیە لەبینینی داب و نەریتی میسرییەكان سەری سوڕما و وتی: ئەم گەلە قایل و زەحمەتكێشن.

یەکێك لەو کارانە کە کەمبوجیە لەمیسردا کردی ئەمە بوو کە لەزانایانی میسری دەعوەت کرد کە لەگەڵ ئێرانییەکاندا لەبارەی ساڵی هەتاوی و ئەستێرەکانی ئاسمان دا گفتوگۆ بکەن تا ئەوەی کە هەر کام لەوانە ئەگەر زانیارییەکی کەمتری لەوانی تر هەیە، لەوە سود وەربگرێت.

بینینی هەرەمەکانی گەورەی میسریش لەو شتانە بوو کە بووە هۆی سەرسوڕمانی کەمبوجیە ومیسرییەکان پەرتووکێکیان پێ نیشان دا کە لەوانەدا مێژووی پێکهاتەی هەرەمەکان و ئەوەی کە چۆن دروست بوونە دەخرایە بەرچاو. کەمبوجیە دانی بەوەدا نا کە پێکهاتەی هەرەمەکانی میسر، کارێکی گەورەیە لەبورای بیناسازیدا.

سەرەڕای ئەوەی کە لەتەنیشتی میسر، وڵاتی عەرەبستان هەیە و لەوێدا وشتر زۆرە، ئێرانییەکان لەمیسر وشتری کەمیان بینی و بینیان کە میسرییەکان بارەکانی خۆیان زیاتر بەگوێدرێژ دەگوازنەوە و لەو ناوچانەدا کە لەکەناری رووباری نیلن، گەورەترین کەرەستەی گواستنەوە هەر بەلەم و کەشتییە کە میسرییەکان لەدروست کردنیدا کارامە بوون.

کەمبوجیە بیستی کاتێ کە ماسی دەچێتە ناو رووباری نیلەوە بۆ ئەوەی کە لەسەراوی چۆمەکە زاوزێ بکەن رادەیان ئەوەندە زۆر دەبێت کە هەندێ جار بەلەمەکان لەجوڵە وەستان و ئەم بابەتەش من لەسەفەرێکدا کە بۆ میسر کردم، بینیم (نووسەر لەم جۆرە ماسییە ناو نابات و ناڵێت چ جۆرە ماسییەك بووە کە بۆ هێلکە دانان دەچووە ناو رووبارەوە، واتە لەدەریاوە دەچووە ناو رووبارەکەوە).

ئێرانییەکان کاتێ دەیانبینی کە دانیشتوانی ناوچەکە، مارمێلکە گەورەکانی رووباری نیل، کە هەر یەك لەوانە بەدرێژی چەند مەتر دەبن و دەتوانن ئینسان قوت دەن، راو دەکەن و بەشێك لەگۆشتی لاشەی ئەوانیان

دەخوارد، سەریان سوڕدەما. (ئەمڕۆ رووباری نیل لەم مارمێلکە گەورانەی ناسراو بە "تیمساح" ی نییە" مەگەر لەناوچەکانی ناوەندی ئەفریقیا – راولینسۆن). چونکە تیمساح بە لای ئێرانییەکانەوە لەگیانلەبەرانی پیسە و وەکو مار بەگیانلەبەرێکی ئازاردەر دەناسرێ و خواردنی گۆشتی تیمساح بەباش نازانن.

من ئەم تیمساحانەم لەڕووباری نیل دا بینی و یەکەمین جار لەبینینی ئەوانە ترسام و میسرییەکان پێیان وتم: کە ئەم تیمساحانە لەوشکیدا ناتوانن بکەونە شوێن ئینسان. بەڵام ئەگەر کەسێك لەناو ئاودا رووبەڕووی ئەم گیانلەبەرانە ببێتەوە، لەدەستیان دەرناچێت. من بیستوومە کە میسرییەکان لەکۆندا، تیمساحیان بە بەشێك لەو گیانلەبەرانە دەزانی کە جێگای رێز لێنانن، بەڵام لەسەفەرێکدا بۆ میسر لەم نەریتە شتێکم نەبینی و ئەگەر کۆن ئەم بیروڕایانە هەبۆوبێ، لەوانەیە گۆڕاونی و ئەمڕۆ چیتر رێز لەتیمساح ناگرن.

ئێستا بهێڵن کە لەبارەی کۆتایی کاری "سپامی توس" فەرعەونی میسر، مێژووتان بۆ بگێڕمەوە.

دوای شۆڕشێك کە دانیشتوانی شاری مەمفیس کردیان و نوێنەری ئێرانیان لەگەڵ هەموو هاوڕێکانی دا پارچە پارچە کرد، لەچەند ناوچەی تۆدا، دیسان بەهەرا و هوریا خەڵك دژی کەمبوجیە، شۆڕش کرا. بەڵام پاشای ئێران هیچ کام لەو شۆڕشانەی لەچاوی سپامی توس دا نەدەبینی" یان ئەوەی کە هۆکارێکی لەبەردەستدا نەبوو کە ئەو هاندەری ئەو شۆڕشانە بووبێ. و لەگەڵیدا بەڕێزەوە رەفتاری دەکرد و پاشایەتی میسری خستە ئەستۆیەوە.

چونکە ئەم نەریتی جوامێرییە لەئێرانییەکاندا هەیە و پاشا ئێرانییەکان سەبارەت بەوپاشایانە کە لەگەلی ئێران شکست دەخۆن، بەڕێزەوە

ڕەفتاریـان لەگەڵـدا دەکـەن و پاشـایەتی لـەو وڵاتـەدا بـەخودی ئەوانـە دەبەخشنەوە.

لەدەورەی پاشایەتی هەخامەنشییەکاندا هیچ پاشایەکی بیانی بەقەد "تـانی ڕاس" پاشـای وڵاتـی لیبیـا زەرەری لەئێرانییـەکان نـەدا. لـە گـەڵ ئەمەشدا کاتێ ئێرانییەکان وڵاتی لیبیایان گرتـە دەسـت، تـانی ڕاس- یـان کردە پاشای ئەو وڵاتە و پاشایەتییان بەخشی بەخودی ئەو.

ئەمە بوو لەدوای کۆتایی شەڕ، کەمبوجیە لەپسامی توس تەنیا شتێکی ویـست و ئـەوەش ئـەوە بـووە کـە بـەڵێن بـدات هـەرگیز دژی پاشـای ئێـران شۆڕش نەکات" یان کەسانی دیکە هان نـەدات بـۆ شـۆڕش کـردن. پـسامی توس ئەم بەڵێنەی دا و کەمبوجیەش دڵنیا بوو و پاشایەتی وڵاتـی خـستە ئەستۆیەوەو پسامی توس وەکو رابردوو بەهێزەوە فـەرمانڕەوایی کـرد تـا ئـەوەی گـە کەمبوجیـە زانـی کـە پـسامی تـوس دژی ئـەو دەسـتی کـردووە بەدابین کردنـی کەرەسـتەی شـۆڕش و چونکە پـسامی تـوس بەپێچەوانەی بەڵێن و پەیمان ڕەفتاری کردبووو بەڵێن و پەیمانیش لای ئێرانییـەکان زۆر شتێکی گرنگە. کەمبوجیە ئەنجوومەنێکی خستە ڕێ بۆ دادوەری و کاتێ لێکۆڵینەوەی کرد کە پسامی توس بەپێچەوانەی بەڵێن و پـەیمان شـۆڕشـی کردبوو، پێیان وت: کە خوێنی گای نێر بخواتـەوە و ئـەویش خـوێنی گـای نێری خواردەوە و کۆتایی بەژیانی خۆی هێنا.

چونکە خـوێنی گـای نێـر دوای ئـەوەی کـە چـووە نـاو سـکی مرۆڤـەوە، لەوێـدا دەمـەیێ و لەئەنجامـدا دەبێتـە هـۆی مـردن و لـەم ڕووەوە پـسامی توس ماڵئاوایی لەژیان کرد.

***

## وەفدە نێردراوەکانی ئێران لەوڵاتی حەبەشە:

لەو خاڵانەی تر کە من بیستم، کە باوەڕی پێ ناکەم، ئەوەیە کە کەمبوجیە تەرمی ئامازیسی باوکی پسامی توسی لەگۆڕ دەر هێنا و سووتاندی.

من لە بەر ئەم دوو هۆکارە ئەم باسە بە راست نازانم:-

یەکەم: ئەوەی کە ئێرانییەکان بۆ مردووەکانی گەلانی تر ڕێز دادەنێن، بەتایبەت کە مردووەکە فەرعەونێك بێت.

دووەم: ئەوەی کە ئاگر بەلای ئێرانییەکانەوە رەگەزێکی خاوێنە و لەهیچ شتێکی نادەن و هەرگیز زیندەوەرێك یان مردوویەك بەوە ناسوتێنن. چونکە وا بیر دەکەنەوە کە ئەمە ڕێز لەئاگر نەگرتنە و یەکێك لەو هۆکارانەی کە ئێرانییەکان مردووەکانی خۆیان ناسووتێنن، هەر ئەم ڕێز گرتنەیە کە بۆ ئاگر هەیانە و لە بەر ئەم دوو هۆکارە من پێم وانیە کە تەرمی ئامازیسیان سووتاندبێت.

لەدەورەی مانەوەی خۆی لەمیسردا، کەمبوجیە، شاندێکی ناردە لای پاشای حەبەشە و ئەوانە هەڵگری ئەم دیارییانەی خوارەوە بوون. لەلایەن پاشای ئێران بۆ پاشای حەبەشە:

"کۆمەڵێك ئەرغەوان - زنجیرێکی ئاڵتونی کە بۆ جوانی بیکەنە مل - تورەکەیەك لەبەردی کارەبا - قاپێك پڕ لەشەرابی خورما".

ئەم شاندە کاتێك کە گەیشتنە حەبەشە، لەبینینی گەلی ناوبراو سەریان سوڕما، چونکە بیستیان کە لەو وڵاتە هەرکەس سەد و بیستساڵ تەمەنی دەبێ.

کاتێ کە شاندی ناوبراو چووە لای پاشای حەبەشە، پاشای ئەو وڵاتە لەبارەی ئەرغەوان پرسیاری لێیان کرد تا ئەوەی کە گەیشتە سەرەی شەراب.

ئێرانییەکان بۆ پاشای حەبەشەیان روون کردەوە کە ئەو ئاوەی کەلەناو قاپەکەدایە، شەرابە و کاتێ ئینسان خواردیەوە، سەرخۆش دەبێت و چێژی لێ دەبینێت" پاشای حەبەشە تۆزێکی خوارد و بەسەرخۆشی دەرکەوت و وتی: لەوڵاتی ئێوەدا خەڵك تەمەنیات دەگاتە چەند؟

ئەو کەسەی کە بەرپرسی شاند و نوێنەر بوو، وتی: لەوڵاتی ئێمەدا خەڵك بەگشتی زیاتر لەهەشتا ساڵ تێپەڕ ناکات.

پاشای حەبەشە وتی: کەسانێك کە وەها خواردنەوەیەکیان هەیە و دەتوانن بیخۆنەوە" هەشتا ساڵ تەمەنیان بوو بەسە" چونکە بەڕادەی پێویست، لەتەمەنیان چێژ دەبینن" دوایی پاشای حەبەشە لەئێرانییەکان پرسیاری کرد کە خواردنی پاشای ئێوە چییە؟ ئەوان وتیان: کە پاشای ئێمە وەکو نۆکەرەکانی خۆیان، نان و گۆشت دەخوات.

پاشای حەبەشە پرسیاری کرد: نان چۆنە؟ ئێرانییەکان جۆری دروست کردنی ئەو نانەیان لەگەنم بۆ شی کردەوە و لەبارەی خودی گەنمەکەوە شرۆڤەیەکیان خستە بەردەستی و ئەو حەزی کرد گەنمەکە ببینێت و لەوڵاتی خۆیدا بیچێنێت.

نوێنەری ئێران لەپاشای حەبەشە پرسیاری کرد: ئێوە چ دەکەن کە ئەوەندە تەمەنتان درێژ دەبێت و بەشێوەیەکی ئاسایی خەڵکی ئێوە لەتەمەنی سەدوبیست ساڵیدا ئەم دنیایە بەجێ دێڵێت؟

پاشای حەبەشە وتی: بە تەمەنکانی ئێمە زیاتر لەمەش ژیان دەکەن و ئەگەر ئێوە لەم وڵاتەدا بگەڕێن، کەسانێك دەبینن کە تەمەنیان سەدوچل ساڵە" بەڵام ئەو شتەی دەبێتە هۆی ئەوە کە ئێمە تەمەن درێژ بین، ئەویش ئەوەیە کە دوای تەمەنی لاوێتی لەخواردنی گۆشت پارێز دەکەین و تەنانەت لەدەورانی گەنجیدا، زۆربەی خواردنی ئێمە شیر و ماستە و بۆمان دەرکەوتووە کاتێ کە لەدەورانی گەنجیدا گۆشت دەخۆین حاڵمان قورس دەبێت و هەست بەئازار دەکەین.

نوێنەری ئێران لەپاشای حەبەشە پرسیاری کرد: بیستوومە کە ئێوە تەرمی مردووەکانی خۆتان دەخەنە ناو تابووتی بلوری، ئایا ئەم وتەیە راستە؟

پاشای حەبەشە وتی: بەڵێ، راستە و ئێمە تەرمی مردووەکانمان دەنێینە ناو تابووتە بلورییەکان و تەرمەکانی ئێمە لەم تابووتانەدا هەرگیز خراپ نابێت" دوایی پاشای حەبەشە یەکێك لەمەحرەمەکانی خۆی بانگ کرد و پێی وت بچێت و تەرمی مردووەکان بەنوێنەری ئێران و هاوڕێکانی نیشان بدات.

ناوبراو نوێنەری ئێران و هاوڕێکانی لەگەڵ خۆیدا برد و شوێنێکی لەدەرەوەی شار پێ پیشان دا کە لەوێدا خانوویەکی زۆر گەورە هەبوو کە لەناو خانووەکەدا چەندین تابووتی بلوورییان لەسەر یەك دانابوو و نوێنەری ئێران کاتێ کە چووە ناو خانووەکە، هیچ بۆنێکی خراپی نەکرد، کە گوزارە بۆگەن بوونی تەرمەکان بکات.

لەو کەسە حەبەشیە کە لەگەڵیدا بوو، پرسیاری کرد: بۆچی من لێرەدا بۆنی خراپ بوونی تەرمەکان ناکەم؟

ئەو لەوەڵامدا وتی: چونکە تەرمەکانی خۆمان پێش ئەوەی بنێینە ناو تابووتەوە، وەکو تەرمەکانی میسری مۆمیایی دەکەین و دوایی دەیانخەینە ناو تابووتە شوشەییەکان و ئەم تەرمانە ماوەی ساڵێك کە لەناو تابووتدا مانەوە، لەهەمان خانوودا کە مردوون، دەمێنن و کەس و کاری و بنەماڵەکە دەیانبینن" دوای تێپەڕ بوونی ساڵ، تەرمەکان دەهێننە ئەم شوێنە و کاتێ کە ئەم خانووە پڕ بوو لەتابووت بلوری ، ئەو کاتە دەرگاکەی لەدیوار دەگرین.

پیاوی حەبەشی بەپەنجە، ئەو خانووانەی کە ، نیشانی نوێنەری ئێرانی دا گیرابوون و وتی: ئەو خانووانەی دەیانبینی، پێشتر وەکو ئەم خانووە بوون چونکە پڕ کران لەتابووت بلوری ، دەرگای خانووەکەیان بەدیوارێك بەست.

ئەو کاتە بەرەو کانیاوێك ڕۆیشتن و پیاوی حەبەشی ئاوی ئەو کانییەی نیشانی نوێنەری ئێران دا و پارچە چێوێکی خستە ناو ئاوەکە و چێو چووە ناو ئاوەکە (بەڵام من بەم بەشە باوەڕ ناکەم، چونکە زەحمەتە کە چێو بچێتە ناو ئاو، مەگەر ئەوەی کە چێوەکە تەڕ و قورس بێت) و وتی: سەیر کەن، ئاوێك کە ئێمە دەیخۆینەوە، چەندە سووکە" کە تەنانەت چێوی وشك دەچێتە ژێر ئاوەکە" ئەم بابەتە گەلێك بووە هۆی سەرسوڕمانی نوێنەری ئێران. دوایی بەرێنمایی پیاوێکی حەبەشی ڕۆیشتنە شوێنێك کە لەوێدا پیاوانی سەدوسی ساڵە و سەدوچل ساڵە و تەنانەت پیاوێکی سەدوپەنجا ساڵەش هەبوو و پیاوی حەبەشی وتی: ئەمانە تەمەن درێژەکانی ئێمەن، چونکە تەنیا شیر و ماست دەخۆن" گەیشتوونەتە ئەم تەمەنە.

نوێنــەری ئێــران لەگەڕانــەوە لــەوڵاتی حەبەشــەدا ئــەم خاڵانــەی بــە کەمبوجیە ڕاگەیاند و پاشای ئێران – یش حەزی کرد وڵاتێك کە وەها پیاوانێکی بەتەمەنی هەیە، ببینێت و نهێنی تەمەن درێژی لەوانەوە فێر بێت و لەگەڕانەوە بۆ ئێران، ژێردەستانی خۆی فێر بکات چیبکەن تا وەکو حەبەشییەکان، تەمەن درێژ بن.

نوێنەرێك کە ڕۆیشتبووە حەبەشە تا زانیارییە پێویستەکان بهێنێتەوە، بەکەمبوجیەی وت: ئێوە بۆ ڕۆیشتن بەرەو حەبەشە پێویستیتان نییە کە لەڕێدا ئاو هەڵگرن. چونکە ڕووباری نیل کە لەناو میسرەوە دەڕوات، لقێکی لەحەبەشەوە دێت و ئێوە هەر ئەوەندەی کە درێژایی لقی ناوبراو بگرنە بەر و بچن بەرەو پێشەوە، دەگەنە حەبەشە و هەر لەوێدا، ئاو لەبەر دەستتاندا هەیە" بەڵام نوێنەری ئێران کە خۆی لەسەرەتای ئەو ڕووبارەوە بۆ حەبەشە نەڕۆیشتبوو، نەیدەزانی کە لەکەناری ڕووباری نیلدا دارستانی گەورە هەیە کە لەناوەڕاستیدا زیندەوەرانی دڕندە و بەتایبەت شێرەکان دەژین" بڕێك لەدارستانەکانی ناوبراو ئەوەندە چڕ و پڕن کە دەربازبوون لێیان زۆر زەحمەتە.

کەمبوجیە بەگوێرەی زانیارییەکانی نوێنەری ناوبراو لەگەڵ هەندێك لەسەربازانی یۆنانی بە درێژایی ڕووباری نیل بەرەو حەبەشە ڕۆیشت تا ئەوەی کە گەیشتە دارستانە چڕ و پڕەکان و بینی کە دەربازبوون لەو دارستانانە.

بۆیە گەڕایەوە و لەڕێگایەکی ترەوە واتە لەڕێگەی دەشتەوە بەرەو حەبەشە ڕۆیشت و لەم ڕێگایەداله بەر ئەوەی کە ئاو نەبوو، گەلێك دژواری هاتە ئاراوە.

***

# کوشتنی "بردید" بەدەستی داریووش

لەگەڕانەوە لەو سەفەرەدا بەر لەوەی کە کەمبوجیە جارێکی تر بەرەو حەبەشە بڕوات، هێزگەلێکی بەرەو خێڵەکانی ئاموونیان نارد[1]

لەشاری "تەبەس" لەمیسر تا ناوچەی دانیشتنی ئەو خێڵانە دە ڕۆژ ڕێ بوو" بەڵام لەنێوان ئەم دوو ناوچەیەدادا، دەشتێکی لمین هەبوو و کاتێ کە ئەو هێزانە بەوێدا تێپەڕین بایەکی قایم هەڵی کرد و بوو بە تەپ و تۆزێك کە ڕۆژی رووناکی کردە شەو.

ئەم ڕووداوە لەچوارەمین ڕۆژی ڕێپێوانـدا ڕووی دا و لەبەر ئەوەی بەهۆی ئەم زریانەوە ڕێناسەکانی سوپا ون بوون، گەڕانەوەی سوپای ئێران بەدژواری ئەنجام درا. هێزێك کە کەمبوجیە بۆ لای خێڵەکانی ئاموونیانی نارد، چل یان پەنجا هەزار کەس بوو و لەم تاقمە نزیکەی هەزار کەس بێ سەروشوێن بوون. بەڵام لەهەفتەکانی دوایی، هەندێك لەوانە توانیان بگەڕێنەوە بۆ تەبەس.

چونکە ئاوارەکان دوای تەواو بوونی زریان بە هۆی ئاراستەی خۆرەوە خۆیانیان گەیاندە قەراخی نیل و ئاویان خواردەوە و لەمەترسی دەرباز بوون.

---

[1] بەڕای گشتی ئەم خێڵانە هەر ئەوانە بوون کە لەدەورەکانی دواییدا، ناوچەی نیشتەجێ بوونیان، "ئەوبە" بوو – راولینسون – وەرگێڕانی ئەم مێژووە لەیۆنانی بۆ ئینگلیزی، راولینسون کردوویەتی و لەئینگلیزی بۆ فارسی، زەبیحوڵڵای مەنسووری کردوویەتی.

خێرا دوای ڕووداوەکەی "ئاپلیس"، بۆ میسرییەکان ئاشکرا بوو" وە "ئاپلیس" یەکێك لەخواکانی میسرە کە دانیشتوانی ئەو وڵاتە، ئەوە بەوێنەی گایەکی پیرۆز دروستی دەکەن.

ئاشکرابوونی ئەو خوایە بۆ میسرییەکان کاتێکی دیاری کراوی نییە و هەرکات کە ئاشکرا دەبێت، کاهینەکان دەرکەوتنی ئەو بەخەڵك ڕادەگەیەنن و دانیشتوانی وڵات بەبۆنەی ئەوەوە جەژن گێڕن.

کاهینەکان لەو کاتەدا بەیەکجاری ڕادەگەیەنن کە ئاپلیس ئاشکرا بووە و لەم ڕووەوە دانیشتوانی میسر، بەو بۆنەیەوە جەژنیان گێڕا و کەمبوجیەش کە بینی خەڵك خەریکی شاییە، سەری سوڕما و دوایی وابیری کردەوە چونکە بۆ هێزی ئێران لەسەفەردا بەرەو ناوچەی ئاموونیان ڕووداوێکی نالەبار ڕووی داوە، لەم ڕووەوە دانیشتوانی ناوچەکە جەژن دەگێڕن و دوایی دەرکەوت کە ئەوانە بۆ بەرپا کردنی مەراسیمی ئایینی خۆیان جەژنیان گرتووە.

پاشای ئێران حەزی کرد کە ببینێت سەمبولی خوای میسرییەکان، چۆنە و چ دەبێت کە بەیەکجاری کاهینەکان ڕادەگەیەنن کە ئاپلیس دەرکەوتووە.

لەم ڕووەوە کاهینەکان، گای ناوبراویان هێنایە لای کەمبوجیە و پاشای ئێران بینی کە گای ناوبراو ڕەشە و لەناوچاوانیدا، پەڵەیەکی سپی بەشێوەی چوارگۆشە هەیە و لەدوایەوە وێنەیەك وەکو هەڵۆ دەبینرێت و کلکی گاکە زیاترە و لەسەر زمانیشی پەڵەیەك دەبینرێت.

کاهینەکان بۆ کەمبوجیەیان ڕوون کردەوە کە هەرکات لەوڵاتی میسر گایەك بەم شێوە و نیشانانەوە بدۆزرێتەوە، نیشانەی ئەوەیە کە ئاپلیس دەرکەوتووە.

کەمبوجیە پرسیاری کرد: ئایا گوێلک دوای لەدایك بوون دەبێتە خاوەنی ئەم تایبەتمەندییانە؟

کاهینەکان وەڵامیان دایەوە: نە، دەبێ ماوەیەك تێپەڕ بێت و گوێلکەکە گەشە بکات تا ئەوەی کە دەربکەوێت ئایا خاوەنی ئاسەواری ناوبراو هەیە یان نا؟

جارێك روو دەدات کە گوێلکێك خاوەنی یەك یان دوو نیشانە لەنیشانەکانی ناوبراو بێت. بەڵام ناتوانی هەر بەم دوو نیشانە راوەستیت و دەبێت سەبر کەیت تا ئەوەی کە زیاتر گەشە بکات و هەرکات لەدەورەکانی دوایی، نیشانەکانی دیکە دەرکەوت، ئەو کات بەڕاستی دەزانیت کە ئاپلیس دەرکەوتووە.

ئێستا دەگەینە بابەتێك کە لەبارەیەوە چەند باسێك وتراوەتەوە. چونکە من مێژوونوسم، ناچارم لەم باسانە بگێڕمەوە. بەبێ ئەوەی کە هیچ کام لەوانە پەسەند بکەم، چونکە کاتێ لەبارەی رووداوێکەوە چەندین باس هەبوو" هیچ کام لەو باسانە ناتوانی بە سەرەکی بزانیت.

کەمبوجیە برایەکی هەبوو ناسراو بە "ئیسمردیس"[1] ئەم برایە لەوڵاتی میسردا لەگەڵ کەمبوجیە دەژیا و دوایی ئەوی نارد بۆ ئێران.

کەسێك نەیوتووە کە بۆچی کەمبوجیە براکەی خۆی کە لەباوکەوە برا بوون، نارد بۆ ئێران. بەڵام دوای ئەوەی کە چووە ئێران، لەو وڵاتە کوژرا. گروپێك دەڵێن کە کەمبوجیە کەسێکی بەناو "پەری ئەسپ" ی کردووەتە بەرپرسی کوشتنی ئەو" چونکە شەوێك لەخەودا بینی کە (بەردیە) لە سەر کورسییەکە دانیشتووە و تاجێکی لەسەر ناوە و سەری ئەوەندە بەرزە کە دەگاتە ئاسمان. کەمبوجیە لەم خەوە پەشۆکاوە "پەری ئەسپ" ی

---

[1] ناوە فارسییەکەی "بردیە"یە – وەرگێڕ -

ناردووه بۆ کوشتنی ئەو. هەندێکی تر دەڵێن کە "بەردیە" لەراوگەدا کاتێك کە خەریکی راو بوو، بە هۆی پەلاماری جانەوەرێك کە، لەوانەیە بەراز بووبێ، کوژراوە. هەندێکی تریش دەڵێن کە (پەری ئەسپ) بەگوێرەی دەستووری کەمبوجیە، لەراوگەدا ئەو، دەکوژێ و لەنێوان ئەم دوو داستانە جۆراوجۆرەدا چۆن دەتوانێ یەکێك لەوانە پەسەند بکات.

تاقمێکیش دەڵێن کە "بەردیە" لەکەناری دەریای سووردا کوژراوە و نێوان دەریای سوور و ئێران رێگایەکی زۆرە و ئەگەر سەرنج بدەینە چیرۆکی دوایی، وەها بەراورد دەکرێ کە (بەردیە) لەمیسردا کوژراوە.

لەوەها کاتێکدایە کە کاری مێژوونوسێك دژوار دەبێت" چونکە ناتوانێت راستی لەنێوان وتە جۆراوجۆرکاندا دەربێنێت.

کاتی گەڕانەوە لەمیسرەوە، کەمبوجیەگەیشتە شاری "ئاك باتانا" لەولاتی سووریا و بیستی کە جاڕچییەك لەناو شاردا بانگەوازی دەکات کە (بەردیە) پاشای ئێرانە و لەو فەرمان وەربگرن.

کەمبوجیە لەم قسەیە زۆر سەری سوڕما و بە توندی سەیری پەری ئەسپەکەی کرد کە لەبەرامبەریدا دانیشتبوو، وتی: ئایا دەستوورەکە وا جێبەجێ دەکەی؟ وە ئەگەر دەستوورەکەی منت جێبەجێ کردووە، ئەم جاڕچییە چ دەڵێت و چۆن بەردیە خۆی بەحاکم دەزانێت.

پەری ئەسپەکە وتی: من دەستووری ئێوەم هەر بەم دوو دەستەی خۆم کە دەیبینن، جێبەجێ کردووە و بەم دوو دەستەش بەردییەم ناشتووە و ئەگەر ئێوەش ئەم جاڕچییە بانگ بکەن و لێی بکۆڵنەوە" دەزانن کە من درۆم لەگەڵتاندا نەکردووە. کەمبوجیە جارچییەکەی بانگ کرد و پرسیار لێ کرد: تۆ بۆچی بانگەواز دەکەی کە بەردییە پاشای ئێرانە.

جاڕچی بانگەوازەکە وتی: چونکە ئاوەها دەستووریان پێم داوە.

کەمبوجیە وتی: ئایا خودی بەردییە دەستووری پێت داوە؟

جاڕچی وتی: من خودی بەردییەم نەدیوە و یەکێك لەکاربەدەستانی ئەو ی‌وتـووم کـە بانگـەوازێکی وا بکـەم و هـەمان کاربەدەسـت، جاڕچـییەکی زۆری بـۆ وڵاتـانی دیکـە نـاردووە و وتـی: کـە ئەوانـە لەهـەموو شـوێنێکدا بڵاوی بکەنەوە کە بەردییە پاشای ئێرانە.

"پــەری ئەســپ" وتــی: ئیــزنم پــێ بــدەن مــن بــڕۆم و لــەم بارەیــەوە لێکۆڵینـەوە بکـەم" چـونکە نـاکرێ بەردییـە کـە بەدەسـتی مـن کـوژراوە و نێژراوە، زیندوو بێتـەوە. کەمبوجیـەش بۆ لێکۆڵینـەوە ناردی، ئـەویش بە زووترین کات گەڕایـەوە و وتی: کاتێك کە ئێوە بەرەو میسر کەوتنە ڕێ، کاروباری مـاڵ و خەزێنـەی خۆتـان سپاردە دەسـتی "موئبیـدێك"[(1)] و ئـەم موئبیدە نازانم چۆن ئاگادار بوو کە بەردییە برای ئێوە کوژراوە و هەڵساوە تا لەم بابەتە کەڵك وەربگرێت، چونکە برایەکی هەیە ناسراو بە بەردییە و تاڕادەیـەکیش هاوشێوەی بەردییەیـە، لـەم ڕووەوە ئـەوی بەپاشـای ئێـران ناسـاندووە بەخـەڵك و خـەڵکیش بـەو مەبەسـتەوە کـە لەمیـسردا بـۆ ئێـوە ڕووداوێـك ڕووی داوە، ئـەم بابەتـەیان قبـوڵ کـردوە و ئێـستا بەردییـەی دەستکردیان بەپاشای ئێران زانیوە.

کەمبوجیە بەهۆی ئەم قسەیەوە زۆر بیری کردەوە و پەژارەیەکی یەکجار زۆر دایگرت و وتی: وای لەمن کە بێ هیچ شتێك بەردییەم کوشت. چونکە ئەو بەردییە کە من لەخەودا بینیم تـاجی لەسـەر بوو و سـەری گەیشتە ئاسمان ئەم بەردییەیە بوو، نە براکەی من" وە کەمبوجیە ئەوەندە خەم دایگـرت کـە دەسـتی کـرد بـەگریان و بـەردەوام دەیـوت: وای لـەمن، کـە

(1) "موئبید" : پیاوانی ئاینی زەردەشتین – وەرگێڕ -

بەپشت بەستن بەخەونێکەوە، گەنجێك وەکو بەردییە کە برام بوو، کوشتم" لەکاتێکدا خەون لەگەڵ راستیدا زۆر جیاوازە[٢]

کەمبوجیە لەشاری ناوبراودا لەسووریا، رۆژێك کە دەیویست شمشێر لەکەمەر بکا، شمشێرەکە داکەوت و لاقی بریندار بوو و چونکە برینی شمشێرەکە قوڵ بوو، کەمبوجیە بەهۆی ئەو برینەوە ژیانی لەدەست دا. بەڵام بەر لەمردنی، گەورەکانی ئێران کە لەگەڵ ئەودا بوون، لەدەوری خۆی کۆ کردەوە و وتی: ئەی دۆستان و هاوڕێیانم، راسپاردەی من بۆ ئێوە ئەوەیە کە نەهێڵن پیاوێکی نەشیاو لەسەر میراتی راستەقینەی تاج و تەختی ئێران پاشایەتی بکات و بەهەر جۆرێك کە شایستەتر دەزانن، ئەم پیاوە کە ئێستا بەناوی بەردییەوە لەسەر ئێران پاشایەتی دەکات، لەسەر حکومەت لایبەن. چونکە ئەو لەبنەماڵەی هەخامەنشی نییە و هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بەپاشایەتییەوە نییە.

گەورەکانی ئێران دوای ئەوەی کە کەمبوجیە مرد، گەڕانەوە بۆ ئێران" بەڵام نەیاندەزانی چۆن دەستی بەردییەی دەستکرد لەپاشایەتی ببڕن. چونکە دەرئەنجامی ئەم مەبەستە، پێویستی بەوە بوو کە پەری ئەسپ بنێت بەو کارەدا کە کردوویەتی، دان تا بسەلمێنێت کە بەردییەی راستەقینە نییە و ئەویش زاتی نەدەکرد کە دوای کەمبوجیە دان بەم خەیانەتەدا بنێت و بڵێت کە بەردییەی کوڕی کوورش و برای کەمبوجیەی کوشتووە.

دوای ئەوەی کە کەمبوجیە ژیانی لەدەست دا، بەو جۆرە کە ئاماژەمان پێکرد، بەردییەی دیکە کۆسپێکی دیکەی لەبەردەم خۆیدا نەبینی و وای

---

[٢] "هیرۆدۆت" لەم بارەیەوە هەڵە دەکات و کەسێك کە لەئێراندا خۆی بەبرای کەمبوجیە ناو برد؛ ناوی ئەسڵی خۆی بەردییە نەبوو، بەڵکو ئەویان بەناو "گوماتا" دەناسی و ئەو بەڵگە نوێیانە کە هاتووەتە دەست، پشتڕاستکردنەوەی ئەم راستییەیە. وەرگێڕ.

بیر دەکردەوە کە دەتوانێت بەبێ هیچ کێشەیەك لەوڵاتی ئێراندا پاشایەتی بکات.

براکەی ئەو، کە ئەوی بەگوێرەی هاوشێوە بوونی بەردییەی راستەقینە لەسەر تەختی ئێراندا دانا" لەم ماوەیەدا لەپێشەوە لە بەردییە کەڵکی زۆری وەرگرت و بۆ ئەوەی کە بتوانێت لەلای ئەو گەلانەوە کە لەژێر دەسەلاتی ئێراندا دەژین، هێزا ببێتەوە، دەستووری دا کە لەوڵاتانی ئێراندا بانگەواز بکەن کە تاماوەی سێ ساڵ خەڵك لەداینی باج بووراون و هیچ کەسێك بۆ خزمەتی سەربازی بانگ ناکرێت.

چونکە لەئێراندا نەریتە کە نێرینەکانی گەل، هەرکام لەتەمەنی دیاریکراودا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، خزمەتی سەربازی بکەن.

ماوەی هەشت مانگ بەردییەی دەستکرد لەئێراندا حکومەتی کرد، بەبێ ئەوەی کە کەسێك تێبگات کە ئەوە بەردییە نییە. تا ئەوەی کە دوای هەشت مانگ یەکێك لەگەورەکانی ئێران، ناسراو بە "ئوتانس"، گومانی لەسەر بەردییە کرد و ئەو شتە کە بووە هۆی گومانی ئەو، ئەوە بوو کە بینی بەردییە هەرگیز لەکۆشکی خۆی ناچێتە دەرەوە هیچ کات گەورەکانی ئێران بۆ لای خۆی بانگ ناکات.

لە کاتێکدا کە یەکێك لەنەریتەکانی پاشاکانی ئێران ئەوەیە کە لەرۆژە دیاریکراوەکانی جەژنەکاندا، گەورەکانی وڵات بۆلای خۆیان بانگ دەکەن و شایی و خۆشحاڵی ئەوان دەبینن و لەرۆژانی دیکەشدا گەورەکانی وڵات دەتوانن بەئیزن وەرگرتن بچنە لای پاشا و راپۆرتی کاروباری خۆیان بدەنە خزمەتی پاشا.

"ئۆتانس" کچێکی هەبوو کە یەکێك لەهاوسەرەکانی کەمبوجیە بوو. وە لەکۆشکی پاشایەتیدا دەژیا و بۆ ئەو پەیامی نارد کە بەردییە بەباش ببینێت و تێبگات کە ئایا ئەوە بەردییەی راستییە یان نا؟

کچەکەی ئۆتانس لەوەڵامی باوکیدا پەیامی نارد کە من ناتوانم ئەم بابەتە لێکبدەمەوە. بۆ ئەوەی کە هەرگیز بەردییەم نەبینیوە تا بزانم ئایا ئەوە بەردییەی راستییە یان نا؟

ئۆتانس بۆ دووەمین جار بۆ کچەکەی خۆی پەیامی نارد و وتی: لەناو هاوسەرەکانی کەمبوجیەدا، بێگومان "ئاتووسا" باش بەردییە دەناسێت و لەوانەیە تۆ بتوانی لەئاتووسا بپرسی کە ئایا ئەم پیاوە بەردییەیە یان هاوشێوەکەیەتی.

کچی ناوبراو لەوەڵامدا وتی: بەداخەوە لەکاتێکەوە بەردییە بۆتە حاکم، ژنەکانی وەها لەیەك جیا کردۆتەوە کە ئێمە بەهیچ جۆرێك لەگەڵ یەکدا پەیوەندیمان نییە و لەئەنجامدا من ناتوانم لەو پرسیار بکەم کە ئایا ئەم پیاوە بەردییەی راستییە یان پیاوێکی دیکەیە.

ئەو کاتە ئۆتانس بۆ کچەکەی خۆی پەیامێکی دیکەی نارد و پێی وت: بەردییەی درۆ نییە گوێی نییە و گوێیان بە هۆی خەیانەتێك کە کردبووی بڕیویانە" لەکاتێکدا بەردییەیراستەقینە گوێی هەیە. وە کاتێ کە ئەم پیاوە خەوت، تۆ گوێیەکانی ئەو کە لەژێر پێچەکەی سەری ببینە و بزانەکە ئایا گوێی هەیە یان نا؟

کچەکە وەڵامی دایەوە کە ئەم کارە زۆر مەترسیدارە و ئەگەر ئەو لەخەو هەڵبستێت و بزانێت کە من سەیری گوێیم کردووە، من دەکوژێت. بەڵام ئۆتانس ئەوەندە پێداگری کرد تا کچەکە قبوڵی کرد و شەوێك کە بەردییە لەخەودا بوو، سەیری گوێی کرد و ئەم بابەتەی بەباوکی راگەیاند.

ئێستا دەگەینە دانیشتنی داریووش لەسەر تەختی پاشایەتی ئێران و ئەم بابەتە لەلایەکەوە جێگای سەرنجدان و تێڕامانە و نیشاندەری زانایی ئێرانییەکانە و ئاشکرای دەکات کە ئێرانییەکان گەلێکن کە دەتوانن لەهەلومەرجی نائاساییدا زیاتر لەگەلانی دراوسێ تێگەیشتن و ئاقڵی خۆیان نیشان دەن. چونکە داریووش لەرۆژهەڵاتدا تاکانە پاشایەك بوو کە لەکاتی ژیانی باوکی خۆیدا "هسیت ئەسپ"دا هاتە سەر دەختی دەسەڵات" لەکاتێکدا بەگوێرەی نەریتەکان تا کاتێ کە باوك هەبێ هێزی کارکردن و پاشایەتی هەیە، کوڕ ناگاتە پاشایەتی و داریووش کاتێ کە گەیشتە پاشایەتی، باوکی ئەو "هسیت ئەسپ" و (بەوتەی یۆنانییەکان هیس تاپس – راولینسۆن)، لەژێر دەسەڵاتی کوڕەکەی خۆی، بووە بەرپرسی سوپایەك و چووە شەڕی پارتەکانەوە تا ئەوەی کە خێڵەکانی ناوبراو کە ئاژاوەیان دروست دەکرد، هێور بکاتەوە.

باوکی داریووش فەرمانڕەوای "شووش" بوو و دوای ئەوەی کە ئۆتانس باوەڕی کرد کە بەردییە بەدرۆ خۆی کردووەتە فەرمانڕەوای ئێران و بەردییەی راستەقینە نییە، لەگەڵ شەش کەسی تر و داریووش کوڕی فەرمانڕەوای شووش رێکەوتن کە بەردییەی درۆیین لە سەر تەخت لابەرن.

داریووش چووە ناو شووش و تێکەڵی ئۆتانس و پێنج کەسی تر بوو و ئەوانە ئەنجوومەنی شورایان خستە ڕێ و سوێندیان خوارد کە بەردییەی درۆیی لەپاشایەتی ئێران لابەرن و لەو ئەنجوومەنەدا جێگری داریووش وتی:

ماوەیەك بوو کە من دەمزانی ئەو بەردییەیەی کە لەسەر ئێمە حوکم دەکات، کوڕی پاشای پێشووی ئێران نییە" بەڵکو موئبیدێکە کە

لەهاوشێوە بوونی خۆی لەگەڵ بەردییەی راستەقینە کەڵکی وەرگرتووە و بەیارمەتی براکەی کە ئەویش موئبیدە، دانیشتە سەر تەختی پاشایەتی.

من وا بیرم نەدەکردەوە کە جگە لەمن کەسێك لەم بابەتە ئاگادار بێت و ئێستا کە دەبینم ئێوە لەم مەسەلەیە ئاگادارن، باوەڕم وایە کە ئیدی نابێت بیری لێ بکەیتەوە.

بەردییەی درۆیین لەرێگای خەڵەتاندنی خەڵکەوە، لە باجی سێ ساڵی لەسەر خەڵکی ئێران و گەلانی دیکە کە لەژێر ئالای ئێراندا دەژیان، خۆشی بوو و خەڵکی لەخزمەتی سەربازی دوور خستەوە.

زۆر کەسیان لەم کارە خەڵك خەڵەتێنە کرد، چونکە ئەگەر باج نەدرێت، خەزێنە بەتاڵ دەبێت. لەوانەیە ئێستاش بەتاڵ بووبێت و هەر کات خەڵك نەچێتە خزمەتی سەربازی، کێ هەیە کە لەم وڵاتە بەرفراوانە بەرگری بکات.

هێشتا ئەوانەی کە لەرابردوودا دوژمنی ئێران بوون، بەدروستی لەبارودۆخی وڵاتی ئێمە ئاگادار نین و وا بیر دەکەنەوە کە وەکو رابردوو خەزێنە پڕە لەزێڕ و زیو و سوپای خاوەنی سەربازی زۆرە. ئەگەر ئەوانە بزانن کە خەزێنە بەتاڵ بووە و ئێران سەربازی نییە، بێگومان هێرش دەکەنە سەر وڵاتی ئێران و ئەم وڵاتە بەربڵاوە لەلایەن کەسانی دیکەوە داگیر دەکرێت.

ئۆتانس لەوەڵامی داریووشدا وتی: ژمارەی ئێمە کەمە و لەحەوت کەس زیاتر نین و بەرێژەیەکی کەم ناتوانین کە بەردییەی دەستکرد لەفەرمانڕەوایی ئێران لابەرین.

باشتر وایە کە هەندێکی دیکە بکەینە هاوڕێی خۆمان و کاتێك ژمارەی ئێمە گەیشتە رادەی پێویست، لەبەرامبەریدا راوەستین و سەر بەرز کەینەوە.

داریووش وتی: ئەم پیاوە خەڵك خەڵەتێنە بەو بەخشیش و بەخشینەوەیە کە هەموو ئێرانی خستە مەترسییەوە، هەندێك خەڵەتاوی لەدەوری خۆی کۆکردۆتەوە بەبێ ئەوەی کە خۆی پێیان نیشان بدات و هەر کات ئێمە پیلانی خۆمان لەگەڵ کەسانی دیکە دا بخەینە بەرباس" ئەوانە بۆ خۆ شیرین کردن یان بۆ وەرگرتنی پاداشت، خێرا راپۆرتی خۆیان دەدەنە بەردییەی درۆیین و ئەو هەموومان دەکوژێت.

ئۆتانس وتی: داریووش! من پشتگیری دەکەم کە ئێوە پیاوێکی وڵاتپارێز و دلێرن، بەڵام ئایا بیرتان لەوە کردۆتەوە چۆن ئێمە دەتوانین خۆمان بگەیەنینە بەردییەی درۆینە. ئەو لەدەوروبەری کۆشکەکەیدا پاسەوانی زۆری داناوە و ئەوانە لەچوونە ژوورەوەی ئێمە پێشگیری دەکەن.

داریووش وتی: لەژیاندا کارگەلێك هەیە کە، وتنیان کێشەیە" بەڵام جێ بەجێ کردنی ئاسانە! بەپێچەوانەوە کارگەلێك هەیە کە جێ بەجێ کردنی دژوار و لەبەرامبەردا وتنی ئەو ئاسانە و چوونە ژوورەوەی ئێمە بۆ کۆشکی بەردییەی درۆیی لەو کارانەیە کە لەکرداردا ئاسانە و کاتی دەربڕینی کێشەیە.

چونکە ئێمە بەشێك لەگەورەکانی ئەم وڵاتەین و پاسەوانەکانی کۆشکی بەردییەو ناوێرن کە رێمان لێ بگرن کە بۆ کارێکی گرنگ دەبێت چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکەین، لەم رووەوە درۆ دەکەین و درۆش گوناهێکی گەورەیە، بەڵام دەبێت درۆ پێناسە بکەیت و بزانیت چییە.

چونکە ئەو شتەی دەبێتە هۆی ئەوەی کە درۆ گوناهێکی گەورە بێ، هەر ئەوە مەبەستی دەروونی وێژەرە. ئەگەر پیاوێك بۆ کارێکی خێر کە قازانجی کۆمەڵگای تێدایە، درۆ بکات، بەبیروڕای من ناتوانی بڵێیت ئەوە درۆیە" چونکە درۆ لەم بارەیەوە گوناهە کە ئینسان بیەوێ لەڕێی درۆوە کرداری خراپ بکات، یان ئەوەی کە لەڕێی درۆوە ئازاری خەڵك بدات" یان ئەوەی کە درۆ بکاتە ئامێری بەناوبانگ بوونی خۆی، یان ئەوەی کە غەریزەی درۆ وتنی خۆی دامرکێنێت" وە هیچ کام لەم مەبەستانە لەئێمەدا نییە و ئێمە لەم بارەیەوە دەچینە کۆشکی بەردییە کە گەلی ئێران رزگار بکەین" من لەم رووەوە لە لایەن خوای خۆمەوە لەم وتە کە لەڕواڵەتدا درۆیە، شەرمەزار نیم.

بۆیە خاڵی سەرەوەمان باس کرد تا بزانن کە لای ئێرانییەکان درۆ سیفەتێکی خراپە" بەجۆرێك کە تەنانەت کاتێ مەسەلەی جێبەجێ کردنی دادوەریش دێتە پێشەوە، دیسان ئێرانییەکان حەزیان نییە کە درۆ بکەن.

ئینجا داریووش وتی:

تەنانەت رواڵەتی وتاری ئێمە درۆ نییە. چونکە ئێمە بەڕاستی بەو مەبەستە دەچینە کۆشکی بەردییە کە کارێکی گرنگمان لەگەڵیدا هەیە و ئەم کارە گەورەیە بریتییە لەجێ بەجێ کردنی دادوەری.

دوای ئەوە حەوت کەسی ناوبراو، کۆشکی بەردییە کەوتنە رێ بەرەو و خۆیانیان بەپاسەوانانی ئەو ناساند و وتیان کە ئێمە بۆ کارێکی پێویست دەبێ بەردییە ببینین و هەروەك کە داریووش پێشبینی کردبوو، پاسەوانانی کۆشك کە ئەو پیاوە گەورە و بەناوبانگا نەیان دی و بەتایبەت داریووش ، پێشگیریان نەکرد و ئەوانە چوونە ناو کۆشکەکەوە.

بەرلەوەی بچنە ناو کۆشکەکەوە، داریووش بەهەندێك لەنۆکەرەکانی خۆی وتبوو کە بچن و بەخەڵك بڵێن کە بۆ کاری گرنگ خۆیان بگەیەننە بەردەمی کۆشکەکە.

خەڵك كۆ بوونەوە و ئەوكات پەری ئەسپ كە لەسەر بنەمای دەستووری كەمبوجیە، بەردییەی كوشتبوو، چووە سەر منارەی قەڵاكەو دەستی كرد بەقسە كردن بۆ خەڵك.

وتی: ئەی خەڵكی ئێران، وە ئێوە ئەی پێشەنگەكان كە وتاری من دەبیسن، خۆتان بۆ بیستنی نهێنییەكی گەورە ئامادە بكەن.

دوای ئەوەی كە هەموو ئامادە بوون بۆ بیستنی قسەكانی پەری ئەسپ، ئەو خزمەتەكانی گەورەی كوورشی بۆ ئێران ژمارد و ئەنجا خزمەتەكانی بنەماڵەی هەخامەنشی باس كرد تا گەیشتە ئەو جێیەی كە كەمبوجیە دەستووری پێداوە تا بەردییە بكوژێت.

لەم كاتەدا بەگریانەوە دەری بڕی: ئەی خەڵكینە! من بەم دوو دەستەی خۆم، بەردییەم كوشت و تەرمەكەیم ناشت. ئەو شوێنی دروستی گۆڕەكەی بەردییەی نیشان دا و هەركات كەسێك لەم بارەیەوە گومانی هەیە، بچێت و گۆڕەكە هەڵداتەوە و ببینێت" وە چونكە بەجلەوە نێژراوە، لەناسینی ئەودا بچووكترین گومان نییە.

من لەم بوارەدا دەستووری كەمبوجیەم جێ بەجێ كرد" ئێستاش خۆم بەتاوانبار دەزانم، خۆم سزای تاوانی خۆم دەدەمەوە.

ئەمەی وت و بە بەرچاوی هەموو خەڵكەوە خۆی لەسەر منارەی قەڵاكەوە خستە خوارەوە و گیانی دەرچوو و لەم رووەوە بەسەرهاتی ئەو پیاوە كۆتایی پێهات.

لەم ماوەیەدا داریووش و شەش كەسی تر كە لەكۆشكدا بوون، سەبریان كرد تا قسەكانی پەری ئەسپ كۆتایی پێ بێت و پاسەوانەكان لەم قسانە سەریان وا سوڕما كە نەیاندەزانی چ بكەن. بە تایبەتی كە زانیان ئەو پیاوە كە خۆی تاوانبار كرد، هەڵسا بەكوشتنی خۆی و ئەم رووداوە هۆی راست بوونی قسەكانی ئەوە.

جگە لەمە، چونکە نهێنی گەورە بەتەواوەتی ناشاردرێتەوە، ماوەیەك دوای ئەوە وا لەناو خەڵکدا بڵاو بۆوە کە بەردییەی راستی کوژراوە" بەڵام ئەم قسانە بەهۆی نەبوونی هۆکار، لەلایەن خەڵکەوە قبوڵ نەدەکرا.

دان پێدانانی پەری ئەسپ و گەواهی شەش کەسی تر بەتایبەت داریووش بەخەڵکی سەلماند ئەو شتەی کە ئەو پیاوە وتی، راست بووە.

چونکە یەکێك لەگرنگترین هۆکارەکانی بۆ باوەڕکردنی خەڵك، ئەمەیە کە کەسێك لەڕێی ڕاست بوونی ئەو شتە کە دەیڵێت، خۆی فیدا بکات.

ئینجا داریووش و پێنج کەسی دیکە بەرەو جێگەی بەردییە رۆیشتن و بەبێ ئەوەی رووبەڕووی بەرگرییەك ببنەوە" ئەو و براکەی کە بەهاندەر و هۆکاری ئەو پیلانە سەرسوڕهێنەرە دەناسران" کوشت و بەردییەی دەستکرد کە لەوڵاتی ئێران ماوەیەك فەرمانڕەوایی کرد، لەناو چوو.

لەو کاتەدا هیچ کام لەو پاسەوانانە هەڵنەستان بۆ پشتگیری کردن" چونکە نەتەنیا دان پێدانانی بکوژی ئەسڵی بەردییە بەوان نیشانی دا کە ئەو کەسە بەناوی بەردییە فەرمانڕەوایی دەکات، بەردییەی راستی نییە" بەڵکو نیشانەکانی دیکەش دەریخست ئەو کەسە بەردییەی راستی نییە، ئەگینا خۆی نەدەشاردەوە و هەروەها روومەتی دانەدەپۆشی و لەقبوڵ کردنی خەڵك بۆ لای خۆی پارێزی نەدەکرد.

بەسەرهاتی بەردییە ئاوا بوو و کۆتایی کاری ئەو هەر بەوجۆرە کە بیستم و لەمێژوودا خوێندم، بۆ خوێنەرم باس کرد و خوداوەند لەنووسینی ئەم بەسەرهاتە و بەسەرهاتەکانی دیکەی ئەم پەرتووکەدا یارمەتی دام، لەخۆمەوە شتێکم نەناوەتە سەر کارەساتەکان و لێشم کەم نەکردۆتەوە.

***کۆتایی***

